# ورشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨
## له عیّراق



عەبدولقادر سالح

2005

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٣١٠)

# شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ لە عیراق

عەبدولقادر سالح

پێداچوونەوەی
ماموستا ئاکۆ شوانی
ماموستای بەشی مێژوو
زانکۆی سلێمانی

کەمال مەزهەر ئەحمەد
پێشەکی بۆ نووسیوە

سلێمانی ٢٠٠٥

# شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ لەعیراق

نووسینی: عەبدولقادر ساڵح

بابەت: مێژوویی

نەخشەسازی کۆمپیوتەر: مەهدی ئەحمەد

سەرپەرشتیاری چاپ: سەلام فاتح

بەرگ : دیاری جەمال

چاپ: چاپخانەی کارۆ

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (١٢١)ی ساڵی ٢٠٠٥ی وەزارەتی رۆشنبیریی پێدراوە

www.roshnbiri . org

# سوپاس و پێزانین

## بۆ

دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد

مامۆستا ئاکۆ شوانی

مامۆستا کەیوان ئازاد ئەنوەر

مامۆستا سەلام عەبدولکەریم

بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە

هەموو ئەو بەڕێزانەی هاوکارییان کردم

# پێشکەشە بە:

هەردوو بینایی چاوەکانم دایک و باوکی خۆشەویست و ئازیزم

هاوسەری خۆشەویست و بەڕێزم کەهاوکاری ئەو ئەم بەرهەمەی لێکەوتەوە

خوشک و برا دڵسۆزو بەئەمەکەکانم

هەردوو کۆرپەی جگەرگۆشەم شەنگەو شاد

هەموو ئەوانەی خۆشم ئەوێن و لەکوێ هەن

# پێشەکی

**کەمال مەزهەر**

تـا ئێسـتەیش دەیـان و دەیـان لایـەنی تایبـەتی و گشـتی جیـاوازی شۆڕشی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ لە عێراق ، کە کورد هەر لەسەرەتای ناوی شۆڕشـی چـواردەی گەلاوێـژی بـۆ هەڵبـژارد ، چـاوەڕوانی لێکۆڵینـەوەی زانستی وردو بابەتەکین. ئیمرۆکە دوای ئەو هەموو نەهامەتی و نەگبەتییەی کۆمـەلآنی خـەڵکی عێـراق پـاش ماوەیـەك لەکـەوتنی رژێمـی پاشـاییەوە گـیرۆدەی هـاتن، پرسـیارێکی رەوا تـەنگ بـە مێـژوو نـووس و شـارەزایان هەڵدەچنێ کە ئایا ئەو رژێمە واگەندەڵ بوبو تا لەناوبردنی ببێتـە ئەرکێکی مێژوویی ڕەوا، ئەگەر وایە ئەو ساکە دەبێت عەودالْی وەلآمی پرسیارێکی تر بین – چیوای لە زۆرینەی دەستە بژێری وڵات کـردووە خـەون بەوەوە ببین ڕەوڕەوەی مێژوو بگەڕێتەوە بەرەبەیانی سیازدەی تـەمموزی ساڵی ١٩٥٨ ، یا یـەکێکی وەك رەجـەب عەبدولمەجید کە چەند جارێك ناوی لـەم کتێبـەدا هاتووە و لە ڕاستیدا دووربینترین نەخشەکێشی شۆڕش بوو، لەوە پەشیمان بێتـەوە کـە بـۆ بـەرپابوونی شـۆڕش کـردی، خوالێخۆشـبووم لـە نزیکـەوە دەناسی ، ئەو قسەیەم لە خودی خۆی بیستووە . لێرەشدا ئەگەر بگەڕێمەوە سەرەتای بۆچونەکەم دەپرسم کـێ ئاگاداری ئەوەیە ڕەجەب عەبدولمەجید لەسەرجەمی رابەرانی شۆڕش وردتر لەمەسەی نەتەوەیی کورد گەیشتبوو، ئەو خۆی بۆخۆی ئەندازیار بوو، ئەورووپای دیبوو، جارەهـای جار لەبەر چـاوی خوالێخۆشـبوو مەسـعود محەمـەد و نـاجی تالـب و صـوبحی عەبدولحەمید کـە هـەردووکیان دوو ئەفسـەری نەتـەوە پەرستی بەشداری شۆڕش بوون، لەزاری رەجەب عەبدولمەجید خۆیم بیستووە کە کورد مافی ئەوەی هەیە دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی دابمەزرێنێت.

هەرچۆن بێت شۆڕشی چواردەی تەممووز دەروازەیەکی مێژوویی نوێی لەبەردەم رەوتی بزوتنەوەی کوردایەتیدا کردەوە . پێویستە هۆی سەرەکیی ئەو دیاردەیە لەوەدا وەدی بکرێت کە ڕاپەرینە یەك لە دوا یەکەکانی کورد یەکێك بوو لەو هۆ سەرەکییانەی هەرەسیان بە ڕژێمی پاشایی هێنا بوو، بۆیەکا گشت هێزە ساسییە چالاکەکانی ئەو ڕۆژگارە دەبوو حسابێکی تایبەتی بۆ کورد بکەن، ئەوەی پالی نا بە زۆرینەی هەرە زۆری کوردی عێراقەوە بە لێشاو برژێنە سەر شەقامەکانی گشت شارەکانی کوردستان و بەغدای پایتەخت بۆ پشتگیری کردنی شۆڕش. هەرئەوەیش بۆ خۆی بووە یەکێك لەو هۆیانەی هێندەی تر ڕقی نا پیرۆزی دوژمنە زۆرەکانی شۆڕشی وروژاند و بالێکی کاریگەری نەتەوە پەرستانی عەرەبی لە عەبدولکەریم قاسم کردە دوژمن. تا ئێستەیش لەیادمە چۆن عەبدولسەلام عارف چەند ڕۆژێك دوای شۆڕش لە قرچەی گەرمای نیوەڕۆی هاویندا کتوپڕ خۆی کرد بەشاری سلێمانیدا نەبا جەماوەرێکی زۆر بەو دروشمانە پێشوازی لێ بکەن کە بە چیکلانەی نەخۆشی ئەو نەدەکەوتن، کەچی کاتێك دەچووە هەر شارێکی باشوور بەر لەوە نەتەوەپەرستانی ئەو شارە دەکەوتنە جموجولێکی کەم وێنە و بۆ خۆیشی بەجارێك دەکرایەوە و قسەی وای دەکرد لە قوتوی هیچ عەتارێکی سیاسی‌توندرەودا لە وێنەی وە بەرچاو نەدەکەوت.

بەپێی هەموو پێوانێك دەسکەوتەکانی شۆڕش کەم نەبوون، بە شێك لە ئاوات و خەونەکانی پالەو جوتیارو کرێکارو پیشەساز و ڕووناکبیرانی ولات هاتنە دی، کوردیش کەمی بەرنەکەوت ، شوێنی لە ئالا و دروشم و یاسای یەکەم کۆماری عێراقدا دیاربوو، بارزانێکان لەدەربەدەری و دەسبەسەری رزگاریان بوو، " پارتی دیموکراتی کوردستان" ماوەی کارکردنی ئاشکرای پێدرا، عەبدولکەریم قاسم بۆخۆی ئامادەی ئاهەنگی یەکەم نەورۆزی دوای

**شۆڕش بوو کەلە هۆڵی کۆلیجی زانستەکانی زانکۆی بەغدا لەگەرەکی ئەعزەمی‌یە سازکرا.**

**دیسانەوە پرسیار یەخەی مێژوو نووس دەگرێت: کەوابێ ئەی بۆچ عەبدولکەریم قاسم و ڕژێمەکەی ڕووخان؟. ئۆباڵی ئەوە دەکەوێتە ئەستۆی هەمووان، عەبدولکەریم قاسم پیاوێکی نیشتمانپەروەر و خاوێن[1] و دڵساف و ساویلکەبوو ، بۆیەکا بۆهەموو کارێك دەستی دەدا پەت پەتێن و فێڵ و فەرەجی سیاسەت نەبێت. ڕابەرانی هێزە سیاسیەکانیش شۆڕشگێڕی چاك بوون، لەبۆتەی خەباتی نهێنیدا قاڵ بوبون، بەڵام بێ سەرو بەرو کەم ئاگابوون، پێڕەوی ستالینی بە شێوازێکی ساکاری ڕۆژهەڵاتییانە تێکەڵ بە شادەمارەکانی هەموویان، نەك هەر شیوعییەکان،بوبو، بۆیەکا گشتیان گوریسەکەیان بەلای خۆیاندا ڕادەکێشا تازۆری نەبرد بەزەبری خەنجەری ژەهراوی دەرەکی لەناوەراستدا پساو لای نیوەرۆی ڕۆژی هەینی هەشتی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ خۆری یەکەم کۆماری مێژووی هاوچەرخی عێراقی ئاوابوو.**

**یەکەم جارە زۆر لایەنی ئەم باس و خواسانە لە دوو توێی کتێبێکی سەربەخۆی کوردیدا بخوێنمەوە، ئەوە بۆ خۆی دەسکەوتێکی بەنرخە بۆ کتێبخانەی کوردی.هەمان کات گەلێك لایەنی ناوەڕۆکی کتێبەکەی کاك عەبدولقادر ساڵح سەرنج ڕادەکێشن و شایستەی ستایشن. هەڵبژاردەی**

---

[1] دوکتۆر فازیل حسەینی مێژوونووس لەو باوەڕەدا بوو کە عەبدولکەریم قاسم پیاوی ئینگلیزبوو ، گوایە ئەوان دوای ئەوەی کە نوری سەعید چاوی بڕییە کوێت دژی ڕژێمی پاشایی پاڵیان پێوە نا بۆ شۆڕش. دەمێ ساڵە سەرجەمی بەڵگەنامە نهێنییەکانی بەرتانیا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و زلهێزەکانی تری ڕۆژئاوا کە پەیوەندییان بەو بابەتەوە هەیە خراونەتە بەردەم توێژەران و هیچ بەڵگەیەکیان تێدا نییە ئەو بۆ چوونەی مامۆستا فازیل حسین و هاوبیرانی بسەلمێنێت.

وردی لەسەرچاوەکانی وەرگرتووە، لەلاپەرە سیازدەدا، بە وێنە، پێمان دەڵێت بەیاننامەی دامەزراندنی "بەرەی یەکیەتی نیشتمانی" (جبهةالاتحاد الوطنی) بریتی بوو لە ٢٢٦٦ وشە، ١٦٦١ ی ئەو وشانە بۆ کارەدەرەکی و تەنها ٦٠٥ وشەی بۆکاری ناوەکی وڵات تەرخان کرابوو، ئەم وردکردنەوەیە ئاو زۆر دەکێشێت، یەکێك لە هۆ گەورەکانی هەرەس هێنانی ئەو بەرەیە لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشدا لەو راستیەدا دەبینرێ کەسەرجەمی باڵەکانی بەرە بە ڕادەی یەکەم چاویان بڕیبووە دەرەوە و بەرادەی دووەم چاویان بڕیبووە کێشەکانی ناو کۆمەڵ خۆیەوە، واتا بەشێکیان کەوتبوونە ژێر کاریگەری دروشمەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی عەرەب بەرابەری عەبدولناصر و بەعس و بەشەکەی تریشیان کەوتبوونە ژێر کاریگەری دروشمەکانی بەرەی سۆشیالیزمی جیهانییەوە، راستە هۆکاری ناوەکی و هۆکاری دەرەکی لێك دانابڕدرێن، بەڵام پێویستە هەمیشە پلە و پایەی یەکەم بدرێتە هۆکاری ناوەکی و ئینجا دوای ئەو هۆکاری دەرەکی. بۆ ڕونکردنەوەی مەبەست پێم وایە ئەوەندە بەسە گەر بڵێم ئەدەبیاتی بەرە بە هیچ جۆر ڕاستەوخۆ توخنی کێشەی کورد نەکەوتووە کە لەڕاستیدا دەبوو بایەخێکی تایبەتی و سەربەخۆی پێ بدرێت.

سەرناوی دوابابەتی فەسلی یەکەمی بەرگی یەکەمی کتێبەکەی دەڵێت " ئایا شۆڕش پێویست بوو" (ل - ) کە بێ گومان سەرناوێکی ورد و پێویستە و شایانی پیاهەڵدانە، بەداخەوە نوسەر بۆ خۆی نەیتوانیوە وەڵامی ئەو پرسیارە مێژووییە بداتەوە، بەڵام هەڵبەت وروژاندنی کارێکی پێویستە. بەرانبەر بەوە دروست و ڕێکو پێك " بەرگری میللی" (المقاومة الشعبیة) ی بۆ هەڵسەنگاندووین(ل - ). " کوردو ئەفسەرانی ئازادیخواز" یش (ل - ) بابەتێکی باش و پێویستە ، خۆزگە زۆرتر لەسەری دەڕۆی،

پێم وایە لە ڕێگەی دیدەنی تایبەتییەوە دەیتوانی کەرەستەیەکی پێویست و ڕەسەنمان لەو بوارەدا بۆ تۆمار بکات.

کاک عەبدولقادر زمانی خاوێنە، بە ڕق و کینەوە باسی کەس ناکات، ئەوەی بەمەرجێکی پێویستی لێکۆڵینەوەی مێژوویی زانستی دادەنرێت، هەر بەو پێیەش نەدەبا جار وبار بەدەستووری ناحەزانی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ " دادگەی بالای سەربازی تایبەت" یا "دادگاتی گەل"[١] ناوبنێت " دادگەی مەهداوی" راستە، هەروەك خۆیشی دەڵێت ، گلەیی زۆر لەو دادگەیە هەیە، بەلام ناوگۆڕکێ کاری مێژوو نووس نییەو نابێت هەرگیز ئەوەیش لە یاد بکەین کە دوای سەرکەوتنی کۆدێتای هەشتی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ کەس وەك مەهداوی ئازایانە بەرەنگاری مەرگ نەهات، طالب شبیبی ئاگادار لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت : مەهداوی تا دواهەناسەی ژیانی هاواری دەکرد بژی گەل، بژی نیشتیمان. نوسەر هەمان کات گەلێك جار لە داڕشتنی پەراوێزەکانی کتێبەکەیدا دەستی تەتەڵەی کردووە، لە پێڕەوی زانستی لای داوە، جار جارەیش لە هەڵبژاردنی سەرچاوەدا سەرکەوتوو نییە، بە وێنە ناشێت ئەو پرۆگرامەی کەناڵی تەلەفزیۆنی ئەبوظبی بەناونیشانی " بین الزمنین" ( لە نێوان دوو رۆژگاردا) بلاویکردەوە بکرێتە سەرچاوەی گێڕانەوەی سەرگوزشتەی قسە بە نرخەکانی سەعید قەزاز لەبەردەم " دادگەی گەل" ، پێشم خۆش نییە بووترێت ساڵی ١٩٥٧ بڕیاری یەکیەتی نێوان میسر و سوریادرا، صەد دەر صەد ئەو بڕیارە مێژوویییەی جیهانی هەژاند ڕۆژی چواردەی شوباتی ساڵی ١٩٥٨ بلاکرایەوە.

---

[٢] لەسەر بەرگی دەرەوەی بەشە چاپکراوەکانی دادگاییکانی ئەو دادگایە نوسراوە " محكمه الشعب" و لەسەر بەرگی ناوەوەیشی نووسراوە " محاكمات المحكمه العسكريه العليا الخاصـه"

مەبەستی سەرەکیم لەم جۆرە ڕەخنانە ڕێ نیشاندانە بەپێی توانا، ئەگینا باش لە گەیشتووم کارنییە بێ کەم و کورتی بێت، تەنها ئەوانە ناکەونە ناو داوی هەڵەوە کە دوورە پەرێز دەوەستن و هیچ ناکەن، یاهەر خەریکی تانەو توانجن و بە چرای ڕۆن گەرچەکەوە بە دووی هەڵەی بەرهەمی ڕەنجی شەونخونیی خەڵکدا دەگەڕێن. بێ گومان، وەك وتم، زۆر لایەنی ئەم بەرهەمە شایستەی پیاهەڵدانی ڕەوان، وێڕای ئەوانەی تا ئێستە وتومن بە پێویستی دەزانم ئاماژەش بۆ ئەوە بکەم کە نووسەر بە شێوازێکی ڕێکو پێك و وەبەر دڵ بە زنجیرە باسەکەی بۆ هۆنیونەتەوە، زمانی داڕشتنی بابەتەکان ڕەوان و ئاسان دێتە بەر گوێ، تەنانەت نەوشە عەرەبییە زۆرەکانی و نەوشە و زاراوە دارێژراوە قەبە و قورسەکانی کە بەکاری هێناون کارێکی ئەوتۆیان نەکردۆتە سەر شێوازی داڕشتنی نوسینەکەی، بەڵام ئەگەر فریای ئەو ژمارە بێ شومارەی هەڵە چاپەکانی کارەکەی نەکەوێت ئەو سا گلەیی ڕەوای خوێنەر و ئێمەو مانانیش دێنێتە سەرخۆی.[٢]

دواوشەم ئەوەیە کە بە نوسەر بڵێم ئافەرین و دەستخۆش بۆ ئەم بەرهەمەت کە هیوادارم بەرهەمی تری زۆری بە دوادا بێت، بەڵام گەلێك سەرم لەوە سوڕماوە چۆن توانیی بە درێژایی چەند مانگێك چاوەڕوانی ئەم پێشەکییەی من بکات هەرچەند دەمێکە کارەکەی ئامادەی بڵاکردنەوەیە.

---

[٢] ئەو کاتەی ئەم بەرهەمەم ڕەوانەی لای مامۆستای بەرێز و خۆشەویستم کرد، هەندێك پەلەم بوو لەوەی زوو ئەم بەرهەمە بگاتە دەستی جەنابی، هەربۆیەش فریای راستکردنەوەی هەڵەی، چاپ نەکەوتم چونکە تەنها یەك نوسخەم فۆتۆکۆپی کردبوو، هەربۆیە پێش ئەوەی وەڵامەکەی مامۆستا بگاتەوە دەستم هەڵە چاپەکانم راست کردەوە، چونکە بەرهەمەکە هەروەك مامۆستا دەفەرموێت ماوەیەکی زۆر لای ماوەتەوە، منیش لای خۆم بەرهەمەکەم ئامادەکرد چاوەڕوانی وەڵامەکەی مامۆستا بووم تا ڕای بەرێزیان وەربگرم سەبارەت بە چاپ کردنی.. (نوسەر)

# پێشەکی

**ئاکۆ شوانی**

مامۆستای یاریدەدەر لە بەشی (مێژوو) زانکۆی سلێمانی

شۆرشـــی ١٤ی تـــەمموزی ١٩٥٨ تـــوانی دوای ٣٧ســـاڵ کۆتـــایی بـــەو سیســـتمە پاشـــایەتی‌یە بهێنێـــت کـــە حکومـــەتی بـــەریتانیا لـــە رێکـــەوتی ١٩٢١/٨/٢٣ ەوە لەعێراقدا دایان مەزراندبوو، بێگومان سەردەمی پاشایەتی لەعێراقـدا وێـرای هـەموو کـەم و کورتی‌یـەکانی، بێ‌بـەش نـەبوو لـەخاڵی پۆزەتیڤ و لایـەنی درەوشاوە، بەتایبـەتی تـاخودی مـەلیك فەیسـەڵی یەکـەم لەژیانـدا مـابوو، بـەهاوکاری ئینگلیـز عێـراق هـەنگاوی گـەورەی نـابوو لەزۆربـەی بـوارە سیاسـی‌و کۆمەڵایـەتی و ئابوورییەکانـداو ئـەم وڵاتـە لـە رۆژگاری حوکمرانی پاشایەتیدا زۆر کراوەتر و دیموکراسی تر لەئاست بیرو باوەرو تێروانینە جیاوازەکاندا لەهەمو سەردەمەکانی دیکە کە عێراق دواتـر بەخۆیـەوە بـینی، ئـەو سـەردەمە تـەنها بـیری کۆمۆنیسـتی یاسـاغ بـوو لەعێراقـدا، ئەگـەرنا زۆرێـك لەرەوتـە فیکرییـەکانی دیکـە لـەو سـەردەمەدا بەشێوەیەك لـە شێوەکان کـاری خۆیـان دەکـردو گەرسـنوریان نەبەزانـدیا و پشێویان دروست نەکردایـە کـەس دەستی نەدەخستە رێیـان..بـەڵام وێرای ئەوەش لەساتەوەختی هاتنە سەرکاری (مـەلیك غـازی)ەوە بـەحوکمی لاوازی کەسێتی نـابراو سات لـە دوای سـات هـەژمونی پیـاوانی سـەربازی لـە وڵاتـدا زیاتر دەبوو، ئەوەش وای کرد کە عێراق دووچاری نەهامـەتی گـەورە ببێـت، وەك کودەتای بەکر سـدقی ١٩٣٦ و بزوتنـەوەی مایسـی ١٩٤١ و هـەریـەك لـە پێشـێوییەکانی ١٩٤٨و١٩٥٢و١٩٥٦ کەسـەرجەم ئـەم بزوتنـەوەو راپـەڕینانـە

ڕۆڵـی گـەورەیان بینـی لـە وروژانـدنی خـەڵك و ئـاڵۆزكردنی ڕەوشـەكەداو ڕێگایان خۆشكرد بۆئەوەی حكومەتی پاشایەتی لە عێراقدا مایەی گلەیی و گازانـدە و تانـەو تەشـەری زۆر لـە خـەڵكانی سیاسـی و سـەربازیو خەڵكـە ڕەشۆكییەكەش بێت، لەلایـەكی دیكەشەوە وێڕای ڕق و كینـەی خـەڵكی لـە دارو دەسـتەكەی سـەردەمی پاشایەتی ، كەڕێگـە خۆشـكەر بـوو بـۆ ڕودانـی شۆڕشـی ١٤ی تـەمموز، بـەڵام دەبێـت ئـەوەشمان لـە یادنەچێت حكومـەتی بـەریتانیا دەیتـوانی عێـراق لـەو ئاسنەنگە دەربـاز بكـات و بـەر بـەو شۆڕشـە بگرێـت، بـەڵام ئـەوان ماوەیـەك بـوو بـە ئاشـكرا هەسـتیان بـە هەوڵـەكانی عەبدولئیلا و نـوری سـەعید دەكرد بۆ نزیك بونـەوە لـە ئـەمریكا و تەنانـەت ساڵی ١٩٥٦لەگەڵ مەلیك فەیسڵی دووەمدا هەریـەك لـە عەبدولئیلا و نـوری سـەعید و سـالح جـەبر و توفیـق سـویدی بەسـەردانێكی ڕەسمـی گەیشـتنە واشنتۆن، جگە لەم هۆكارە ، هۆكـارێكی دیكە ئـەوەبوو كـە عێـراق ماوەیـەك بـوو دەمـی لـە مەسـەلەی گێڕانـەوەی (كویـت) دەكوتـا، كـە ئەمـەش خـۆی لەخۆیدا بە هیچ شێوەیەك مایەی قەبوڵ كردن نەبوو لای بەریتانیا..

ئیدی ئەم هۆكارانەو زۆر مەسەلەی دیكەش هاتنە پاڵ ڕێگە خۆشـكردن بـۆ ڕوودانـی شۆڕشـی ١٩٥٨، كـە بەداخـەوە لێـرەو لـەوێ نـەبێت كـە چـەند وتارێك یان چەند بیرەوەرییەكی بەزمانی كوردیلەبارەوە باسكراوە، ئەگـەرنا هیچ نوسینێكی زانستی و ئەكادیمی تایبەت بـە مێـژووی عێراقـی هاوچـەرخ بە گشتیو شۆڕشی ١٤یتەمموزی ١٩٥٨ بەتایبەت بونی نیـە ، ئەمـەش وای كـردووە ئێمـەی كـورد بـەردەوام پـەنا بـۆ نوسـینی مێـژوو نوسە عەرەبەكان بەرین لەو بوارەدا، كەژمارەیەكی كەمیان نەبێت ئەوانی دیكەیان لەڕوانگـەی تایبـەتی خۆیانـەوە نوسـیویانەو كـەپێم وایـە بەعسـیەكان لـە دوای

کودەتاکەیانەوە لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣ هێندەی بۆیان کرابێت هەوڵی قێزەون کردن و دزێو کردنی سەردەمی حوکمڕانی (عەبدولکریم قاسم) یان کردووە لە عێراقدا ، لە کاتێکدا (قاسم) وێڕای کەم کورتییەکانیشی توانی لە نێو ئەو هەموو کێشمە کێشمەی بیرو ڕای جیاواز و ڕەوتە فیکرییەجیاوازانە دا هەڵبکات و هەنگاوی باش بنێت و بالانسی نێوان کۆمۆنیستەکان و و قەومییە عەرەبەکان ڕابگرێت و لەسەرەتاوە ئەندازەیەکی بەر چاوو دەروازەکانی بە ڕووی گەلی کوردیشدا ئاوەڵاکرد و زۆرێك لە مافە سەرەتاییەکانی بۆ گەلی کورد فەراهەم کرد و لە دەستوریشدا هاوبەشی کوردو عەرەبی جێگیرکرد، بەڵام ململانێی ناو خۆو دوژمنایەتی قەومییە عەرەبەکان بەسەرۆکایەتی (جەمال عەبدولناصر) و هەوڵەکانی هەریەك لە ئەمریکاو بەریتانیا ، وێڕای ژمارەیەك خاڵی لاواز لە چۆنیەتی کاروباری بەڕێوەبردن و کەسێتی قاسم ، وایان کرد کە چارەنوسی ئەو شۆڕشە بە کودەتایەکی خوێناوی کۆتایی بێت و قوربانیەکەشی خودی (قاسم) و هەزاران عێراقی بوو کەلە ماوەی چەند مانگی دوایکودەتاکەدا بەشەقامەکان بەغدادا ڕاکێشران، یان لە کونجی زینداندا کوژران..

ئەم هەوڵە بەردەسیشتان ، یەکێکە لەهەوڵە باش و بەراییەکان بۆ شکاندنی ئەو تەوقەی کە تائێستا دەوری مێژووی عێراقی هاوچەرخ داوە و کەس بە زمانی کوردی هەنگاوێکی نەناوە بۆ نوسینەوەی هێڵە گشتی‌یەکانی ئەم مێژووە، هەوڵەکانی (د.کەمال مەزهەر ) ی لێ بترازێ کە بەهەردوو زمانی کوردی و عەرەبی ئاوڕی لە مێژووی عێراق و کورد لە عێراقدا داوەتەوە..کەئەمڕۆ دوای ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر عێراقدا هاتون و ئەو دوارۆژەش کەکورد چاوەڕوانیەتی لەم عێراقە دیموراسی و ئازادەدا ،

وادەكات كە زیاتر گرنگی  بە مێژووی عێراق و عێراقی هاوچەرخ بدەین و لەڕۆڵ و پشكی كورد و سیاسەتی حكومەتە یەك دوا یەكەكانی عێراق سەبارەت بە كورد بدوێین، تاوەكو ئەزمونی تاڵی حوكمڕانی بەعس لە عێراقدا جارێكی دیكە لەم وڵاتەدا دووبارە ەبێتەوە..

# وتەیەك

هــەموو بزوتنەوەیــەكی سیاســی كۆمــەڵێك دەســكەوت و ئامــانجی لێ دەكەوێتــەوە، هــەروەك چــۆن هەنـدێك جـاریش لەباردەچێت و ئـەوئامانج و دەسـكەوتانەی دەیـەوێت دەسـتەبەری بكـات تیادەچێت،، بـەڵام لەسـەرجەم بارەكانـدا قۆنـاغێكی مێـژوویی دیـاری كراودروسـت دەكـات لـە ژیـانی ئـەو نەتەوەیـــەدا، لـــەم پێودانگەشـــەوە شۆڕشـــی ١٤ی تـــەموزی ١٩٥٨ كاریگەرییەكی قوڵی دروست كرد لە مێژووی سیاسی عێراقی هاوچەرخدا،و ئاستی هۆشیاری سیاسی و كاری سیاسی گەیاندە قۆناغێكی یەكلاكەرەوە، دیارە ئەمەش پاش ژان و ئازارێكی درێژخایەن .

دەكرێـت یـەكێك لـە هۆكارەكـانی هەسـتانی ژمارەیـەك لـە ئەفسـەرانی ســوپای عێراقیبەپێشـــەوایەتی عەبدولكـــەریم قاســـم بـــە شـــۆڕش، دە رهاویشـــتەی ئـەوە بوبێـت كـەڕژێمی پاشـایەتی ئـەو كاتـە نـەیتوانیوە گۆڕانكارییــە فیكــری و كۆمەڵایــەتی و سیاسـیەكان لـە خۆبگرێــت، لـەم بەرەنجامەشەوە نەوەیەك لەوانە دروسـت بوون كـە هەسـتیان بـە تێك شـكان دەكرد لەبەرامبەر ئەگەری بەشداری دەسەڵات ،ئەمەش سـەرەرای سـەرجەمی شۆڕشــە جەماوەرییــەكان و مــانگرتن و راپــەرین، لەبەرامبــەر هــەمو ئەمانــەدا دڵنیا بووبـوون لـەوەی هـیچ جـۆرە ڕێگەیـەكیان لەبەردەمـدا نـەماوە جگـە لـە كودەتایەكی سەربازی نەبێت ، ئەمەش لەسـەر شێوەی ئەوەی عەبدولناصر لە میسر ئەنجامی دا..

بـەڵام كاتێـك شـۆڕش سـەركەوت و بەرهـەمی خـۆی دا بەدەسـتەوە وەك پێویسـت نـەتوانرا سـودی لێ وەربگیرێـت ، لەلایـەك ئەفسـەرەكان كەوتنـە

دابەش کردنی غەنیمەتی دەسەلات و پلەو پایەو کاتێکیش لەسەرئەمە ناکۆکی دروست بوو کەوتنە داڕشتنی پلانی کودەتا و لەناو بردنی ئەوی تر، لەبەرامبەر ئەم جۆرە هەولانەشدا ئەفسەری دەسەلات بەدەست هەتا دەیتوانی پێگەی دەسەلاتی خۆی دکۆم دەکرد و نەیارەکانی لەناو دەبرد یاخود زیندانی دەکردن یان دووری دەخستنەوە، لەم نێوەشدا سیاسی‌یەکان وەك ئەوەی نەیان دەتوانی بەر بەم لێشاوی پێکداچوون و ناکۆکی‌یانە بگرن ، ئەوانیش هاتنە نێو کایەی ململانێ‌ی ئەفسەرەکانەوە و هێندەی تر بارەکە بەرەو خراپ بوون ڕۆشت و تەنانەت هەندێك کەس پێ‌یان وایە گەر زەمینە سازی ناکۆکی و ملدلانێ‌ی نادروستی نێوان حزبەکانی ئەو سەردەمە نەبوایە، ئەوا مەسەلەکە بەو ئاقارەدا نەدەڕۆشت . ئەوەشی لەم بەرەنجامەوە بووبە مێژوو هیچ کەس تاوانەکەی هەڵ نەدەگرت و هەرلایەك کەدەیویست یادەوەرییەکانی بنوسێتەوە یاخود دیداری لەگەلا دەکرا بەو دیدەی کە خۆی هەیبوو نەك ئەوەی ڕویدا بوو حەقیقەتە کانیان باس دەکرد، هەربۆیەش دەست بردن بۆ بابەتێکی مێژووی لەسەر مێژووی سیاسی عێراق و بەتایبەتی قسەکردن لەسەر شۆڕشی ١٤ی تەموز، مەسەلەیەکی زۆر قورس و گرانە و دەکرێت هەروا بە ئاسانی نەتوانین مافی باسەکە بدەین و لەنزیکەوە حەقیقەتە مێژووییەکان بخەینە بەردەست، لەهەمان کاتیشدا ئەوانەی ئەو مێژووەیان نوسیوەتەوە زۆر جار دادپەروەرانە حوکمیان نەداوە بە سەر واقیعەکەدا و کەوتوونەتە ژێر کاریگەری بیرو ڕای فیکری و سیاسی و نەتەوەیی خۆیانەوە و خۆیان لاداوە لە دەرخستنی زۆر ڕاستی، یاخود هەندێك ڕاستی‌یان شێواندووە و بە چەواشەکراوی خستویانەتە بەردەست خوێنەران.. بەدەر لەم حالەتەش بەو

پێودانگەی کە ئێمە لەعێراقدا ژیاوین و زیاتر سەرچاوەی ئەو باسانە لەعێراقدا هاتونەتە بەرهەم و چاپ کراون و کەمتر توانراوە دەست ڕابگات بەو سەرچاوانەدا کە لەدەرەوەی فەزای سیاسی عێراق نوسراون، ئەمە وای کردووە کە خوێندنەوەی ڕووداوە مێژووییەکان بکەوێتە ژێر کاریگەری ناوەندی دەستەڵاتدارەوە و ڕێگە نەدرێت حەقیقەتەکان وەك خۆیان بنوسرێنەوە وئەمەش ڕاستەخۆ کاریگەری دروست کردووە لەسەر بوونی سەرچاوەی پێویست بۆ توێژینەوە لەسەر ئەو باسانە و دەرخستنی بیرو ڕا جیاوازەکان... بەهەر حاڵ سەرەرای ئەو کۆسپانەی باسکران، هەوڵمداوە لە ئامادەکرنی ئەم کتێبەدا سەرچاوەی جۆراو جۆر وەربگرم و ڕای جیاواز لەسەر ڕاستییەکان کۆبکەمەوە ئەمەش چ لەو کتێبانەی کەدەستم کەوتوون و بەسەرچاوەی سەرەکی مێژووی سیاسی عێراقی دەژمێردرێن و چ دواندن و پرسیار کردن بێت لە هەندێك لەو کەسانەی لەگەرمەی ڕووداوەکاندا بوون.. لێرەشەوە ئەوە دوپات دەکەمەوە لە نوسینی ئەم کتێبەدا –گەربڵێم نوسینە– هێندەی پێم کرابێ بێ لایەنانە حەقیقەتەکانم نوسیوە و ناشمەوێت لەم نێوەشدا وەك لایەنگرێك دەربکەوم ، جگە لەمەش لەبەر ئەوەی هەوڵی لەم جۆرە لە مێژووی کتێبخانەی کوردیدا نەبووە ئەوا بێگومان ئەم هەوڵە بێ کەم و کورت نابێت و دەخوازم خوێنەرانی بەڕێزم بەسەرنج و تێبینی هاوکاریم بکەن زۆر سوپاسیان دەکەم..

ئەم کتێبە پێك دێت لە دوو بەرگ ، بەرگی یەکەمیان لە دوو فەسڵ پێك دێت، فەسڵی یەکەم کورتەیەك لە مێژووی عێراق و گرنگترین ئەو گۆڕانکاریانەی کە پێش شۆڕشی ١٤ی تەموز ڕوویداوە، جگەلەمانەش سەربوردێکی مێژووی ئەفسەرانی ئازادیخواز.. فەسڵی دووەمیش گرنگترین

دەرهاویشتە کانی شۆڕشی ١٤ی تەموز توێژینەوەی لەسەر کراوە، کەزیاتر تێیدا باس لە دەرهاویشتە سلبیی‌یەکان کراوە..

لەکۆتایـدا بـە پێویستی دەزانم زۆر سوپاسی ئەو کەسانە بکەم کە لـە پرۆژەی ئەم کتێبەدا هاوکارییان کردم، لەوانە بەرێز پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەزهـەر کـە پێشـەکی بـۆ کتێبەکـە نووسـی و مامۆسـتا( ئـاکۆ شـوانی) مامۆستای بەشی مێژووی زانکۆی سلێمانی کە بەسەرنج و تێبینی‌یەکانی کتێبەکـەی دەوڵەمەنـد کـرد، و مامۆسـتا( ئەحمـەد مـیرە) کەئـەرکی پێـدا چوونەوەی زمانەوانی کتێبەکەی گرتە ئەستۆ، وهەروەها سەرجەم ئەوانەی کە هاوکارییان کردووم..

خرای گەورە یارمەتی هەمولا بدات، هەرئەوە پشت و پەنای مرۆڤەکان...

عەبدولقادر سالح ( سلێمانی / مایسی ٢٠٠٣ )

# فەسڵی یەکەم

*کورتەیەکی مێژوویی

*گرنگترین گۆڕانکارییەکانی نێوان ساڵانی ١٩٥١ -١٩٥٨

*پێکهاتنی ئەفسەرانی ئازادیخواز

# کورتەیەکی مێژوویی

عێـراق دەکەوێتـە بەشـی ڕۆژئـاوای کیشـوەری ئاسـیاوە و هاوسنورە لەگەڵ هەریەك لە کویت و سعودیە و ئێران و تورکیا و سوریاو ئوردون ...

عێراق لە سەردەمی خەلافەتی ڕاشدین دا لەلایـەن ئـەو والیانـەوە ئیدارە دەکـرا کـە خەلیفـەکانی راشـدین لـە مەدینـەوە دایـان دەنـان هـەتا پـێش شـەهیدکردنی خەلیفـەی چوارەم (علـی کـوڕی ئـەبو تالـب) لەوکاتـەدا ساڵی (٦٥٦ز-٣٦ك)دوو والی هەبـــوو، یـەکێکیان لەلایـەن خەلیـــفەی چـوارەم علیکوڕی ئـەبو تالیب دانرابوو کە (الاشتر مالك بن الحارس الخفی )بوو، دووەمـــیشیان لـەلایەن معاویـەوە دانرابـوو کـە( ضحاك ی کـوری قیسـل )بوو...پاش کۆتایی هاتنی سەردەمی خەلیفەکانی راشدین ، عێـراق چووە ژێر دەسەڵاتی حوکمی ئەمەوی (٦٦١-٧٤٩ ز) وبەم جۆرەش والـی یـەکانی سەر عێراق لەدیمەشقی پایتەختی ئەمەوی یەوە دادەنران....

شایەنی باسە عێـراق لەسـەردەمی دەسـەڵاتی ئەمـەوی یەکانـدا چـەندین جەنگی بەخۆوە بینـــیوە لـە نێوان لایـەنگرانی نـەوەکانی (ئیمام علـی کـوری ئەبو تالب) و دەوڵەتی ئەمەوییەکاندا ، بەم جـۆرەش عێـراق بـەردەوام لـەژێر دەسەڵاتی ئەمەوییـــــەکاندا مایەوە هەتا کۆتایی هاتنی دەستەڵاتیان..

سـاڵی (٧٥٠-١٢٥٨ز)ی وعێـراقیش چـووە ژێـر دەسـەڵاتی حـوکمی عەباسییەکان و بغداد بوویە پایتـەختی ئـەو دەوڵـەتە وپایتـەختی زانسـت و وەرگـێران و بوژاندنەوە..

لەسەردەمی دەوڵەتی عەباسیدا زۆرێك لە بنەماڵەکان سەریان هەڵدا کەلـە بنەڕەتدا دەگەڕانەوە بۆعەرەبەکان بۆ نموونە (بنی المهلب)یان بۆفارسەکان وەك (البرامکـە)و(السـلاحقە) کـەحوکمیان بـەناوی سـوڵتانەوە کـرد لـەنێوان

سالآنی (١٠٥٥-١١٥٢ز)هەروەها لە سەردەمی عەباسییەکاندا عێراق توشی چەندان شۆڕش و جەنگی ناوخۆیی بووە ، تا ئەوەی لەسەر دەستی (هولاکۆ)ی سەرکردەکەی مەغۆلەکان سالّی (١٢٥٨ز-٦٥٦ك) خەلافەتی عەباسی لە عێراقدا روخا

مەغۆلەکان لەمانگی شوباتی ١٢٥٨هاتنە نێو بغدادەوە ، دوای پێنج ڕۆژیش ، خەلیفەی عەباسی (المستعصم)، لەناو برا ، بەم جۆرەش بغداد ڕووبەرووی وێران کردن و تالآن و راورووت بووەوە ، لەهەمان کاتدا مەغۆلەکان عێراقیان دابەش کرد بۆ دووناوچە ، باشور کە پایتەختەکەی بغداد بوو ، باکور کە پایتەختەکەی موسلّ بوو ، هەردوو ناوچەکەش لەلایەن دوو فەرمان ڕەوای مەغولییەوە ئیدارە دەکرا ، کە دوو هاوکاریان هەبوو لە تورکمانەکان یان لایەنگرانیان . لەماوەی نێوان سالآنی ١٣٩٣-١٤٠١ز مەغۆلە تەیمورییەکان بەسەرکردایەتی تەیموری لەنگ هێرشیان کردە سەر عێراق و پەلاماری بغدادیان دا ، لەدوایدا کاروبارەکەیان دایە دەست چەند کۆمەڵەیەکی تورکمانی ، کە لە ململانێ دا دەژیان تائەوەی بنەماڵەی (السفویە) کە تورکمان بوون دەستیان گرت بەسەر کاروباری عێراقدا لەسالّی ١٥٠٨زدا ، دوای ئەوە درێژەیان بە دەسەلآتیان دا هەتا ئەو کاتەیعوسمانی یە تورکەکان لەسالّی ١٥٣٥وەدەریان نان .

عێراق لە سەردەمی دەسەلآتی عوسمانی دا (١٥٣٤-١٩١٨ز) چەندین هەوڵی چاکسازی و بونیات نانەوەی بەخۆوە بینی ، بەلآم بەهۆی ئەو پشێوی و ئالۆزیانەی ڕووبەرووی دەوڵەتی عوسمانی دەبویەوە لە بەرەنجامی ململانێی نێوان باڵی موحافیزکاران و ڕەوتی نوێخوازەکان و هەر دوای ئەوەش ڕەوتی بە ڕۆژئاوای کردن ، نەتوانرا ئەو پرۆژە چاکسازیانە لە عێراقدا تەواو بکرێن،

هەروەها زۆرێك لەو والیانەی لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیەوە دادەنرا دەستیان لە کار دەکێشایەوە ، بارەکەش بەوجۆرە بەردەوام بوو تا ئەوەی عێراق کەوتە ژێر دەسەلاتی بەریتانی لە ساڵی ١٩١٨.

بەریتانیا لەگەڵ هەلگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم لەتشرینی دووەمی ١٩١٤ ، بەسرەی داگیرکرد، پاش ئەوەش شاری (العمارە)لە حوزەیرانی ١٩١٥وشاری ناسریەی لە تەمووزی ١٩١٥ داگیرکرد ، سوپای بەریتانیا لە نزیکی بغداد توشی شکست هات ساڵی ١٩١٦ ، بەلام جارێکی ترو لەسەرەتای ساڵی ١٩١٧ هێرشی کردە سەر بغدادو لە ١٩١٧/٣/١١ توانی بچێتە ناو بغدادەوە ، شاری (موسل)یش لە تشرینی دووەمی ١٩١٨ کەوتە ژێر دەستی ئینگلیزەکان . بەم جۆرەش عێراق بەتەواوی کەوتە ژێر دەسەلاتی بەریتانیا . هەرچەندە لە هەندێ شوێندا عێراقیەکان هاوکاری ئینگلیزەکانیان دەکرد لەدژی دەوڵەتی عوسمانی ، لە پێناو ئەوەی کە لە دوایدا سەربەخۆیی دەست بخەن بەلام بەپێچەوانەوە ، ئینگلیزەکان بەئاگرو ئاسن وەلامی گەلی عیراقیان دایەوە و کەوتنە سەرکوت کردنیان ، تائەوەی لەم بەرەنجامەوە شۆڕشی ساڵی ١٩٢٠ دژبە حوکمی بەریتانیا لە عیراقدا رویداو و لەو بەرەنجامەشەوە زیانی گیانی و ماڵی بەر سوپای بەریتانیا کەوت و بەریتانیاش ناچار بوو هێزوپێداویستی سەربازی تر بهێنێتە عیراق ، ئەمەش بۆ سەرکوت کردنی هەر ڕاپەڕین و شۆڕشێك لە دژیان . لە٢٣ی ئابی هەمان ساڵدا وبۆهێور کردنەوەی ڕەوشەکە مەلیك فەیسەڵ ی یەکەم بانگهێشت کرا تا بکریتە مەلیك بەسەر عیراقەوە .. لەپێناو زیاتر سەقامگیربوونی دەسەلاتی بەریتانیا ، ئینگلیزەکان بیریان لەوە کردەوە تا شێوە ئۆتۆنۆمی یەك بدەنە عیراق و یەکەمین کابینەی وەزاری لە ١٩٢٠/١١/٢٧ پێکهێنرا ، وەك حکومەتێکی کاتی پاشایەتی و لەژێر

ئیدارەی وەزیرە عیراقیەکان و بە سەرپەرشتی حاکمی بالآی بەریتانیا بەڕێوەچوو .

لەسالّی ١٩٢١ مەلیك فەیسەڵ لە ڕاپرسی یەکی گشتیدا کرایە مەلیك بەسەر عیراقەوە

بەم جۆرەش وجودی بەریتانیا لە عێراقدا بەسوپاو دەسەلآتی سیاسی یەوە درێژەی هەبوو ، ئەمەش بەپێودانگی هەڕەشەی دەرەکی لە سەر عیراق، بەلآم نەیاریش هەر بەردەوام بوو لەدژی بوونی بەریتانیا تا ئەوەی (مەلیك فەیسەڵ)ی پاڵ پێوەنا داوا بکات لە بەریتانیا بە هەڵوەشاندنەوەی (ئینتیداب)و بەستنی هاوپەیمانێتیەك لەگەڵ عێراقدا ، لەبەرامبەریشدا بەریتانیا ڕەزامەندی دەربڕی و بەڵێننامەی هاوپەیمانێتی نێوانیان لە سالّی ١٩٢٢ئیمزاکرا ...

لەسالّی ١٩٢٥دا یەکەمین هەڵبژاردنی پەرلەمانی لەعیراقدا بەڕێوەچوو، لەگەڵ ئەوەی بەپیّ ی پەیماننامەی نێوانیان ڕێگە درا بوو بە بوونی چەندین بنکەی سەربازی بەریتانیا لەعیراقدا ، هەر لەم بوارەشدا ڕێکەوتنێکی تر لەسالّی ١٩٣٠ئیمزاکرا ، هەر لەسەرەتای سالآنی سی یەکاندا عێراق ریکەوتننامەی نێودەوڵەتی لەگەڵ هەریەك لە ئەمەریکاو ئەڵمانیاو فەڕەنسا مۆرکرد، لە ئوکتوبەری ١٩٣٢ عێراق بووە ئەندام لە کۆمەڵەی گەلان ئەمەش پاش ڕەزامەندی بەریتانیا . مەلیك فەیسەڵ ی یەکەم لەسالّی ١٩٣٣ کۆچی دوای کردو کوڕەکەی واتە غازی یەکەم جێگەی گرتەوە ، ئەم هەستا بەهەڵوەشاندنەوەی پارتەکان و بەهێزو چەك حوکمی عێراقی دەکرد ، هەر لەم سالّەدا ڕێکخراوی کومەڵەی گەلان هەستا بەگۆڕانکاری لە سنوری نێوان عراق و سوریاو (چیای سنجار)خرایە سەر عێراق ...

لە کۆتایی ساڵی ١٩٣٦ کودەتایەکی سەربازی بەسەرکردایەتی(بکر سدقی) کەدژی دەسەڵاتی بەریتانیا بوو لە عێراقدا رووی‌دا، بەڵام حوکمەکە ساڵێکی نەخایاند و کوژرا، ساڵی١٩٣٩ مەلیك غازی لە روداوی ئوتومبیلدا گیانی لە دەست دا ، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەمدا شورشی گەلی‌کورد بە شێوەیەکی بەرچاودەستی پێکرد و ئەمەش بووبەمایەی ئەوەی حکومەتی عێراقی زیاتر گرنگی بە پێگەی سەربازی بدات ... پاش کوژرانی مەلیك غازی ، کوڕەکەی واتە مەلیك فەیسەل ی دووەم کەتەمەنی سێ‌ساڵان بوو جێگەی گرتەوە وەك مەلیکی وڵات و لەژێرچاودێری خاڵەکەیدا ئەمیر عەبدولئیلاە کارەکان بەڕێوەدەچوو کە دانرابوو بە وسی بەسەر عەرشەوە . لەهەمان کاتدا نوری سعیدی سەرۆك وەزیران بەپشتیوانی بەریتانیا کاروباری دەوڵەتی بەڕێوە دەبرد ، لەهەمان ساڵدا عێراق پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ ئەڵمانیادا پچڕاند ، لە ١٩٤١/٥/٢ جوڵانەوەیەك لە عێراقدا هەڵگیرسا بە سەرۆکایەتی رشید عالی گەیلانی دژی دەسەڵاتی بەریتانیا بەسەر عێراقەوە لەئاکامی ئەم جوڵانەوەیەدا هەریەك لە وەصی عەرش و نوری سعید هەڵاتن بۆ ئوردون و لەوبەرەنجامەشەوە بەریتانیا جەنگی لەدژی حکومەتە نوێیەکەی رشید عالی گەیلانی ڕاگەیاند ، لەپاش مانگێك لە ڕاگەیاندنی جەنگ ، سوپای بەریتانیا بغدادی داگیر کردەوە ، لەگەڵیشدا وەصی عەرش گەڕایەوە و سەرکردەکانی جوڵانەوەکەش نەیان توانی درێژە بە بەرگری بدەن و خۆیان بەدەستەوەدا ..

پاشان بەهۆی ئیمزاکردنی هودنەیەکەوە بەریتانیا سەرلەنوێ دەستی گرتەوە بەسەر عیراقدا ، و حکومەتێکی نوێ پێکهێنرا کەلایەنگرو سەربەبەریتانیا بوو بەسەرۆکایەتی جمیل مدفعی و پاش ماوەیەك دەست لە کارکێشانەوەی خۆی ڕاگەیاندو نوری سعید جێگەی گرتەوە .. لەمانگی

کانونی یەکەمی ١٩٤٣ عێراق جەنگی دژی وولاتانی میحوەر ڕاگەیاند ..
ساڵی ١٩٤٥ عیراق بووە ئەندام لە جامعەی وولاتانی عەرەبی ، کاتێکیش شۆرشی گەلی کورد لە دژی حکومەت هەڵگیرسا لەنێوان ١٩٤٥-١٩٤٦ بەریتانیا هێزی زیاتری نارد بۆعێراق لەپێناو پارێزگاری ئاسایشی نەوتی خۆیدا ، پاش کۆتای هاتنی شۆرشی کورد لە ساڵی ١٩٤٦ نوری سعید کەوتە دانوستان لەگەڵ مەلیك ی ئوردون بۆپێکهێنانی یەکێتی یەك لە نێوان عێراق و ئوردوندا ، هەر لەو ساڵەشدا ئیمزا لەسەر پەیماننامەی برایەتی نێوان هەردوو وڵات کرا ، بەپێی ئەم پەیماننامەیە هاوکاری سەربازی نێوان هەردوولا دوپات کرایەوە ، تائەوەی کەلەساڵی ١٩٤٨ سوپای عێراقی بەشداری جەنگی کرد شان بەشانی سوپای ئوردونی لەجەنگی دژی ئیسرائیل (پاش ڕاگەیاندنی دەوڵەتی ئیسرائیلی ) لە فەلەستین دا . بەلاّم بەهۆی هەڵوێستی هەندێ لەسەرۆکی ژمارەیەك وڵاتی عەرەبییەوە و هەروەها پاڵدانەوەو خەمی ساردیان ، بوو بەمایەی شکستی ئەم جەنگە بەلای عەرەبەکان و جێگیربوونی دەوڵەتی ئیسرائیلی.

کاتێکیش پەیماننامەی (بورت سموث) لەساڵی ١٩٤٨ داڕێژرا بۆ دەستکاری کردنی پەیماننامەی ١٩٣٠ ، ڕاپەڕین لەعیراقدا سەری هەڵدا و تالەئاکامدا حکومەت و پەیمانەکەی هەڵوەشاندەوە ، هەرلەهەمان ساتدا ڕاپەڕینی کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی عێراقی ڕوویدا [١].

---

[١] سەرچاوە ئەنتەرنێت.

# گرنگترین گۆڕانکارییەکانی

# سالأنی ١٩٥٠-١٩٥٨

١- دامەزراندنی ئەنجومەنی ئاوەدان کردنەوە (المجلس الاعمار)

گەر سەرنجی هەل و مەرجی سیاسیوکۆمەلأیەتیوئابوری ئەو سەردەمەی عێراق بدەین دەبینین کەلە چەند خالێکدا خۆی دەنوێنێت:

أ-بالأدەستی و هەژموونی بەریتانی بەسەر تەواوی کاروبارەکانی عێراقداو پەیڕەو کردنی ئەو سیاسەتانەی کەخزمەت بە پەرژەوەندی بەریتانیادەکات ..

ب/ زیاتر زالْ بوونی دەسەلأتی دەرەبەگایەتی بەسەر جوتیاران وباری کشتوکالیدا لەعێراق و بەجۆرێك٥٦٪ زەویوزاری عێراق بەدەستی (٢٨٠٣)کەسەوە بوو ، دەسەلأتیان بەسەر ٧٠٪ی جوتیاراندا سەپاندبوو .

ج-بەهۆی هەلومەرجی خراپی بژێوی لەگوندەکان و چەوساندنەوەی دەرەبەگ ، گوندنشینەکان بەژمارەی زۆر گوندەکانیان بەجێدەهێشت وکۆچیان دەکرد نێو شارەکان و خانوی سەرەتایی و نەگونجاویان دروست کرد تاتێیدا بژین کەهیچ جۆرە هەل و مەرجێکی ژیانی تێدا نەبوو، بۆنموونە لەماوەی ١٠سالی پێش شۆڕش زیاتر لە ٢٠٠هەزار گوندنشین هاتبوونە بغدادو لە قەراغی شارداو لەهەلومەرجێکی ژیان و گوزەرانی سەختدا بوون .

د-شێوازێك لەدابڕان و بەئاگانەبوون لە جەماوەر درووست بوو لە لای کاربەدەستانی بالأی ولات بەجۆرێك کاتێك یەکێك لە وەزیرەکانی نوری سعید داوادەکات لێی تاسەردانی ئەو مالأنە بکات لەدەوروبەری بغداد

نیشتەجیٚ بوون و باری ژیانیان خراپە ، کە نوری دەچێتە ناوچەکە تووشی (شۆك)دەبێت لەچۆنیەتی باری ژیانی ئەو ماڵانە، هەرچەندە لەدوایشدا هیچ شتێکی ئەوتۆی بۆئەنجام نەدان کەکار بکاتە سەر گۆڕینی باری ژیان و گوزەرانیان.

٦/سەرکوت کردنی سیاسی و ڕێگەنەدان بە ئازادی پارت و ڕێکخراوەکان ، و هێشتنەوەی دەسەڵات بەتەنها لە دەستی خۆیاندا.

لەبەرەنجامی ئەو خاڵانەی سەرەوە چەندین دەرهاوێشتەی سلبی تر ، لەساڵی ١٩٥٠ حکومەتی ئەو کاتەی عیراق بڕیاری دامەزراندنی (ئەنجومەنی ئاوەدان کردنەوەی)دا، ئەم ئەنجومەنە ئەرکی دارشتنی پلانێکی ئابوری و دارای گشتی جیٚبەجیٚکردنی پیٚسپێردرا ، لە پێناو پێش خستنی سەرجەم بوارەکانی ژیان لە عێراقداو بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی دانیشتوان ، بۆئەم بوارەش بودجەیەکی سەربەخۆ دانرا کەلە ٧٠٪ی داهاتی نەوتی دەگرتەوە ، پلانەکەش کاری لەسەر پڕۆژەی درێژخایەن دەکردەوە ، وەك دروست کردنی بەنداوی (دەربەندیخان) و( دوکان) و هەروەهاپردی ( ذات الطابقین) لە بغداد، هەریەك لەم پڕۆژانە گرنگایەتی خۆیان تائێستا لەدەست نەداوە ...

بەنداوی ( ثە رثار ) دووئەرکی لەیەك کاتدا جیٚبەجیٚ دەکرد : یەکەم / ڕزگار کردن و پاراستنی ناوچەیەکی فراوان لەنێویشیاندا بەغداد لە مەترسی لافاو.. دووەم/ کۆگاکردنی ئاو کە توانای کۆکردنەوەی (٩٠)ملیار مەتر چوار گۆشە ئاوی هەبوو ، لەکاتێکدا دەریاچەی ناصر کەلەپشت (سدالعالی)یەوە دروست کرابوو توانای کۆکردنەوەی کەمتر بوولە (٧٥)ملیار مەتر چوارگۆشەی هەبوو.هەروەها هەردوو بەنداوی( دەربەندیخان) و(

دوكان) هەتا ئێستاش بۆكەمكردنەوەی مەترسی لافاو و كۆكردنەوەی ئاو بەرهەم هێنانی ووزەی كارەبا سودی لێوەردەگیرێت ...شایانی باسە كارەكانی ئەنجومەنی ئاوەدان كردنەوە لای زۆرێك لە گەلانی عێراقی گرنگی نەبوو، تەنانەت بەئەنجومەنی ئاوەدانكردنەوە دەوترا ئەنجومەنی ئستیعمار(داگیر كەر) ، چونكە لەو كاتەدا گەلی عێراقی بەگومانەوە لەم چۆرە كارانەیان دەڕوانی و بەبەشێك لەبەرژەوەندی بەریتانیا سەیریان دەكرد، ئەمەش زیاتر لەبەر دوو هۆكار :-

١-لەبەر ئەوەی كە بەریتانیا تا دەهات هەژموونی خۆی لەعێراقدا زیاتر دەكردو ئەم جۆرە پرۆژانەش كە زۆر زەبەلاح بوون و بەتەكنیكی دەرەكی و سەرپەرشتی ئەوان (بەریتانییەكان ) دروست كرا ، گومانی ئەوەی لێ دەكرا ببێتە هۆی زیاتر چەسپاندنی پێگەی بەریتانیا لە عیراقدا ، بەتایبەت كاری لەو جۆرە لە عێراقدا نەكرابوو.

٢-ئەم جۆرە پرۆژانە كاریگەری هەنوكەیی وخێرای نەبوو ، گەلی عیراقیش لەو كاتەدا پێویستی بەو كارانە هەبوو كە دەست و برد بێت و خێرا سودی لێوەربگرن ، نەك چەندین ساڵ چاوەڕێی بەرهەمەكەی بن ...

پاش سەركەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمموز، سەرانی شۆڕش قەناعەتیان وابوو كە دەبێت بەشێوەیەكی تەواو ئابووری عێراق ئازاد بكرێت لە پاشكۆیەتی بەریتانی، لە هەمان كاتدا كەم كردنەوەی جیاوازی نێوان چینەكانی كۆمەڵگا لە ڕووی ئابوورییەوە، و ڕەخسانی بوار لە بەردەم خاوەن تواناو لێهاتنەكان تا بتوان رۆڵی خۆیان ببینن و دادپەروەری كۆمەلایەتی بچەسپێت، ئەمانەش هەموو بە خستنە گەڕی تواناو وزەی وڵات، تێڕوانینی دەسەڵاتی سەربازیش سەبارەت بە ئەنجومەنی ئاوەدان

کردنەوە زۆر جیاواز نەبوو لەگەڵ تێڕوانینی پارتە سیاسیەکاندا لەبەرەی یەکێتی نیشتمانی، کەناویان لێ نابوو بە( ئەنجومەنی ئیستعمار) ئەمەش وەك سوکایەتی کردن بە پرۆژەکانی، کەپێیان وابوو لە خزمەتی ئامانجی نانیشتمانی دایە، لەبەر ئەوە دەبوایە گۆڕانکارییان بهێنایە بەسەر ئەم ئەنجومەنەدا، تالە گەڵ بارودۆخی تازەدا بگونجێت، هەربۆیەش هەستان بە دانانی (فوئاد رکابی) کەئەندازیارێکی بەعسی بوو، بە وەزیری ئاوەدان کردنەوە، کەلە پێشدا لە ئەنجومەنی ناوبراودا بوو، تاهەستێ بە چاوخشاندنەوە بە بارو دۆخی ئەنجومەنەکەداو، ئەویش دەستی دایە پێکهێنانی چەند لیژنەیەك بۆ تاوتوێ کردنی یاسای کاری ئەنجومەنی ئاوەدان کردنەوەو کارەکانی..

لەرۆژی یەکەمی شۆڕش مەرسومەی کۆماری ژمارە (١٥) دەرچوو تێیدا هاتبوو:

بەلەبەرچاو گرتنی بەرژەوەندی گشتی و لەسەر بنەمای ئەوەی کە وەزیری ئاوەدان کردنەوە خستیە بەردەست و ئەنجومەنی وەزیران رەزامەندی لەسەر دەربڕی بڕیارماندا:-

ماوەی ئەندامێتی بەڕێز (تەها هاشمی) نوێ نەکرێتەوە کەلە ١٣ی ئابی ١٩٥٨ کۆتایی دێت.

لەکار لابردنی ئەندامانی ئەنجومەنی ئاوەدان کردنەوە، ئەوانەی ناویان لە خوارەوە هاتووە، لەبەرواری ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨:

١- جەلال بابان

٢- عەبدولجەبار چەلەبی.

٣-عەبدولرەحمان جەلیلی.

٤- عەبدولغەنی دەلی.

پێویستە لەسەر وەزیری ئاوەدان کردنەوە ئەم بڕیارە جێبەجێ بکات.

لەبەغداد نوسرا لە رۆژی بیست و شەشی (ذی اللحجة) ١٣٧٨ بەرامبەر بە رۆژی چواردەی تەمموزی سالی ١٩٥٨.

ئەنجومەنی سیادە[1]

٢-هەڵبژاردنی سالی ١٩٥٤

لەگەڵ ئەو هەلومەرجە سیاسیە ئالۆزو ناجێگیرەی لە عیراقدا بەڕێوە دەچوو ، کابینە وەزارییەکان زوو زوو دەستیان لە کار دەکێشایەوە لەهەمان کاتدا ئازادی کاری سیاسیش زۆر سنوردار بوو ،سەرەڕای ئەمانەش سەرکەوتنی شۆڕشی ٢٣/تموزی ١٩٥٢ لەمیصر ، بوونە مایەی ئەوەی جم و جوڵی سیاسی زیاتر لەعێراقدا بەرەو پێشەوە بەرن ، تا گەیشتە ئەوەی لەمانگی تشرینی دووەمی ١٩٥٢لە عیراقدا ڕاپەڕین ڕویدا، پشێوی‌و ئالۆزی جارێکی تر عێراقی گرتەوە ، بارەکەش بەم جۆرە درێژەی هەبوو ، تاکارگەیشتە ئەوەی حکومەتی عێراقی لە سالی ١٩٥٤ هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئەنجامدا و پارتەکانی ئوپۆزسیۆن بەیەك لیست بەشدار بوون ، لەئەنجام دا توانیان لەکۆی ١٣٥کورسی پەرلەمان ١١کورسی بەدەست بهێنن ، ئەمەش یەکێك بوو لەو هەلومەرجە دەگمەنانەی کە پەرلەمان ئۆپۆزسیۆنی ڕاستەقینەی بەخۆوە ببینێ ، بەلاّم زۆری نەبرد ئەم ئاواتەی ئۆپۆزسیۆن لەناو چوو، بۆیە دوو مانگ تێپەڕی بوو بەسەر دامەزراندنی ئەم پەرلەمانەداو تەنها یەك کۆبوونەوەی ئەنجام دابوو ، نوری سعید بە

[1] تاريخ الوزارات العراقية فى العهد الجمهوري، الجزء الاول، ١٤/٧/١٩٥٨-٧شباط ١٩٥٩، تأليف مجموعة من الاساتذة سنة ٢٠٠٠ص١٥٣.

ئیرادەیـەکی پاشـایەتی بڕیـارێکی دەرکـرد بۆهەڵوەشـاندنەوەی پەرلـەمان .لەگەڵ ئەمەشدا لە هەوڵی ئەوەدا بوو تا چەندین بڕیاری تر دەربکات لە بواری سیاسـیدا ، بەم جۆرەش چەندان تەشریعات دەرچوو بۆدەسەڵات گرتن بەسەر ئازادی ڕادەربڕین و هەڵوەشاندنەوەی پارتی سیاسـیو لە دوایشدا پەرلەمانێکی هێنایە ئاراوە کە لە بەرەنجامی هەڵبژاردنێکی ترەوە پێکهات و لەژێر توندو تیژترین چاودێریو هەلومەرجی سیاسـیدا ئەنجام درا ... بەم شێوەش پارتە سیاسـییە سەرەکییەکان چوونە قۆناغی نهێنییەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا عیراقیش چوویە هەلومەرجێکی سیاسی ناسکەوە ..بەم جۆرەش هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی ١٩٥٤ واتای ڕاستەقینەی خۆی لە دەست دا ، پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کەلەسەردەمی دەستەڵاتی پاشایەتیدا هێندە بوار نەڕەخسابوو بۆ پارت و ڕەوتە سیاسیەکان تا گەشەبکەن و کاربکەن، و بتوانن بەشداری کاروباری بەڕێوبردنی وولات بکەن ، تەنانەت کارەکە گەیشتە ئەوەی لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تموزی ١٩٥٨ هەست بە بۆشاییەکی سیاسیو ئیداری دەکرا لە عێراقدا کە لە شوێنی خۆیدا باسی لێوە دەکەین .

٣/ پەیمانی بغداد ١٩٥٥

بەرەی ڕۆژئاوا بڕیاری پێکهێنانی ڕێکخراوی بەرگری لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕست یان دا ، ئەمەش لەدژی بەرەی ڕۆژهەڵات ، بەڵام ئەم پرۆژەیە سەرکەوتو نەبوو بەهۆی نەیارێتیکردنیەوە ، پاش ئەم هەوڵە شکست خواردووە، بەریتانیاو ئەمەریکا دەستیان دایە هەوڵدان لەگەڵ ناوەندو کەسایەتییە ڕەسمییەکانی عێراق و تورکیا و کەوتنە وتووێژەوە ، لە کۆتای ساڵی ١٩٥٤ نوری سعید سەردانی لەندەنی کردو پاشان تورکیا ،

تائەوە بوو هەردوولا (توركياوعێراق)لەسەر دامەزراندنی بەرەیەكی ئەمنی هاوبەش ڕێك كەوتن ، بەم جۆرەش دانوستانی نێوانیان بەردەوام بوو لەپێناو دارشتنی بەلاغیكۆتایی پرۆتۆكۆلەكە ، پاشان لە ١٩٥٥/٢/٢٣ وەفدێكی توركی بەسەرۆكایەتی( عدنان مندریس) سەردانی بەغدادی كردو لە ١٩٥٥/٢/٢٤ ڕێكەوتنەكە مۆركرا ، لە ٤/٢٥/یهەمان ساڵ بەریتانیاش بووبە ئەندام تێدا ، لەدوای ئەم پەیوەندی كردنە ، پەیمانەكە ناونرا بە پەیمانی بەغداد و داواكرا لە هەریەك لە پاكستان و ئێران بۆ بوونە ئەندام تێیدا ، ئەوە بوو پاكستان لە ٩٥٥/٩/٢٣بووە ئەندام و ئێرانیش لەمانگی ١٩٥٥/١١ . هەرچەند داوا كرا لەهەندیووڵاتی زلهێز تا ببنە ئەندام لەم پەیمانەدا ، بەڵام ڕەتیان كردەوە ، لەلایەن خۆیەوە ئەمریكا تەنها پشتگیری پەیمانەكەی كرد و لەهەندیلیژنەیدا بەشدار بوو ، پاش سەركەوتنی شۆڕشی ١٤ی تموزی ١٩٥٨ عێراق لەم پەیمانە كشایەوە و لەدوایدا پەیمانەكە ناوەكەی گۆڕا بە پەیمانی مەركەزی یان (سنتۆ).

بێگومان پەیمانی بغداد لەو كاتەدا وەك پشتێنەیەكی ئەمنی بەڕووی مەترسی تەوژمی كۆمۆنیستیدا هاتە ئاراوە و پارێزگاری كردن بوو لە ووڵاتانی دۆست و لایەنگرانی بلۆكی ڕۆژئاوا .. جێگای باسە بزوتنەوە شۆڕشگێڕییەكان هەوڵی ڕزگاربوونیان دەدا لە دەستی ئستیعمارو بەتایبەت پاش سەركەوتنی شۆڕشی ٢٣یتموزی ١٩٥٢ و ڕووكردنە بلۆكی ڕۆژهەلاتی زیاتر ئەم نیگەرانییەی دروست كردبوو ، هەر بۆیەش دەبینین هەریەك لە سوریاو میصر بەتوندی دژی ئەم پەیمانە وەستانەوە هەندیكەسی شارەزاش بیروڕایان لەسەر ئەوە جەم بوو كە حكومەتی شانشینی ئوردونیش حەزی بەوە كردووە بچێتەنێو ئەم پەیمانەوە بەڵام

لەبەر نەیاری ڕای شەقامی ئوردونی سەبارەت بەم پەیمانە، ئوردون هەنگاوەکەی نەکرد بە عەمەلی ، سەبارەت بەدەوڵەتی ئیسرائیلیش زۆر لا بیروڕایان وابوو هەرچەند بەشێوەیەکی رەسمی وئاشکرا ئیسرائیل هەڵوێستیسەبارەت بەم پەیمانە وبەشداری تیدا کردنی شتێکی ئەوتۆنەبووە و هیچ جێ دەستێکی دەوڵەتی ئیسرائیلی تیدا بەدی نەکرا ، بەڵام قسەو باس لەسەر ئەوە هەبووە کەئیسرائیل بە شیوەی نهێنی و لە پشتی پەردەوە بەرژەوەندی خۆی تیدا بینییەوە و لەبەرمەترسی لێك هەڵوەشانەوەیپەیمانەکەش بەشداری تێدا نەکردووە ..

لەسەر ئاستی ناوخۆی عێراق ، پەیمانی بغداد زۆر بەتوندی دژایەتی دەکرا لەلایەن شەقامی عیراقییەوە و داوای هەڵوەشاندنەوەیان دەکرد لەگەڵ دەرچوونی عیراق لەو پەیمانە ، چونکە عێراق تاکە وڵاتی عەرەبی بوو کە ئەندامی ئەم پەیمانە بێت و ناوی پەیمانەکەش ناوی پایتەختی وڵاتێکی عەرەبی هەڵگرتبوو کە هەمیشە ڕەمزی شانازی عەرەب بووە و لە هەمان کاتدا لە رووی گیانی سەردەمیشەوە رەوتێکی پێچەوانەبوو لەگەڵ ئاراستەی گیانی شۆڕشگێڕیو ئازادیخوازیو سەربەخۆی کە لەو کاتەدا لە پەرەسەندن دا بوو ، سەرەڕای ئەمانەش مایەی دابڕان و گۆشەگیری عێراق بوو لە جیهانی عەرەبی ، چونکە ئەم کارە لەگەڵ ریکەوتن نامەی ئاسایشی سعودیە پێچەوانە بوو کە لەو کاتەدا لە ئارادابوو ..

٤/پێکهێنای بەرەی یەکێتی نیشتمانی١٩٥٧

بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی ئاکامی هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکەی ناوەراستی١٩٥٤و قەدەغە کردنی کاری پارتەسیاسیەکانو لەهەمان کاتدا هاتنەئاراوەی پەیمانی بەغداد ١٩٥٥ بەهەڵسوراندنی عێراق وەك لایەنی

جیّبەجیّكارو هێرشی سیّ قۆلی بەریتانیا و فەرەنساو ئیسرائیل بۆسەر میسر لە ئۆكتوبەری ١٩٥٦و سەرەرای ئەمانەش خراپی هەلومەرجی ژیانی سیاسیوئازادی رادەربرین وهەژاریو دوا كەوتووی نێوگەلی عیراق و گرنگی نەدانی حكومەتی عیراقی پیّیان ...تادەهات پارتەكانی ئۆپۆزیسیۆن لەیەك نزیك دەبونەوەو ئەوەبوو لە ئاكامداولە ١٩٥٧/٣/٩ یەكەمین بەیاننامەی دامەزراندنی بەرەی یەكێتی نیشتمانی راگەیەنرا .. ئەو پارتانەی لەم بەرەیەدا بەشدار بوون بریتی بوون لە :-

١-پارتی سەربەخۆیی(حزب الاستقلال) كەسالّی ١٩٤٦دامەزرابوو، بچوكترین پارتی نێو بەرەكەو پارتێكی عەرەبی ئیسلامی میانەرەو بوو ، زیاتر پیّی دادەگرت لە سەر نەمانی هەژموونی بەریتانیا لەعێراقدا..

٢-پارتی بەعس كەسالّی١٩٥٢ لە عێراقدا دامەزرابوو، ئەم پارتە توانی لاوان لەدەوری خۆی كۆبكاتەوە ئەمەش بەهۆی بیرو را ناسیونالیستەكانیەوە ، بریاری وەستانی كاری حیزبەكان كەلە سالّی ١٩٥٤ زۆر كاریگەری لە سەر پارتی بەعس نەبوو ، چونكە لەو كاتەدا ئەم پارتە بەنهێنی كاری دەكرد ، لەبەر تازەیشی نەیتوانی بوو ژمارەیەكی زۆرخەلّكی لە خۆی كۆبكاتەوە .

٣-پارتی نیشتمانی دیموكراتی سالّی ١٩٤٦ دامەزرابوو، رێرەوی فیكریان لیبرالی چەپی میانەرەو بوو، لەگەلّ بوونی پێگەیەكی كۆمەلاّیەتی بەر تەسك ، بەلاّم لەگەلّ پارتی سەربەخۆیدا توانیبویان دەركەوتو ترین كەسایەتی یەكانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی پێك بهێنن.

٤-حزبی شیوعی عێراقی سالّی١٩٣٤لە عێراق دامەزرابوو ، وەك پارتێكی بیّمۆلّەت مابووە و كاری دەكرد، بەلاّم ئەم پارتە لە دواین

قۆناغەکانی دەسەلأتی پاشایەتیدا لە عیراق بووە ڕەگەزێکی سەرەکی گۆڕەپانی سیاسی لە عێراق دا، لە بەیاننامەی دامەزراندنیدا کەلە ١٩٥٧/٣/٩ بلأوکرایەوە، بەرە پیی داگرتبوو سەر سیاسەتی دەرەکی عێراق و بەتوندی ڕەخنەی لەم بوارە گرتبووە ، هەربۆیە (١٦٦١)ووشەی بەیاننامەکە تایبەت بوو بەسیاسەتی دەرەکی، لەکاتێکدا چارەسەری باری ناوخۆی وولأتی لە (٦٠٥)ووشەدا کورت کردبووەوە، لەسەر ئاستی ناوخۆی ڕەخنە لە سیاسەتی حکومەت گیراوە لەسەر سەرکوت کردن و ئەم حاڵەتەشی بۆ ململانێ نێو دەوڵەتی یەکان گەڕاندۆتەوە. جیهان بینی بەرەش سەبارەت بەهەلومەرجی نێو دەوڵەتی دابەش بوو بوو بەسەر دوو بەرەدا: یەکەم / بەرەی (شەڕ) کە خۆی لە سەربازگەی ڕۆژئاوایی و دەسەلأتی کۆلۆنیالیزمدا دەبینیەوە.. دووەم / بەرەی (چاکە) کە خۆی لەبزووتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیەکاندا دەبینیەوە لە چوار چێوەی وولأتانی بێلایەندا، بێگومان بەیاننامەکە سیاسەتی دەرەکی حکومەتی پاشایەتی بەستبووە وە بە سەربازگەی ڕۆژئاواوە ، هەروەها لە بەیاننامەکەدا نوری سعید وەك بە کرێگیراوی سەربازگەی ڕوژئاوای وەسف کرابوو ...

## داواکارییەکانی بەرەی یەکێتی نیشتمانی

١-لاخستنی کابینە وەزارییەکەی نوری سعیدو هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی نوێنەران •

٢-دەرچوون لە پەیماننامەی بەغدادو یەکخستنی سیاسەتی عێراقی لەگەڵ سیاسەتی وولاتانی عەرەبی سەربەخۆ•

٣-بەرەنگار بوونەوەی دەستێوەردانی کولونیالیزمی بەهەموو شێوەکانی و پەیڕەوکردنی سیاسەتی بێلایەنی ئیجابی،کە جمال عبد الناصر بۆبزوتنەوەی وولاتانی بێلایەنی دانابوو...

٤-ریگەدان بەئازادی دیمکراتی دەستوری .

٥-هەڵوەشاندنەوەی حوکمی عورفی و ئازادکردنی زیندانیە سیاسیەکان وگەڕانەوەی قوتابیان و فەرمانبەرە دەرکراوەکان بۆسەر پیشەکانیان بەهۆی باری سیاسیەوە کەدەرکرابوون...

سەبارەت بەباری ئابووری و چارەسەرکردنی ئەم بوارە لە بەیاننامەکەدا ئاماژەی پێ نەدرابوو، زۆر لا بیروڕایان لە سەر ئەوەبوو کە عێراق وولاتێکی دەوڵەمەندەو کێشەی ئابوری‌نیەو دەتوانرێت بە ئاسانی چارەسەربکرێت، بەلاّم هەندێکی ترئەم باس نەکردنە بۆجیاوازی بیروڕای ئەندامانی نێو بەرە دەگەڕێننەوە کە کۆك نەبوون لەسەر یەك هەڵوێستی یەکگرتوو، بەتایبەت هەندێ مەسەلەی وەك چاکسازی کشتوکاڵی‌و کێشەی دەرەبەگ لەعێراقدا، کەوای کردبوو بەردەوام جووتیاران لە هەلومەرجێکی نادروستی ئابوریدا بژین.. بەلاّم هەندێکی تر بڕوایان وایە ئەوانەی لەو کاتەدا نوێنەرایەتی بەرەی ئۆپۆزسیۆنیان دەکرد، لەتازە تێکۆشەرە سیاسیەکان بوون پێدەچێت زۆر دەرکیان بەم مەسەلە نەکردبێ لە ڕووی گرنگی‌یەوە.. بەگشتی دەتوانم

بلـێم پاڵنـەری سـەرەکی هاتنـە ئـاراوەی بـەرە، هێنـدە سـەرکوت کردنـی سیاسـیو گرتنەبـەری سیاسـەتیهەڵە بووە لەسـەر هـەردوو ئاستی ناوخۆو دەرەوە ، هێنـدە پاڵنـەری ئـابووری نەبووەتـە هـۆی هاتنە ئاراوەی.. یـاخود دەتوانین بڵێین ئەو نوخبەی سەرکردایەتی ئەم بەرەی دەکرد، کەمتر لە ژێر کاریگـەری رەهەنـدە ئابوورییەکـەدا بـوون بـەبارە سـلبییەکەیدا..بـەدەر لـەو خاڵـەی باسمـان کـرد، خـاڵێکی تـری گـرنگ هەیـە سـەبارەت بەمەسـەلەی بەرەیەکێتی نیشتمانی، ئەویش ئەوەیە تاچەندئەم بەرەیـە توانیبـوی بێتـە جەمسەرێك بۆکۆکردنەوەی جەماوەر لەدەوری خۆی ؟

بێگومان عێراقییەکان لەو سەردەمەدا خۆشحاڵ بوون، بەتایبەت توێژی رۆشنبیرو قوتابیوسیاسیەکان، بە کۆکردنەوەی سەرجەم بیروڕا سیاسیەکان لەبۆتەیـەکی نیشـتمانیدا، و سـەرکردایەتی کردنـی ڕاپـەڕین و یەکخسـتنی، تەنانـەت ئـەم بەرەیـە گەیشـتە ئـەو ئاسـتەی هەڕەشـە دروست بکـات لەسـەر پێگەی دەسەڵاتی پاشایەتی لەعێراقدا، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا هەندێ پارت و ڕەگـەزی نەتـەوەیی تـر تێـدا بەشـدار نـەبوون ... مـن پـێم وایـە لاوازتـرین خـاڵی بەرەکـە زاڵ بـوونی هـەژموونی ناسیۆنالیسـتی بەعسـییەکان بـووە بەسـەر بەرەکـەدا، کـە ڕێگـەی نـەداوە بەبەشـداری نەتەوەیـەکی تـر، یـاخود پـارتێکی تـر لەسـەر بنـەمای نەتـەوەی لەبەرەکـەدا، تەنانـەت بەعسـییەکان (مافی ڤیتـو)یـان لـە بەشـداری کردنـی هـەر ڕەگـەزێکی ترجگـە لـە عەرەبـەکان بـەکار دەهێنـا، سـەبارەت بـە پـارتی و بـەرەی یـەکێتی نیشـتمانی، بـەڕێز (مەسـعود بـارزانی) لـە کتێبـی (بـارزانی و بزوتنـەوەی رزگـاریخوازی کـورد) ل٢١ دا دەڵێـت: لەسـەرەتادا پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان نەچـووە نـاو بەرەکـەوە، چـونکە حزبـی بـەعس بـەر هەڵسـتی دەکـرد، هەڵوێستی شیوعی

دڵخۆشکەر نەبوو پارتی دیموکراتی کوردستان بێتە ناو بەرەکەوە، پاشان کاتێك داواکرا لە پارتی بێتە ناو بەرەکەوە بەماوەیەك پێش شۆڕش – بەتایبەتیسکرتێری پارتی وای بەباش زانی کە جارێ بڕیاری چونە ناو بەرە نەدات، تاپرس بەسەرۆك جەمال عەبدولناصر دەکات، لەگەڵ ئەمەشدا پارتی هەر پەیوەندی ڕێکی لەگەڵ بەرەدا بەستبوو.. بەڵام (ئەحمەد مهنا) لەبەر نامەی (بین الزمنین) ی کەناڵی ئاسمانی ئەبوو زەبی کۆتایی ساڵی ٢٠٠١ دەڵێت: لەو سەردەمەدا پارتی دیموکراتی کوردستان بەهۆی پرۆتۆکۆلێکەوە لەگەڵ حزبی شیوعیدا، بەلایەنگری بەرەکە حسابی بۆدەکرا و داواکاری حزبی شیوعی گوزارشتی لێدەکرا ، دەتوانم بڵێم هەر ئەم ڕەگەزی نەتەوەیشە لە عێراقدا بەردەوام و لەو کاتەوە مایەی گرفت و پشێوی و ناجێگیری باری سیاسی بووە و تالآوی کردووە بە گەرووی عێراقیەکاندا .[1]

---

[1] بەرنامەی بین الزمنین کەناڵی ئاسمانی ئەبوو زەبی کۆتایی ساڵی ٢٠٠١

# مێژووی ئەفسەرانی ئازادیخواز

هەرچەندە زۆر لا مێژووی ئەفسەرانی ئازادیخواز دەبەستنەوەبە ئەفسەرانی ئازادیخواز لە میصرو ئەنجامدانی شۆڕشی ٢٢یولیوی١٩٥٢، بەلآم گەر بەمێژووی عیراقدا بگەڕێینەوەدەبینین مەسەلەکە لەمەش زیاتر ڕەگی قوڵتری هەیە و ناکرێت ببەسرێتەوە بەو چرکە ساتەوە، بەڵکو پەیوەستە بە پێشینەی دەیان ساڵ لە شۆڕشی ٢٢ییولیوی ١٩٥٢، ئەم جۆرە بزاوتانە ڕەگ و ڕیشەیان درێژ دەبێتەوبۆ دەیان ساڵ لە پێش پەنجاکان و شێوازێك لە کارلێکی بەردەوام دروست بووبوو لە نێوان ئەفسەرانی سوپای عێراقدا، و لە هەمان کاتیشدا سیاسی و پارتە سیاسیەکاندا ، کودەتاکەی بکر صدقی ١٩٣٦سیاسیەکان ڕۆڵی بەرچاویان تێدا هەبوو، هەروەها بزووتنەوەکەی ١٩٤١ی گەیلانی کە لەلایەن ئەفسەرە نەتەوەیی یەکانەوە سەرکردایەتی کرا بە بەشداری سیاسیەکان و لەو بەرەنجامەشەوە حکومەتیکی بەرگری نیشتمانی بە سەرۆکایەتی رشید عالی گەیلانی هاتە ئاراوە ٢، بەهەرحاڵ هەرچۆن بێت و بە هەر شێوازێك بووبێت ئەفسەرانی ئازادیخواز هەموو بیرو ڕایەکیان لەسەر لاخستنی دەسەلآتی حکومەت بەزەبری هێز جەم کردبوو، نەك لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە یان

---

[٢] حركة الضباط الاحرار، خلافاتهم الفكرية هدمت اسس ثورة ١٤تموز. جلال حسين محمد، جريدة الاتحاد العدد٤١٤ بتأريخ ٢٠٠٢/٣/٣٠.

شۆڕشی میللی ڕێکخراو[١]، ئەمەش ئەو خاڵە هاوبەشەیە کە ئەفسەرانی ئازادیخواز لە وولاتێك و وولاتێکی تردا گرێدەدا...

لەلایەکی دیکەوە جەنگی فەلەستینی ساڵی ١٩٤٨ و ئەو کارەساتەی لێی کەوتەوە لەڕووی نەتەوەیی و ئیسلامی‌یەوە، بووبە پاڵنەرێکی گەورەی سوپاکانی ولاتانی عەرەبی تادەست بدەنە کاری نهێنی و ڕێکخراو، بەتایبەت ئەو ولاتانەی بەشداری جەنگەکەیان کرد، لەسوپای عێراقیشدا (رفعت الحاج سري) یەکێك بوو لەو ئەفسەرانەی بەشداری جەنگەکەی کردو ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا لەزۆربواری سەربازی جەنگەکەدا، کاتێك (سری) گەڕایەوە عێراق و شکستی سوپای عەرەبی بینی لە جەنگەکەدا، بووبە پاڵنەری ئەوەی تابیر بکاتەوە لە پێکهێنانی ڕێکخستنێکی نهێنی لەناو سوپای عێراقدا و بۆئەم مەبەستەش پەیوەندی کرد بە ژمارەیەك لە ئەفسەرانی بواری ئەندازیاری و بوارەکانی تر،لەنێو ئەوانەشدا قسەی لەگەڵ (مقدم رجب عبدالمجید وعقید رکن عبدالوهاب الامین، عقید رکن محی الدین عبدالحمید)کردوە لێرەشەوە سەرەتاکانی دەستپێکردنیڕێکخستن لەناوسوپای عێراقیداسەریهەڵدا. [٢]

[١] العلوى حسن، عبدالكريم قاسم رؤية بعدالعشرين، ص١١٦.

[٢] غالب صبيح على قصة ثورة ١٤تموز والضباط الاحرار، دار الجاحظ للطباعة والنشر، بغدادط١ ١٩٦٨ص٣٧.

# کێ خاوەنی بیرۆکەی ئەفسەرانی ئازادیخوازە لە عیراقدا؟

مشتو مڕ زۆر کراوە لێرەو لەوێ لەسەر ئەوەی کە کێ یەکەم کەس بووە مەسەلەی ئەفسەرانی ئازادیخوازی وروژاندووە لە نێو سوپای عیراقدا ، لەم نێوەشدا زۆر ڕای جیاواز هەیە و هەرلایەك پێیان وایە کەئەفسەرێکی دیاری کراو ئەو کارەی کردووە ، ئەوەشی من لەم بوارەدا هەولمدا بۆی بگەڕێم و ساغی بکەمەوە ، چەند سەرچاوەیەك بوو، کە لە کۆتایدا ئەوەم بۆ ڕوون بووەوە زۆربەی ئەو سەرچاوانە بڕوایان وایە (رائدی ئەندازیار رفعت الحاج سری)بووە [3] کەلەسیپتەمبەری ١٩٥٢ بۆیەکەمین جار دەست پێشخەری فیکرەی دامەزراندنی تەشکیلەی ئەفسەرانی ئازادیخوازیتەرح کرد بۆ هاوڕێی خۆشەویستی (موقەدەمی ئەندازیار رجب عبدالمجید) ، ئەمەش لە ژێر کاریگەری ئەفسەرانی ئازادیخوازی میصر کە نزیکەی دوو مانگ بەر لەو وادەیە لە ٢٢/یولیوی١٩٥٢شۆڕشیان لە میصردا ئەنجام دا بوو ، تێدا دەسەلاتی مەلیك فارووق لاخرابوو، رفعت کوڕی ئەفسەرێکی عەرەبی بووە لە سوپای عوسمانیدا ، کەسایەتی یەکی موتەوازیع بووە ، هەڵسو کەوتی زۆر ئاسایی بووە ، سەرە رای کەسایەتی بە هێزی خۆی لەهەمان کاتدا بە ئەفسەرێکی ئازاو لێهاتوو ناسرابوو، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا زۆر زوو

---

[3] هەریەك لە د. مجید خدوری لەکتێبی العراق الجمهوری ل٣٤، و لیث عبدالحسن الزبیدی لة کتێبی (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ فی العراق) ل١٠٨ ، و کەناڵی ئاسمانی ئەبوزەبی لەسەر ئەم بابەتە ئەلقەی یەکەمی کۆتایی ساڵی ٢٠٠١ ، حمید میرخانیش لە یاداشتەکانیدا رۆژنامەی الاتحاد ژمارە ٤١٤ لە٣٠/٣/٢٠٠٢ ، سەرجەمیان باس لەوە دەکەن کە فیکرەی ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخواز دەگەڕێتەوە بۆ رفعت الحاج سری، بەلام حسن العلوی لە کتێبی عبدالکریم قاسم رؤیة بعدالعشرین ل١١٦ پێی وایە کەفیکرەکە هی ئەندازیار رجب عبدالمجید بووە. بەهەر حاڵ ئەوە بەدیار دەکەوێت کەزیاتر بیرو راکان لەسەر رفعت الحاج سری جەم دەبن کەخاوەن بیرۆکەی ئەفسەرانی ئازادیخواز بێت.

متمانەی بەخشیوە بەبەرامبەری و هەربەخێرایی ئەوەی بەرامبەری دەیوت ئەو بە خێرای بڕوای پێ دەکرد، تەنانەت تائاستێك کە گیانی خۆی دەخستە مەترسییەوە، لەگەڵ ئەمانەشدا کەسایەتییەك بووە گەر بگەیشتبایەتە بیرو رایەك زۆر سوردەبوو لەسەری و هەرگیز لەڕای خۆی دانەدەبەزی ، هەر دەربارەی کەسایەتی (سری) ئیسماعیل عارف دەڵێت" رفعت کەسێکی دیندارو هێمن بووە،خاوەنی کەسایەتییەکی بەهێز و زۆر نهێنی پارێزبووە، هەستت دەکرد وەك هاوڕێ یەك زوومتمانە دەکەیتە سەری، هەرگیز وشەیەکی خراپم لێنەبیستووە، تەنانەت لە نێو هاوڕێکانیدا ناسراوبوو بە (شێخ رفعت) کەسایەتییەك بووە کەناچاری دەکردی زوو متمانەی پێ بکەیت و رێزی لێ بگریت...[1] بەم جۆرەش لەدرێژەی سالآنی دوایدا ، ئەندامانی ئەفسەرانی ئازادیخواز لە زۆربەی یەکەکانی سوپای عیراقدا گەشەیان کرد ، لەگەڵ ئەوەی ئەم رێکخراو و گروپانە بەشێوەیەکی هارمۆنی پەیوەندیان پێکەوە نەبوو، هەر لایەك بۆ خۆی گەشەیبە کوتلەی خۆی دەدا...چونکە دروست بوونی یەکەمین هەنگاو بۆ دروست کردنی رێکخستنی نهێنی لە ناو سوپادا لەو تەشکیلەدا خۆی بەرجەستەکرد کەئەندازیار (رفعت الحاج سری) رۆڵی سەرەکی تیا گێڕا و رێگەی خۆشکرد بۆ دروست کردنی رێکخستنێکی پتەو لە سوپادا کەئەنجامەکەی لەو رێکخستنە بە هێزەدا خۆی بینییەوە کە بەسەرکردایەتی عەبدولکەریم قاسم لەساڵی ١٩٥٧پێك هات ٢

---

[1] رشيد، د.عبدالوهاب حميد، العراق المعاصر، دار المدى للثقافة والنشر، سنة٢٠٠٢، ص١٢٩.

[2] حركة الضباط الاحرار، خلافاتهم الفكرية هدمت اسس ثورة ١٤تموز. جلال حسين محمد، جريدة الاتحاد العدد٤١٤ بتأريخ ٢٠٠٢/٣/٣٠.

بەدەر لەو تەشکیلەی کە رائد رفعت هێنابوویە ئاراوە لە ساڵی ١٩٥٢دا، (فریق نجیب الربیعی )کە یەکێك بوو لەو مامۆستایانەی وانەی‌لەکۆلیژی ئەرکانی دەوتەوە ، زۆرجار لەگەڵ قوتابیە لاوەکانیدا پێك دەگەیشتن لە کۆلیژی ئەرکان ، رەخنەیان لەدەسەلاتی دەوڵەت دەگرت و داوای کارێکی شۆرشگێڕیان دەکرد، ، بەبزواندن و ئامازەی ربیعی هەندێ لەو ئەفسەرە لاوانە وەك قاسم و عارف و محی‌الدین حامد و عبدالوهاب گەیشتنە بڕیاری یەکلاکەرەوەو ریکخراوی جۆراوجۆر لێرەو لەوێ دروست بوون ٣

ئەمەش بێئومێد بوونی نەوەی نوێ بوو لەوەی سیاسیەکان بتوانن بگەنە دەسەلات ، سەرەڕای چەندین هەوڵیان لەڕێگەی هەستان بەڕاپەڕینی جەماوەری ، پاڵی نا بەئەفسەرە تازە پێگەیشتوەکانەوە تاهەوڵی روخانی حوکمی وولات بدەن بەهێزی چەك، هەر پاش ئەوەش لەو کۆت و زنجیرانە رزگاریان بوو کە ژیانی سەربازی بەسەریاندا سەپاندبووی ، لەژێرەوە کەوتنە کارکردن لەگەڵ(ئەفسەرانی ئازادیخوان)ئەوانەی کە خۆیان رزگار کردبوو لە سەربازێتی و کۆت و پێوەندەکانی ، ئەو دەزگایەی کەهەستیان

---

[٣] لەیادەوەرییەکانیدا ، فوئاد عارف کەئەفسەرێکی کوردبووە و پەیوەندی بەرێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخوازەوە نەبووە ، بەڵام پەیوەندی لەگەڵ ئەندامەکانیدا خۆشبووە. لەم بارەیەوە دەڵێت: لەلایەن قاسم و عارف و چەند ئەفسەرێکی ترەوە تەکلیف کرام تا قسە لەگەڵ (نجیب الربیعی) دا بکەم، بۆئەوەی پەیوەندی بکات بە ئەفسەرانی ئازادیخوازەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی پەیوەندی پتەوم هەبوو لەگەڵیدا هەربۆیە لە بەعقوبە لەماڵەکەی خۆیدا کەوتمە گفتوگۆ لەگەڵیدا و مەبەستەکەم تێگەیاند کەبۆچی سەردانیم کردوە،ئەویش لەوەڵامدا ووتی: ئەبوفەرهاد منیش هەمان بۆچوونم هەیە لەسەر بارەکە و پێی رازی نیم، بەڵام بەصەراحەت بڕوام بەوانە نیە کەدەیانەوێت شۆڕش بکەن، گەرسێ‌کەس لەوانە کۆببنەوە ئەوە بزانە یەکێکیان لەلایەن وەصی و وەزارەتەوە دانراوە، لەبەر ئەوە هەمور هەولێك لەم بوارەدا شکست دێنێ، لەدوایدا دەڵێت: برام ئەبو فەرهاد تۆکەسێکی خۆشەویست و بەوەفایت، لەبەر ئەوە تکا دەکەم ئاگات لەخۆت بێت ، ئەم مەسەلەش لەیاد بکە و وابزانە هەرگیز قسەت لەگەڵ نەکردووم، پاشان فواد عارف دەڵێت کاتێك گەرامەوە بۆ لای‌قاسم و مەسەلەکەم بۆگێڕایەوە، ووتی گەر ئەوە رای رەبیعی بێت کەواتە دەبێت خۆمان بە کارەکە هەستین.. (مذکرات فؤاد عارف، ل(١٧١,١٧٤)

نـەدەكرد پەیوەسـت بـن بـەدەربڕینی خۆشەویسـتی بـۆی لەگـەڵ ئـەوەی ناونرابووبـە (ئەفسـەرانی ئـازادیخواز )و ئـەو ناوەیـان لەدوایـدا بەخۆیانـەوە لكانـد ، چـونكە ئـەو ئەفسـەرە لاوانـە سـەرەتا ئـەو ناوەیـان بەسـەر خۆیانـدا نەبڕی بوو.[1]

## هۆكارەكانی دروست بوونی ئەفسەرانی ئازادیخواز

دەسەلاَتی سەربازی لەعێراقدا بەردەوام ڕۆڵی بەرچاویان بینیوە لە بواری سیاسیدا ،بـەلاَم ئێمـە لێـرەدا ئامـاژە دەكـەین بـەو هۆكارانـەی كـە پـاڵی نـا بەئەفسەرانی ئازادیخوازەوە تاڕێكخستنەكانیان پێك بهێنن كە پاش جـەنگی جیهانی دووەم دەستیان پیٚكردبوو ، لێـرەدا دەتـوانین گـرنگتری هۆكارەكـان كۆ بكەینەوە لەم چەند خاڵەدا :-

١-هـەر لەسـەرەتای دامەزرانـدنی سـوپای عێراقیـەوە ، ئەفسـەرەكانی وا هەسـتیان دەكـرد كەهۆشـیارترین ڕەگـەزی پێكهێنـەری وولاَتـن ، نـەزانین و نەخۆشیو بێبـەش بـوون زاڵبووبووبەسەریاندا ، لەهـەمان كاتـدا دەوڵـەت بـەكاری دەهێنـان بۆدژایـەتی كردنـی هێـزی گـەل ، ئـەوان واهەسـتیان دەكردزۆری تریان پیٚدەكرێت ، بەم جـۆرەش هەسـت كردنیـان بـەئازارەكانی گەل و زانینی توانستی خۆیان لەژێر دەستیان دایە، پاڵی پێوە نان ئاوێتـە بن بە بزووتنەوەی نیشتمانی .

٢-شكسـتی حكومەتـە یـەك لـەدوا یەكـەكانی پـێش ١٤ تمـوزی١٩٥٨ ، لەهێنانەدی ئامانجە نیشتمانیو نەتەوەییەكان كەخواستی گەلی عیراق بـوون

[1] خدوری، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص٢٨.

٣-شكستی بزووتنەوەی مایسی ١٩٤١کەژمارەیەك ئەفسەری نەتەوەی پێی هەستان و بەوئاکامە خراپەی شکایەوە بەسەر ئەفسەرانداو پاشان لە سێدارەدانی باشترینی ئەو ئەفسەرانەو بەردەوام بوونی چەوسانەوەی گەلانی عیراق .

٤-جەنگی فەڵەستین ١٩٤٨وکۆتای هاتنی بەشکستی عەرەبەکان ، ئەمەش وای کرد ئەفسەرە لاوەکان هەست بەشکستی خۆیان بکەن لە جەنگی فەلەستین دا لەکاتێکدا هۆکارەکەی سیاسی بوو زیاتر لەوەی هۆکاری سەربازی بوو بێت.

٥-سەرکەوتنی بزووتنەوەی ئەفسەرانی ئازادیخوازی میسر ١٩٥٢/٧/٢٣ و روخانی دەسەلاّتی پاشایەتی لەو ولاّتەدا .

٦-سەر کوت کردنی ڕاپەڕینە جەماوەرییەکان لەلایەن سوپاوە بەتایبەت ڕاپەڕینی ١٩٥٢، کەتێیدا سوپا دابەزییە شەقامەکان بۆ سەرکوتی کردنی ڕاپەرین و پێکهێنانی وەزارەتی سەرۆك ئەرکانی سوپا (نور الدین محمود) ئەمەش کاریگەری زۆری کردە سەر دەرونی ئەفسەرە لاوەکان کە کاریان بۆ روخانی حوکمی گەندەڵی پاشایەتی دەکرد.

٧-ئەو ئەفسەرە لاوانە کاریگەر بوون بە فیکرەی سیاسی شۆرشگێری ، پێش چوونە نێو کۆلیژی سەربازی زانستەکانیان لە قوتابخانەو دواناوەندی‌یەکاندا وەردەگرت کەلەوکاتە زەمەنی بالاّبوونی کێرڤی نیشتمانی‌ونەتەوەیی بوو لەعێراقدا لەسالاّنی سی‌یەکاندا.

٨-زۆربەی ئەو ئەفسەرە لاوانە لە چینە هەژارو زەحمەتکێش بوون ، ئەمەش وای کردبوو لە چاکسازی وڵات پەلە بکەن.

٩-سەرهەڵدانی هەندێ پارتی خاوەن ئایدۆلۆژی شۆڕشگێری وەك حزبی شیوعی وپارتی بەعس .

١٠-زیاد بوونی ڕێژەی ڕاپەرینە جەماوەرییەکان لە نێوان کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم شۆرشی ١٩٥٨لە هەمان کاتدا ، زیاتر بوونی مانگرتنی کرێکاری .

١١-نەبوونی توانای پارتە سیاسیەکان لەو کاتەدا لەسەر هێنانە ئاراوەی شۆڕشێکی جەماوەری.[١]

---

[١] الزبيدي، ليث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانية ، بغداد ١٩٨١ص١٠٣,١٠٤,١٠٥,١٠٦,١٠٧

## ڕێکخستنی سەرکردایەتی بزوتنەوەی ئەفسەرانی ئازادیخواز لەسەروبەندی ڕودانی شۆڕشی ١٤ی تەموزدا

# ئەندامانی لیژنەی باڵا[2]

| ز | ناو | ساڵ و شوێنی لەدایك بوون | ساڵی پەیوەندی | پلەی سەربازی | پۆستی سەربازی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | عەبدولکەریم قاسم/سەرۆك | بغداد١٩١٤ | ١٩٥٧ | زعيم ركن | ف. ليوای ١٩ |
| ٢ | محی الدين عبدالحميد/ج.یەکەمیسەرۆك | ١٩١٤ | ١٩٥٦ | زعيم ركن | سەرۆك ئەرکان تیپی زرێپۆش |
| ٣ | ناجی تالب/ج.دوەمی سەرۆك | ١٩١٧ناصريه | ١٩٥٦ | زعيم ركن | ف.ليوا١٥ |
| ٤ | عبدالوهاب امين | ١٩١٨بغداد | ١٩٥٦ | عقيد ركن | ف.ليوای پيادەی ١٥ |
| ٥ | محسين حسين الحبيب | بغداد١٩١٦ | ١٩٥٦ | عقيد ركن | ف.فەوجیتۆپی قورسی( شطرة ) |
| ٦ | عەبدولسەلام عارف | بغداد١٩٢١ | ١٩٥٧ | عقيد ركن | ف.کەتیبەی٣ ليوای پيادەی٢٠ |
| ٧ | تاهر یەحیا | بغداد١٩١٤ | ١٩٥٦ | عقيد متقاعد | |
| ٨ | عەبدولرەحمان عارف | بغداد ١٩١٦ | ١٩٥٧ | عقيد | ف.فەوجی فیصل ی زرێپۆش ليوای٦ |
| ٩ | عەبدولکەریم فەرحان | بغداد١٩١٥ | ١٩٥٦ | مقدم ركن | ف.یەکەی زرێپۆش |
| ١٠ | عەبدولوهاب شەواف | بغداد١٩١٦ | ١٩٥٨ | مقدم ركن | بەڕێوەبەری تیپی مەشق کردن |
| ١١ | وەصفی تاهر | بغداد١٩١٨ | ١٩٥٦ | مقدم | یارمەتیدەری مەیدانی نوری سەعید |
| ١٢ | صبيح علی غالب | بغداد١٩٢٠ | ١٩٥٦ | رئيس اول ركن | ئەفسەری کارای تیپی دووەم |
| ١٣ | محمد سەبع | بغداد١٩١٦ | ١٩٥٦ | رئيس اول جوی متقاعد | |
| ١٤ | رجب عبدالمجيد/رازگری نهێنی | ١٩٢١ | | زعيم ركن | ف.ئەندازیاری |

[2] رشيد. د. عبدالوهاب حميد، العراق المعاصر. دار المدى للثقافة والنشر،٢٠٠٢، ص١٣٤,١٣٥.

## پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ئەفسەرانی ئازادیخواز

ئەو ئەفسەرانەی خۆیان ئالاندبوو بە کاروباری سیاسیەوە سەربە نەوەی نوێ بوون ، پێش ئەوەی بچنە قوتابخانە سەربازییەکانەوە ، لە قوتابخانەی سەرەتایی‌و دوا ناوەندی‌دا خوێند بوویان ، لەو کاتەشدا ئەم جۆرە خوێندنە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاراستەی وەرگرتنی بیروباوەڕی حزبی و جۆرێک لە ئاراستە نەتەوەپەرستی توندرەوانەی دەکردن، ئەم جۆرە فێربوونەش لە قوتابخانەی جەنگی‌دا بەردەوام بوو چونکە مامۆستاکانی هەڵگری بیروباوەری توندرەوانەبوون ، بەم شێوەیەش ئەفسەرە لاوەکان زۆرتر حەزیان بەلای کاری سیاسی‌دا هەبوو وەك لەئەفسەرەکانی پێش خۆیان ، بەدەر لەم حاڵەتەش زۆربەی ئەم ئەفسەرە تازانە سەر بە چینە هەژارەکانی کۆمەڵ بوون ، ئەوانەش پلەی باڵای سەربازیان لە دەستدا بوو سەر بەچینە دەوڵەمەندەکان بوون .[1]

لیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخواز لە ١٤ئەفسەر پێك دەهاتن ، ئەمانەش زیاتر لەڕووی هەژارییەوە مامناوەندی‌و باری داراییان نزیك بوو لە یەکەوە ، هیچ یەك لەمانە ماڵی نیشتەجێبوونی خۆیان نەبوو، جگە لە عقیدرکن ناجی‌تالب نەبێت کە باوکی خاوەنی زەوی‌و زار بووە و بۆچەند ساڵێکیش باوکی ئەندام پەرلەمان بووە.[2]

گەر بەوردی بڕوانینە لیژنەی باڵا لە ڕووی باری، خێزانی ، رۆشنبیری ، پایەی کۆمەڵایەتی ، ئەوا دەتوانین فیکرەیەکی دیاروئاشکرامان دەست بکەوێت لەسەر کیانی کۆمەڵایەتی و بیرو باوەڕی ئەفسەرانی ئازادیخواز..

---

[1] خدوری، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص٢٩,٣٠

[2] کەناڵی ئاسمانی ئەبوزەبی بەرنامەی بين الزمنين ئامادەو پێشکەش کردنی احمد مهنا

١-قاسم له سالّی ١٩١٤ له دایك بووبوو، تاكه كەسیشیان بوو پێش شۆرش كه روتبەی (زعیم) ی هەبێت ، ئەوانی دیكه لەنێوان هەردوو جەنگی جیهانی یەكەم و دووەم دا له دایك بووبوون و لەپلەی سەربازیش دا له قاسم خوارتر بوون به روتبەی( عقیدومقدم)، جگه له محمدالسبع نەبێت كه رائد بوو له چەكی ئاسمانیدا .

٢-هەموویان بانگەشەی ئەوەیان دەكرد كه عەرەبی ڕەسەنن و هیچ جۆره ڕەگەزێكی تریان تیدا نی‌یه ، ئەمەش وای كردووه كه هاوڕابن لەسەر بانگەشەی نەتەوایەتی عەرەبی (هەرچەند هەندێك ڕا هەیه لەسەر ئەوەی كه (محی‌الدین حامد)به ڕەگەز كورد بووه [٣] جگه له (عبدالسلام عارف) كه بانگەشەی یەكێتی عەرەبی كردووه ، قاسم و محی‌الدین بانگەشەی نەتەوایەتی سەربەخۆخوازیان كردووه..

٣-هەموویان سوننی بوون جگه له( ناجی تالب) و( محسن حسین الحبیب) نەبێت كەشیعه بوون و قاسمیش دایكی شیعه بوو هەرچەند قاسم هیچ كات لەژیانیدا شتێكی نەكردووه بەلای ئەوەدا بشكێتەوه كه شیعه بووه

٤-هەموویان له بغداد له دایك بوون جگه له سێ‌كەسیان نەبێت ناجی تالب و فرحان و تاهر یحیی

٥-هەمووشیان جگه له ناجی تالب كه باوكی خاوەن زەوی‌و زار بووه ، له خێزانه هەژارەكان بوون .

---

[٣] ئەم زانیارییانەم لەبەرێز عەقیدی خانەنشین (عباس قادر علی) وه وەرگرتووه، كەتێدا ئاماژەی بەوه دەكات كه (١٠) ئەفسەری كورد له ریزی ڕێكخراوەكەدا هەبوون، لەنێویشیاندا (عقید الركن محی الدین عبدالحمید) كەبەرەگەز كوردبووه، هەرچەند د. مجید خەدوری رەتی ئەوه دەكاتەوه كه هیچ جۆره ئەفسەرێكی كوردی تیابووبێت، لەكتێبی (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) ی لیپ عبدالحسن الزبیدی دائاماژه بەوه دەدات كه عقید الركن محی الدین عبدالحمید بەرەگەز كوردبووە و مقدم ركن صبیح علی غالب بەرەگەز توركمان بووه.

٦-هەمووشیان لە قوتابخانەی حکومیدا خوێندوویانە ،یان لەبغداد یان شارەکانی تر و پاشان هەمووشیان پەیوەندیان کردووە بە کۆلیژی سەربازییەوە،وبەپلەی مولازم دووەم دەرچوون.

## پێکهاتەی سیاسی ئەفسەرانی ئازادیخواز

| ز | پلەی سەربازی وناوی سیانی | ئینتیمای سیاسی |
|---|---|---|
| ١ | الزعيم الركن عبدالكريم قاسم | سیاسی سەربەخۆ، مەیلی بەلای بزوتنەوەی نیشتمانی دیموکراتی |
| ٢ | العقيد الركن عبدالسلام عارف | = = = = نەتەوەیی‌و ئیسلامیی |
| ٣ | العقيد الركن محى الدين عبدالحميد | = = - - بزوتنەوەی نیشتمانی دیموکراتی |
| ٤ | المقدم الركن صبيح على غالب | = = = بزوتنەوەی نیشتمانی دیموکراتی |
| ٥ | العقيد الركن عبدالوهاب الامين | = = = بزوتنەوەی نیشتمانی دیموکراتی |
| ٦ | العقيد الركن ناجى طالب | = = = = نەتەوەیی عەرەبیدا |
| ٧ | العقيد المهندس رجب عبد المجيد | = = = = فیکرەی نەتەوەیدا |
| ٨ | العقيد الركن محسن حسين الحبيب | = = = = فیکرەی نەتەوەیدا |
| ٩ | المقدم الركن عبدالكريم فرحان | = = = = نەتەوەیی عەرەبیدا |
| ١٠ | رائد الطيار محمد السبع | = = = = نەتەوەیی عەرەبیدا |
| ١١ | المقدم رفعت الحاج سرى | = = = = نەتەوەیی‌و ئیسلامیی |
| ١٢ | العقيد طاهر يحيى | = = = = نەتەوەیی عەرەبیدا |
| ١٣ | العقيد عبدارحمن عارف | = = = = نەتەوەیی عەرەبیدا |
| ١٤ | العقيد عبدالوهاب الشواف | = = = فیکرەی سیاسی چەپدا هەبووە |
| ١٥ | المقدم وصفى طاهر | = = = = سیاسی چەپدا هەبووە[1] |

[1] الزبيدي، ليث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانية ، بغداد ١٩٨١ص١٥٢,١٥١.

## سەرەتاكانی پێكهاتن

كۆمەڵـەی رفعت الحـاج سـری سـەرەتای سـەرهەڵدانیان دەگەڕێتـەوەبۆ ئـەیلول (١٩٥٢) كـە ئـەم كۆمەڵەیـە زۆرتـرین ئـەزموونی ڕێكخستنیان هـەبوو جگە لە ئەندامەكانی دەستەیەك لە ئەفسەرە لاوە چالاكەكانی لـە خـۆ دەگـرت ،لەوكاتە (سری) پۆستێكی ئەندازیاری هەبوو لەیەكەیەكی ئەندازیاریدا

٣-گواستنەوەی سەرکردایەتی ڕێکخراوەکە بۆدەست کەسانی تر.

٤-بەدەر لەو خاڵانەی پێشوو ئەم کارە وای کرد کە ئەفسەرانی ئازادیخواز زۆر بە وریایی مامەڵە لەگەڵ ئەندامەکاندا بکەن بە تایبەت وەرگرتنیان لە ڕووی ئەمنییەوە ..بەم جۆرەش( رفعت الحاج سری )پەیوەندی مایەوە لەگەل ئەفسەرانی ئازادیخواز ، بەڵام نەك وەك پێشەوا هەتا تەنانەت پاش گەڕانەوەی بۆ بغداد ساڵی ١٩٥٧وخانە نشین کرانی .[١]

پاش پەلاماری سێقۆڵی سەر میصر ساڵی ١٩٥٦ حەماسەی ئەفسەرانی ئازادیخواز بەرەو زیاد بوون ڕۆشت بۆ رزگار بوون لە دەسەڵاتی پاشایەتیبەزوترین کات، ولەدەست نەدانی هەلی کارکردن لەم بوارەدا[٢]، لەو کاتەشدا کەنیگەرانی باڵی کێشابوو بە سەریاندا ، دەستیان دایە کۆکردنەوەی ڕیزەکانیان و گەڕانەوەی جووڵە بۆ چالاکیە شۆڕشگێڕەکانیان ، هەربۆیە لێرە و لەوێ خۆیان ڕێکخست لەیەکەی بچوکدا، هەر یەك لەم یەکانەش لەدوایدا بوونە ناوکی پێکهێنەری مەرکەزی ڕێکخراوەکە و ناسرابوو بە (ڕێکخراوی بغداد) بە سەرکردایەتی محی‌الدین عبدالحمید و رجب عبدالمجیدیش ئیدارەی کۆبوونەوەکانی دەکرد.[٣]

هەروەها ڕێکخراوێکی تر بەسەرکردایەتی عبدالکریم قاسم دروست بوو ناسراو بە (ریکخراوی منصور) [٤]، ئەوە بوو لەدوایدا لەگەڵ ریکخراوی

---

[١] خدوری، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص ٣٦,٣٥,٣٤.

[٢] الزبيدي، ليث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانية ، بغداد ١٩٨١ص١٠٩.

[٣] ئەندامەکانیش جگە لە محی الدین عبدالحمید و رجب عبدالمجید بریتی بوون لە (ناجی طالب، محسن حسین الحبیب، عبدالکریم فرحان، صبیح علی غالب، وصفی طاهر، محمد السبع، عبدالوهاب الامین ) ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ فی العراق ص ١٠٩

[٤] ئەندامەکانی عارف، عقید طاهر یحیی، احمد صالح العبدی. ( ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ فی العراق ص ١٠٩.)

مەرکەزی بغداد یەکیان گرت ..جگە لەمانە چەند شانەیەکی تریش هەبوون لەوانە

*شانەی دیوانیە کە زعیم اسماعیل علی پێشەوایەتی دەکرد .

*شانەی ناصریە بەسەرکردایەتی عقید شاکر محمودالشکری [٥] ئەم شانەیە دووربوون لە چالاکی لیژنەی بالای ئەفسەرانی ئازادیخواز ، بانگەشەی یەکێتی عەرەبیان دەکرد. [٦]

* شانەی موصل بەپێشەوایەتی عقید محمود عزیز [٧]

پێدەچێت ڕێکخراوی بغداد لە هەندێك شانەوە دروست بوو بێ کەلەو کاتەدا لە بغداد هەبووە و سەربەخۆبوون لەشانەکەی رفعت الحاج سری یان پاش لێك هەڵوەشانەوەی ئەو شانەیە هاتبنە ئاراوە ، کەدەتوانین بەسەر (٤)شانەدا دابەشی بکەین

١-شانەی یەکەم بە پێشەوایەتی محی‌الدین عبدالحمید کە ریکخراوێك بوون خاوەنی فیکرەی رزگاریخوازی و لەژێر دەسەلاتی پارتی نیشتمانی دیموکراتی‌دا بوون

٢-شانەی دووەم بەپێشەوایەتی عبدالوهاب امین ئەندامەکانی بانگەشەی یەکێتی عەرەبی کشتگیریان دەکرد ، لەگەڵ ئەوەی عبدالوهاب خۆی زۆر حەماسەی بۆئەم مەسەلەیە نەبوو .

---

[٥] خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر - قم ١٩٩٧ ، ص٣٧.

[٦] الزبیدي، لیث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانیة ، بغداد ١٩٨١ص١١١.

[٧] ئەم شانەیە ناوی ئەفسەرانی شۆرشگێڕیان لە خۆیان نابوو لە ئەندامەکانی جگە لە محمود عزیز، رائد مجید الچلبی، رائد علی خفاف، نقیب حازم حسن، نقیب زەکەریا تەها، نقیب هاشم دبونی، نقیب سالم سلو، ملازم اول کامل اسماعیل، ئەم ڕێکخستنەش پێش شۆڕشی ١٤ی تەموز پەیوەندیان کرد بە لیژنەی بالای ئەفسەرانی ئازادیخوازەوە ، لەبەر ئەوەی هاوبیرورابوون لەگەڵ لیژنەی بالادا.. ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق ص١١١.

٣-شانەی سێیەم بە پێشەوایەتی ناجی تالب و رجب عبد المجيد بانگەشەی یەکێتی عەرەبی گشتگیریان دەکرد

٤-شانەی چوارەم بەسەرکردەی مستەفا تاهیر کە زیاترمەیلی شیوعیان هەبوو لە هەندێ ڕەگەزی شیوعی پێك دەهاتن .[١]

سەبارەت بە شانەکەی عبدالكريم قاسم (ڕێکخراوی منصور )هەر چەند قسەو باس لەسەر ئەوە هەیە کە ئایا پێش چوونی قاسم بۆ ئوردون دروست بوون یان دوای ئەوە ، بەهەر حاڵ بەرەسمی دوای پێکەوە تێکەڵکردنی هەر دوو ڕێکخراوەکان (ڕێکخراوی مەرکەزی بەغداد، ڕێکخراوی منصور) لەم بوارەشدا ناجی تالب نێوەند بووە و هەوڵی یەکخستنی داوە ، هەر چەند لە سەرەتاوە وەرگرتنی عبدالسلام عارف لە لیژنەی باڵا لای زۆرێك لە ئەندامانی لیژنەی ڕەت کراوەتەوە بەهۆی هەڵچونی عارف و متمانە نەبوون پێی ، بەڵام قاسم بەرپرسیارێتی عارف دەخاتە گەردنی خۆیەوە ، لە دوایدا وەردەگیرێت لە لیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخواز لەمانگی ١٩٥٧/٦ولە ١٩٥٨ و مانگی کانوونی دووەم عبدالرحمن عارف بێدوودڵی وەردەگیرێت لە لیژنەی باڵاو بەم جۆرەش لیژنەی باڵا دەبنە (١٤) کەس[٢] پێش چوونە ناو لیژنەی مەرکەزییەوە محی الدين عبدالحميد سەرۆکایەتی کۆبوونەوەکانی دەکرد ،بەهۆی ئەوەی بەرزترین پلەی سەربازی هەبوو بەڵام پاش هاتنی قاسم ، ئەو سەرۆکایەتی کردوو بووبە پێشەوای فەخری لەبەر ئەوەی تاکە زعیم بوولەنێوانیاندا. .رجب عبدالمجید بەسیفەتی ئەوەی کە ئەمینداری گشتی بووە ،کارەکانی ڕێك دەخست لەنێوان ئەفسەرەکاندا.[٣]

---

[١] خدوری، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص٣٨,٣٧.

[٢] د. خدوری بڕوای وایە ١٤ ئەندام بوون،( الزبيدی)یش بڕوای وایە ١٥ ئەندام بوون..

[٣] خدوری، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص٤٠,٣٩.

## سەرکردایەتی ئەفسەرانی ئازادیخواز

سەبارەت بە هەڵبژاردنی سەرکردایەتی مەرکەزی بۆ ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخواز، لە زۆر سەرچاوەدا باسی لەسەر کراوە، ئەوەی لێرەدا دەیخەینە پێش چاوی خوێنەران بریتی‌یە لەوەی کە صبیح علی غالب لە کتێبی (قصة ثورة ١٤تموز والضباط الحرار)بڵاوی کردۆتەوە کە خۆی یەکێك بوە لە ئەفسەرانی لیژنەی بالاو لەم بارەیەوە دەڵێت"لەیەکێك لە کۆبونەوەکاندا مەسەلەی سەرکردایەتی کردنی ئەفسەرانی ئازادیخواز خرایە بەر باس و لێکۆڵینەوەو لەم بوارەشدا دوو پێشنیار هەبوو، یەکەمیان بریتی بوو لە سەرکردایەتی‌یەکی بە کۆمەڵ و دووەمیشیان بریتی بوو لە سەرکردایەتی‌یەکی سەرۆکایەتی ، و پاش گفتو گۆی هەردوو پێشنیارەکە ڕەزامەندی دەربڕا لەسەر پێکهێنانی سەرکردایەتی‌یەکی سەرۆکایەتی بۆ ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخواز بە شێوەیەکی مەرکەزی و لیژنەکە سێ کەسیان پالاوت بۆ سەرۆکایەتی کردن کەبریتی بوون لە

زعیم روکن عەبدولکەریم قاسم

عەقید روکن محی الدین عەبدولحەمید

عەقید روکن ناجی تالب

پاش ئەوەی دەنگدان بەڕێوەچوو لەسەر هەرسێ پاڵێوراوەکە ، لە ئەنجامدا (زعیم روکن عەبدولکەریم قاسم) هەڵبژێررا وەك سەرۆکی لیژنەی بالای ئەفسەرانی ئازادیخوا بە وپێودانگەی کە کۆنترین ئەفسەری ناو لیژنەکەبوو، هەروەها لەبەر ئەوەی کەپلەی سەربازیشی لەهەموولا بەرزتر بوو، پاشان هەریەك لە محی‌الدین عبدالحمید و ناجی تالب کران بە جێگری

قاسم لەسەرۆکایەتی داو عقیدی ئەندازیاریش (رجب عبد المجید) کرا بە سکرتێری لیژنەی بالا، لەم بەرەنجامەشەوە چەند لیژنەیەك هەڵبژێران ..

لیژنەی پلان دانان

عەقید روکن محی‌الدین عبد الحمید

عەقید روکن ناجی تالب

عەقید روکن عبد الوهاب الامین

عەقید روکن محسن حسین الحبیب

لیژنەی پڕوپاگەندەو رێکخستن

موقەدەم روکن عبدالکریم فرحان

موقەدەم روکن صبیح علی غالب

عەقیدی ئەندازیار رجب عبدالمجید

لیژنەی کۆکردنەوەی زانیارییەکان

رئیس ئەوەل تەییار المتقاعد محمد سبع

موقەدەم رفعت الحاج سری

موقەدەم وصفی تاهر

لیژنەی دارایی

عەقید روکن محی‌الدین عبد الحمید

عەقید روکن محسن حسین الحبیب

ئەم لیژنانە بەپێی پسپۆرییان کۆدەبونەوە و پاشان پێشنیارەکانیان دەخستە بەردەست لیژنەی بالا تا گفتوگۆی لەسەر بکرێت، بێگومان ئەم شێوازەش یارمەتی دەری زیاتر بە نهێنی هێشتنەوەی بزوتنەوەکە بوو لەگەڵ پارێزگاری کردن لەسەر نهێنی کۆبونەوەکان..[1]

---

[1] غالب صبیح علی قصة ثورة ١٤ تموز والضباط الاحرار، دار الجاحظ للطباعة والنشر، بغداد ط١ ١٩٦٨ ص٤٦, ٤٧, ٤٨.

## ئامانج و بنەماکانی ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخواز

واپێدەچێت ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخواز هیچ بنەماو ڕێسایەکی دیاری کراویان نەبوبێت پێش پێکهاتنی لیژنەی بالا ، هەروەك چۆن پلانێکی پێش وەختیان نەبووە بۆ ئەنجامدانی شۆڕش چونکە هەریەك لەو کۆمەلأنە بیرو ڕای خۆیان هەبووە ، ئەمەش وای کردووە بنەماو ئامانجەکان وەك پێویست نەڕسکیێ و گشت لا کۆنەبن لەسەری، گەر بمانەوێت ئاگاداری ئامانجە سەرەکیەکانی ئەفسەرانی ئازادیخواز بین ، ئەوا دەبێت بگەڕێتەوە بۆ یاداشت ونوسراوەکانیان کەلە کۆبونەوە نهێنیەکانیانەوە هەڵیانهێنجابوو ، یان دان پیانانە زارەکیەکانیان کە ئەمانەش وەك پێویست لێك نزیك نەبوون و جیاوازیان هەبووە لەسەری ، لەگەڵ ئەوەی چاوپێکەوتنیش لەگەڵیاندا ئەنجام دراوە و لەم نیوەشدا زۆر شتی دژیەك هەبووە لە بیروڕاکاندا[٢] لەبەر ئەوە پێدەچێت نەتوانین بەتەواوی ئەو ئامانج و بنەمایانە کۆبکەینەوە ، لێرەشدا وەك نوسینی هاوبەش ئاماژە دەدەم بە (٢٠)ئامانج کە دەوترێت هەمووڵا هاوڕابون لەسەری و دەکرێت قسەی تریش هەڵبگرێت ئەو (٢٠)ئامانجەش بریتین لە :

١-هەڵوەشانەوەی ڕژیمی پاشایەتی و دامەزراندنی ڕژێمی کۆماری.

٢-دەسەڵات گرتن بەسەر دەرەبەگایەتی و دابەشکردنی زەوی و زار بەسەر جوتیاراندا .

٣-دەست خستنەوەی مافە نەوتی یەکانی عێراق و بەرتەسك کردنەوەی سنوری کار کردنی کۆمپانیا نەوتیەکانی بێگانەو دامەزراندنی پیشەسازی نەوتی.

[٢] خدوري، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص ٤١,٤٠.

٤-دەرچوون لەناوچەی (ئسترلینی) و رزگار کردنی ئابووری عێراق لە پاشکۆیەتی بەریتانیا
٥-جێبەجێکردنی یەکێتی نیشتمانی و هێنانە کایەی چارەسەرێکی عادیلانە بۆ کێشەی کوردی
٦-ئازاد کردنی زیندانە سیاسیەکان بەتەواوی و فەراهەم هێنانی ئازادی گشتی
٧-کەم کردنەوەی جیاوازی نێوان چینەکان و کردنەوەی بوار لە بەردەم تەواوی تواناو لێهاتنەکان و دابین کردنی دادگەری کۆمەڵایەتی.
٨- دەرچوونی لەیەکێتی هاشمی (یەکێتی عەرەبی نێوان عێراق-ئوردون).
٩-لێك نزیك بوونەوەی پتەو لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوو و وولاتانی تری عەرەبی ئازادیخواز ، هەروەها پشتگیری وولاتانی عەرەبی کە هەوڵی سەربەخۆیی دەدەن.
١٠-پشتگیری گەلی فەلەستین بە هەموو تواناکانی بەردەست بۆ گەڕانەوەی زەوی‌و ئازادی.
١١-یەکێتی عەرەبی ئامانجێکی چارە نوسسازە ، پێویستە هەوڵی هێنانە کایەی بدرێت ،مەگەر تەنها هێندە نەبێت عێراق روبەروی داگیرکاری دەرەکی بێتەوە ، بۆگەڕانەوەی ڕژێمی پاشایەتی لەو کاتەدا داوای یەکێتی دەست بەجێی نێوان عێراق و کۆماری عەرەبی یەکگرتوودەکرێت..
١٢- دەرچوون لەپەیمانی بەغداد.
١٣-سڕینەوەی دەسەڵاتی بەریتانی بەسەر پێگە سەربازییەکانی لەناو عێراق و خستنە ژێر دەسەڵاتی تەواوی سوپای عێراقیەوە.
١٤-گرتنە پێشی سیاسەتی بێلایەنی ایجابی و لایەنگری نەکردن .

١٥-دامەزراندنی پەیوەندی دبلۆماسی تەواو لەگەڵ وولاتانی سۆسیالیستی.

١٦-سیاسەتی دەرەکی عێراق و پەیوەندییەکانی لەسەر بنەمای ڕێزگرتنی بەرامبەر و بەرژەوەندی هاوبەش دادەمەزرێت .

١٧-پێکهێنانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش لەئەندامی لیژنەی بالاّ ، ئەم ئەنجومەنە هەڵدەستێ بەئەرکی دەسەلاّتی یاسا دانان هەتا کاتی ئەنجامدانی هەڵبژاردنی پەرلەمانی .

١٨-پێکهێنانی حکومەتێکی مەدەنی لە سیاسیە ناسراوەکان بە توانا و لێهاتن و هەڵوێستی نیشتمانیان ، گفتو گۆ لەسەر ئەوە هەبووە کە ئایا بەشداری دەکەن لەم حکومەتەدا ، یان تەنها مەدەنیەکان تیدا بەشدار دەبن ، هەرچەندە بیروراکان جیاواز بوون ، بەلاّم ئاراستەکە زیاتر لەسەر پێکهێنانی بووە و زۆربەشی لە مەدەنیەکان بێت

١٩-دیاری کردنی ماوەی گواستنەوە و پاش بەرقەرارکردنی دەستوری هەمیشەیی و ئەنجامدانی هەڵبژاردنی پەرلەمانی بۆ هەلبژاردنی پەرلەمانێکی نوێ و لەسەر ئەم بنەمایەی حکومەتێکی نوێ پێك بهێنرێت.

٢٠-سەبارەت بەسەرۆك کۆماری ، قسە زۆر لەبارەیەوە نەکرا ، چونکە لەو کاتەدا وویستویانە دووربکەونەوە لە دیاری کردنی کەسەکانی ، کەئەمەش حەساسیەت دەوروژێنێت ، بەتایبەت لەوکاتەدا کەلە قۆناغی ئامادەگی و خۆسازدان دا بوون بۆ چەسپاندنی پلانی جێبەجێکردنی شۆڕش.[1]

[1] العلوى، حسن، عبدالكريم قاسم رؤية بعد العشرين، منشورات دار الزوراء، لندن، ١٩٨٣ص١٢٨,١٢٩,١٣٠.

## بنەماو پەیڕەوی کاری بزوتنەوەی ئەفسەرانی ئازادیخواز

دەزگای هەواڵگری بەریتانیا و دەزگای هەواڵگری ناوەندی ئەمریکا دانیان بەوەدا نابوو کە شۆڕشی تەمموزی ١٩٥٨ کتوپڕبووە، هیچ شتێکی ئەوتۆیان لەبارەوە نەزانیوە جگە لە ساتی راگەیاندنەکەی لە سپێدەی ١٤ی تەممووزدا، هۆکاری سەرەکیش لەم بوارەدا دەگەڕێتەوە بۆ وردەکاری کارەکە لە جموجوڵدا، لەهەرە گرنگترین ئەو بنەمایانەی کە لیژنەی باڵا بڕیاری لەسەر دابوو بۆ کار پێکردن بریتی بوون لە:

١-لەکۆبونەوەکاندا نوسین بە هەموو شێوەیەك لە شێوەکانی قەدەغەیە، گەر حاڵەتێکیش پێویستی بە نوسین کرد لەنێوان ئەندامانیدا، ئەوا پێویستە بەشێوازێك بنوسرێت کەهیچ پەیوەندی بە رێکخستن یان بزووتنەوەکەوە نەبێت.

٢-بەکارهێنانی وشەی رەمز لە نێوان ئەفسەرانی ئازادیخوازدا، بە تایبەت لە کاتی گفتو گۆی تەلەفۆنیدا، ئەمەش بەمەبەستی چەواشەکردن.

٣-وەرنەگرتنی هیچ ئەفسەرێك لەریزی رێکخراوەکەدا، تائەوکاتەی رای سەرجەم ئەفسەرانی لیژنەی باڵا وەدەگیرێت.

٤-دابەش کردنی لیژنەی باڵا بۆ چەند شانەیەك لەپێناوپاراستنی باری ئاسایشی کۆبونەوە نهێنی‌یەکان و دابەش کردنی ئەرکەکان.

٥-پێشنیاری دەرکردنی بڵاوکراوەیەك کرابوو، بەڵام ئەم پێشنیارە پەسەند نەکرابوو، لەپێناو پاراستنی رەگەزی کوتو پڕی لە شۆڕشداو لە هەمان کاتدا بۆ ئیستفزاز نەکردنی دەزگاکانی ئاسایش و هەواڵگری سەربازی..

٦-پەیوەندی کردن بە پارتە سیاسی‌یەکانەوە لەچەند ئەفسەرێکی لیژنەی بالآدا کورت کرابوویەوە، دەبوایە تەنها ئەوان پیٚ‌ی هەستانایە..

٧-لایەنگری نەکردن بەلای هیچ پارت و بیروباوەرێکی سیاسیدا.

٨-راگەیاندنی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە سەرەتای شۆڕش و لەمەراسیمی بلآوکردنەوەی لە رادیۆ و ئەندامانی ئەنجومەنیش لە ئەندامانی لیژنەی بالآ پێك دێن.

٩-مەسەلەی یەکێتی عەرەبی سەرجەمی ئەندامانی لیژنەی بالآ بڕوایان پیٚ‌ی بوو، بەلآم لێکۆڵینەوەی ئەم مەسەلەیە واتای ئەوەنەبوو کەلەگەڵ شۆڕشدا یەکێتی‌یەکی خێرا رابگەیەنرێت، تەنها لە حاڵەتێکدا نەبێت کە ئیستعمار دەست وەربداتە کارو بارەکان و مەترسی دروست بکات لەسەر شۆڕش..

١٠-ئەندامانی بزوتنەوەکە برای یەکترن و هاوبەشن لە ماف و بەرپرسیارێتی مێژوویداو هەتا تەنانەت سەرۆکی هەڵبژێراوی بزوتنەوەکە هیچ جۆرە دەسەلآت و تایبەتمەندییەکی دیاری کراوی نیە.

١١-بنەمای فراوان کردنی بزوتنەوەکە متمانە دەکاتە سەر رێکخستنی شانەیی کەنابێت ژمارەیان لەسیٚ‌کەس کەمتربیٚ و لە پێنج کەس زیاتر بێت.

١٢-بڕیاردرا پلانی شۆڕش بەجۆرێك بێت لەگەڵ هەموو بارو دۆخێکدا بگونجیٚ و سود وەربگیرێت لەهەر جمو جوڵێك کەبە بەغدادا تیٚ‌پەڕببێت.

١٣-لیژنەکە بە هیچ جۆرێك ئامارەی نەدابوو بە کوشتنی مەلیك فەیسەل یان لێپرسینەوەی، بەلکو ئامانجی سەرەکی بریتی بوو لە قۆڵ بەست کردنی عەبدولئیلا و نوری سەعیدو دادگایی کردنی‌یان.

١٤-ليژنه كەسی رانەسپاردبوو کەپەیوەندی بکات بە ولاتانی دەرەکییەوە ، هەموو ئەوەشی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو لەو کاتەدا دەیزانی ئەوەبوو کە رێکخستنێکی نهێنی لەناوسوپای عێراقدا هەبوو.

١٥-لەکاتی راگەیاندنی شۆرش لە رادیۆوە سەرجەمی ئەفسەرانی ئازادیخواز هەڵدەستن بەو کارەی دەکەوێتە سەرشانیان کەجێبەجێی بکەن لەیەکەکانیاندا..[1]

[1] غالب،العقيد الركن صبيح علی، قصة ثورة ١٤تموز والضباط الاحرار، دار الجاحظ للطباعة والنشرو بغداد١٩٦٨ ،ص٥٠,٥١,٥٢,٥٣,٥٤،

## ناكۆكیەكانی لیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخواز

جیاوازیو ناكۆكی بەرچاو هەبووە لە نێوان ئەندامانی لیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخواز ، كە كۆمەڵە جیاوازییەك بوون سەبارەت بەمەسەلە پراكتیكی و ئامانج و بنەماكان ، جگە لە ركابەری شخصی لەنێوانیاندا ...

سەرەڕای كەمی ئەو ماوەی كە لیژنەی باڵا تێیدا ژیا ، ولەمانگی كانوونی دووەمی ١٩٥٦ وەدرێژەی هەبوو هەتا ١٩٥٨/٧/١٤ بەڵام ناكۆكیەكان زۆرو پێكدا چووبوون ، كە لێرەدا بەكورتی ئاماژەیان پێ دەكەین

### سەرۆكایەتی لیژنەی باڵا

پاش پێكەوە بەستنەوەی ڕێكخستنی بغداد ،كە عقید ركن محی‌الدین عبدالحمید سەرۆكایەتی دەكرد ، لەگەڵ ڕێكخستنی منصور كەقاسم سەرۆكایەتی دەكرد ، هەڵبژاردن كراو لەبەرەنجامی خوێندنەوەی اعتباری پلەی سەربازی قاسم هەڵبژێرا ، كەلەهەموویان پلەی سەربازی بەرزتر بوو ، هەندێكیشیان عقیدالركن ناجی تالب یان بەشایستەی سەرۆكایەتی دەزانی و هەندیكی تریان عقیدالركن محی‌الدین عبدالحمید ، لەبەر ئەوەش لەكۆتایدا ، ئەم دووكەس كرانە جێگری قاسم لە سەرۆكایەتی‌دا

### ئە نجام دانی شۆرش

سەبارەت بەئەنجامدانی كاتی شۆرش و چۆنیەتی ئەنجامدانیشی ، لە دوو بۆچوندا كورت دەبوویەوە:

١-هەندێكیان پێیان وا بوو كاتێك دەبێت شۆرش ئەنجام بدرێت كە تەواوی ریۆ شوێنەكان گیرابنە بەر و پلانەكان ١٠٠٪ سەركەوتوو بن ، چونكە فەشەلی شۆرش واتای دواكەوتنی روخانی ڕژێمی پاشایەتی یە .

٢-هەندێکی تریان حەزیان بەوە بوو کە شۆرش وەك کارێکی خۆکوژی ئەنجام بدەن و خێرا بێت بەم جۆرەش هەموولا لەسەریەك شێواز رێك نەدەکەوتن لەسەر ئەنجامدانی شۆرش .

**دارشتنی پلانی شۆرش**

زۆربەی جار ئەو پلانانەی دادەنرا بۆ ئەنجامدانی شۆرش جێگەی مشتو مڕو ناکۆکی ئەندامەکانی لیژنەی بالاْ بوو ، ئەم حالەتەش ڕەنگدانەوەی زۆری هەبوو لە دارشتنی پلانەکاندا ، هەر لەم بەرەنجامەشەوە پەنا دەبرایە بەر کردەی سەربەخۆو نامەرکەزی .تەنانەت پلانی شۆرشی ١٤تموز نەخرایە بەردەست تا گفتو گۆی لەسەر بکرێت ، بەڵکو لەلایەن (قاسم و عارف ودەراجی)یەوە دارێژرا .

***چارەنوسی بنەماڵەی پاشایاتی**

سەبارەت بە چارەنوسی بنەماڵەی پاشایەتی چەند بۆچونێك هەبوو:
هەندێك داوایان دەکرد ئەم مەسەلە دوابخرێت بۆ پاش سەرکەوتنی شۆڕش.

هەندێکی تر پێیان وابوو کە نوری سەعید و عەبدولئیلاه لەبەردەم دادگایەکی سەربازیدا بوەستێنرێن حوکمی سێدارە بدرێت بەسەریاندا و مەلیکیش ڕەوانەی دەرەوەی وڵات بکرێت.

عەبدولسەلام عارف سوربوو لەسەر ئەوەی کە هەرسێ کەسایەتی دەستەڵاتی پاشایەتی لەناوبرێن، بەو بیانووەی نەبنە هۆی ئەوەی وڵاتانی ( پەیمانی بەغداد) هان بدەن بۆسەرکوت کردنی شۆڕش و توانەوەی.

لەم گفتۆگۆیانەدا قاسم بێ دەنگ بوو هیچ جۆرە ڕایەکی دەرنەدەبڕی.

### پەسەند كردنی عارف وەك ئەندامی لیژنەی باڵا

لەبەر هەندێك خو و نەریتی عارف وەك هەڵچون و پەلەكردن، لیژنەی باڵا رایان وابوو نەهێنرێتە لیژنەكەوە، بەڵام لەبەرامبەردا قاسم زۆر پێداگری لەسەر هێنانی دەكردەوە بۆ ناو لیژنەی باڵاو ووتبووی خۆم بەرپرسیارم لێی. هەتا جارێك لەیەكێك لە كۆبونەوەكاندا بێ ئەوەی لیژنەی باڵا ئاگادار بێت بەشداری پێ دەكات و دەڵێت، ئەمەش لەهەموو شتێكی ئەفسەرانی ئازادیخواز دەزانێت.[1]

### پەیوەندی بە پارتە سیاسیەكانەوە

سەرەڕای بوونی ڕێكەوتنی ئەوەی كەجگە لە سكرتێری ڕێكخستنەكە (المقدم المهندس رجب عبدالمجید) كەس بۆی نەبێ پەیوەندی لەگەڵ پارتە سیاسیەكان دامەزرێنێ، و(صدیق شەنشەل) یش وەك نوێنەری پارتە سیاسیەكان، بەڵام ئەندامانی لیژنەی باڵا هەریەكە لەگەڵ پارتێكدا پەیوەندیان هەبوو بێ لەبەرچاوگرتنی باری مەركەزییەتی كارەكەیان.

### نەبوونی ئینسیجام لە نێوان ئەندامانی لیژنەی باڵادا

ئەمەش كێشەیەكی تربوو لەنێوان ئەندامانی لیژنەی باڵادا ، نەبوونی ئینسیجام و دڕۆدۆنگی لە نێوانیاندا، لەبەر ئەم حاڵەتەش هەندێكیان بەشداری كۆبونەوەكانیان نەدەكرد،وەك رفعت الحاج سری، و پاش مایسی ١٩٥٨ یش عەبدولسەلام عارف بەشداری كۆبونەوەكانی نەدەكرد..

---

[1] لوا روكن عبدالكریم فرحان لە كتێبی(ثورة ١٤تموز فی العراق) بەرگی یەكەم دەڵێت: عبدالكریم قاسم و عەبدولسەلام عارف لەدوایدا كەهاتنە نێو لیژنەی باڵاوە وەك كوتلەیەك دەركەوتن و یەك سیاسەتیان هەبوو لەسەر شتەكان.

## پەیوەندی نەکردن بەوولاتانی عەرەبی و بێگانەوە

ئەمەش بنەمایەکی تری کارەکان بوو،کەمەبەستیان پارێزگاری کردن بوو لەنهێنی ڕێکخستنەکە، تائەوەی شۆڕش ببێتە موفاجەئەیەك، بەلاّم هەندێکیان ئەم بڕیارەیان شکاندو پەیوەندییان کردبەئەفسەرانی سوریاوە..

## هەڵبژاردنی ئەندامی لیژنەکان

ئەم کێشەیەش لە١٩٥٨/٧/١سەری هەڵدا کاتێك کۆبونەوەیەك کرا تالیژنەیەك پیك بهێنرێت بۆدیاری کردنی گەورە کاربەدەستانی فەرمانگەو بەڕێوەبەری گشتی و وەکیل وەزیرەکانی پاش شۆڕش، بەلاّم قاسم سوربوو لەسەر ئەوەی کە دەبێت عارف ئەندامی ئەو لیژنە بێت و هەندێکی تر لەئەندامان دژی ئەم ڕایە بوون، سەرەنجام سوربوونی قاسم لەسەر داواکەی بوو بەمایەی دانەمەزراندنی لیژنەکەو هەرەسی کۆبونەوەکە..

## ئیلتیزام نەکردن بە بنەماکانی کاری لیژنەی بالاّوە

ئەمەش خۆی لەبوونی ناکۆکی ئەندامانی لیژنەی بالاّدا دەبینییەوە، کەرازی نەبوون بە هەندێك بنەمای کارو ئەو پرۆگرامەی کەلیژنەی بالاّ بڕیاری لەسەر دابوو، بۆنموونە مەسەلەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و گۆڕینی بە ئەنجومەنی سیادە وەك لە (سودان) لەو کاتەدا هەبوو،یان مەسەلەی پەلە کردن لەئەنجام دانی شۆڕش.[1]

---

[1] الزبيدي، ليث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانية ، بغداد ١٩٨١

## کوردو ئەفسەرانی ئازادیخواز

هەروەك لەسەرەتاوە ئاماژەی پیکرا، لیژنەی بالا یەکێك لەئەندامە کاراکانی بەرەگەز کوردبووە، ئەویش (عقید روکن محی‌الدین عبدالحمید) بووە، کەسەرۆکی کوتلەی ڕێکخستنی بەغداد بووە،تاپێش هەڵبژاردنی قاسم بۆ سەرۆکایەتی لیژنەی بالا، محی‌الدین عبدالحمید ڕۆڵی بەرچاوی گێراوە و لەدامەزرێنەرانی ئەم ڕێکخراوە دێتە ژماردن..

بۆزیاتر ساغ کردنەوەی ژمارەی ئەفسەرانی کورد لەڕیزی ئەفسەرانی ئازادیخوازدا، عەقیدی خانەنشین (عباس علی قادر)بەم جۆرە وەلامی دامەوە کە(١٠) ئەفسەری کورد لەو ڕێکخراوەدا کاریان کردووە، ئەمانیش ڕۆلی بەرچاویان دیوە لە سەرخستنی شۆڕشدا، لەهەمان کاتدا کاریگەرییان هەبووە لەدەرچواندنی چەندبڕیارێکی گرنگ لەبەرژوەندی کورد، لەوانەش:

کوردو عەرەب هاوبەش و شەریکن لە نیشتمانی عێراقدا.

خوێندن بە زمانی کوردی.

دامەزراندنی ژمارەیەکی زۆری کوردەکان لە وەزارەتەکاندا.

ئازادکرنی زیندانی‌یە سیاسی‌یە کوردەکان.

دەرکردنی لێبوردن بۆ بارزانی و بڕینەوەی موچە بۆیان و هاوکاری کردنیان.

ئەمەش ناوی ئەو ئەفسەرە کوردانەیە کە لە ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخوازدا بوون:

١-عقيد الركن محي‌الدين عەبدولحەمید

٢-نوری رشید عەبابەیلیێ

٣-عقيد الركن خالد النقشبندی

٤-نقيب مستەفا عەبدوڵا

٥-عەبدولکەریم قاسم خەفاف

٦-عقيد عادل جەلال.

٧-عقيد تەها مستەفا بامەرنی

٨- مقدم مستەفا عەزیز

٩- مقدم فەتاح سەعید شالی

١٠ -مقدم عەلی موحەمەد شەریف

## لیژنەی باڵا و گرێژنەی ئە نجام دانی شۆرش

چرکەساتی گونجاو هاتە پێشەوە بۆ ئەنجام دانی شۆرش کاتێك زانیاری ئەوە بەدەست گەیشت کە فەرمان دەرچووە بۆ لیوای پیادەی بیست تالە جەلەولاوە جوڵە بکات بەئاراستەی ئودروندا، لەدوایشدا بەرواری جوڵەکەش لە شەوی (١٣)لەسەر( ١٤) ی تەمموز جێگیر کرا، لەو کەتیبەی لیوای ناوبراو دوو کەتیبەیان لەدەستی ئەفسەرانی ئازادیخوازدا بوو. لیژنەی باڵا تێگەیشت کە سەعاتی سفر نزیکە بەلام ئەوەی بەلایەوە کوتو پڕبوو ئەوە بوو کە پەراوێز خرابێت، لەکاتێکدا لەلێواری رودانی شۆرشدان! بۆچی؟ چۆن روداوەکان تیێپەرین؟

کێشەو ناکۆکی لە نێوان ئەندامانی لیژنەی باڵادا خەریك بوو کەڵەکە دەبوو، بەتایبەت لەو کۆتایەدا، (حنا بطاطو)لەم بارەیەوە دەڵێت" ئەم کێشانە

لەبەرەنجامی نەمانی ئارام گرتن و چاوەڕێکردنی بەشێك لەئەفسەرە کەم تەمەنەکانی ڕێکخراوەکەدا سەری هەڵدا کەماوەیەکی زۆر بوو چاوەڕێی شۆڕشیان دەکرد، بۆنمونە لەناو ئەو ئەفسەرانەدا (عەبدولسەلام عارف) باشترین نمونە بوو، کەناسرابوو بە ئازایەتی و زوو بڕیار دەرکردن و دەست دانە دەست پێشخەری مەترسی دار،لەرۆژی ١٢ی حوزەیرانی ١٩٥٨دا عارف لەیەکێك لە کۆبونەوەکانی لیژنەی بالادا بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو دەڵێت: لەگەڵ عەبدولکریم قا سمدا( لەوکاتەدا قاسم لەوێ نەبووە) بڕیارمان داوە کەشەممەی داهاتوو کودەتا بکەین، ئامادەبوانیش جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کەکاتەکەی گونجاو نیە، چونکە لە بەروارەدا ( عەبدولئیلا)ا لەدەرەوەی وڵاتە، نەیاری کردنی لیژنەی بالا بۆ قسەکەی عارف لەبەرەنجامی سوربوونی عارفەوە بوو لەسەر قسەی خۆی، هەربۆیەش عارف دەڵێت: "ئەمە سنورمانە و داواکارم کەس دەست نەخاتە ناوییەوە" بەراستی ئەم کۆبونەوەیەش دواین کۆبونەوە بوو کە عارف بەشداری تیاکرد"

گەر بگەڕێینەوە بۆ لیژنەی یەدەکی ئەفسەرانی ئازادیخواز، ئەم لیژنەیە پەیوەندی تەنها لە ڕێگەی رازگری نهێنی (رجب عبدالمجید) ەوە هەبوو لەگەڵ لیژنەی بالادا، بە هۆی زیادبوونی ناکۆکی و جیاوازی بیرو ڕا سەبارەت بە ئەنجام دانی شۆڕش لەلیژنەی بالادا، لەو کاتەدا (عبدالمجید) داوای کرد لەکارەکەی کە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان لیژنەی یەدەك و لیژنەی بالابوو بیبەخشرێ، لێرەشدا عەبدولسەلام داوای کرد لەبری عبدالمجید دابنرێت تابەو کارە هەستێ، لیژنەی بالاش رەزامەندی نیشان دا، بێئەوەی بزانێت کەکەوتۆتە هەڵەیەکی دیکەوە کاتێك ئەو هەلە دەداتە عارف تاخۆی

بەتەنها لەگەڵ لیژنەی یەدەکدا بێت و ئاراستەیان بکات، و لەهەمان کاتدا ڕۆڵی لیژنەی باڵاش پەراوێز بخات، بەتایبەت لەکاتێکدا چرکەساتەکانی یەکلاکردنەوە بەتەواوی نزیک بووبوویەوە.

بە هەرجۆرێك باس لە خەملاندن و حوکم دان بکرێت سەبارەت بە ئاڵوگۆڕەکانی بزوتنەوەی ئەفسەرانی ئازادیخواز و لیژنەی باڵا، بەڵام مەسەلەیەکی ئاڵۆز دەمێنێتەوە کەپاش شۆڕش ئاشکرا بوو، ئەویش بریتی بوو لەو ڕێکەوتنەی لە نێوان قاسم و عارف و عەبدولەتیف دەراجیدا هەبوو سەبارەت بەئەنجام دانی شۆرش لەنێو خۆیاندا بێ ئاگادار کردنەوەی لیژنەی باڵا، هەرلەبەر ئەوەش کاتێك کۆبونەوەی لیژنە لە(٣)یان(٤) ی تەمموز لە ماڵی قاسم بەسترا بۆگفتو گۆکردن لەسەر شۆڕش و کاروبارەکانی پاش شۆڕش وەك ئەنجومەنی سەرکردایەتی و ئەنجومەنی وەزیران و ئەنجومەنی سیادە، قاسم لەسیناریۆیەکدا کۆبونەوەکە هەڵدەوەشێنێتەوە، و لەدوایدا ئەوە بەدیار کەوت کەویستبویان لیژنەی باڵا لە ئەنجام دانی شۆڕش لابخەن، تالە پاش شۆڕش خۆیان خاوەنی شۆڕش بن و دەسەڵاتەکان دابەش بکەن.. سەبارەت بەم بیرو رایەش عارف لەبەردەم دادگای باڵای سەربازیدا لە ١٩٥٨/١٢/٣١ وتبووی "زەعیم قاسم پیێی وتم: بالەگەڵیاندا بۆ هەندێك قسەو باس لوتف بنوێنین، بەڵام لەبواری کاری یەکلاکەرەوەدا بالە نێوان هەردووکماندا بێت"..[1] هەربۆیش لەگەڵ رەخسانی یهەل و مەرجەکەدا توانیان پێکەوە لە ١٤ی تەممموزدا شۆڕش ئەنجام بدەن و دەسەڵاتەکان لە نێوان خۆیاندا دابەش بکەن..

[1] رشيد. د. عبدالوهاب حميد، العراق المعاصر. دار المدى للثقافة والنشر،٢٠٠٢، ص١٣٦,١٣٧.

بیرو ڕای جیاواز هەیە سەبارەت بەوەی کە بۆچی قاسم و عارف بەتەنها خۆیان شۆڕشیان ئەنجام دا و پەلەیان کرد لە رودانی بەشێوەیەکی نهێنی ؟

بەووردبونەوە لە لەبارودۆخی لیژنەی بالاَ، لەگەلَ لیژنە یەدەکەیدا ئەوە بەدیار دەکەوێت کەفشارێکی زۆر لەلایەن ئەمەی دواییەوە هەبووە لەسەر لیژنەی بالاَ بۆ خێرا کردن لەئەنجام دانی شۆڕش، بەلاَم لە گەلَ هاتنە پێشەوەی هەلی لەباردا بۆ ئەنجامدانی شۆڕش دەبوایە ئەمان لەلایەن خۆیانەوە ناکۆکی یەکانیان نەهێشتایە، هەولَەکانیان یەك بخستبایە بۆ سەرخستنی شۆڕش نەك گۆشەگیری و دابڕانی یەکتر،هەربۆیەش نیشانەی پرسیار لەسەر ئەو سەرکردانە دروست دەبێت کە بەسود وەرگرتن لە لیژنەی یەدەك شۆڕشیان ئەنجام دا... لێرەشدا دەتوانین بلَێین ئەوەی لە ١٤ی تەمموز ڕویدا دوو کودەتابوو ، یەکەمیان بەسەر لیژنەی بالاَدا کراو لەناو نەخشەی شۆڕش دا هەلَی وەشاندەوە، دوەمیان بوو بە مایەی هەلَوەشاندنەوەی سیستمی پاشایەتی لە عێراقدا.[٢]

## ئایا شۆڕش پێویست بوو؟

زۆر جار ئەم پرسیارە لە بیرو سەرنجی لێکۆلَەرەوەکانی مێژووی عێراقی هاوچەرخ، یا تەنانەت سەرکردەکانی شۆڕشی ١٤ی تەموزدا سەرهەلَ دەدات، ئایا شۆڕش پێویست بوو ئەنجام بدرێت؟ یاخود زەمینەی شۆڕش لە عێراقدا لەبار بوو؟ ئەوەی بەدی دەکرێت ئەوەیە زۆربە دەگمەن سەرجەمی وەلاَمەکانی ئەم پرسیارە بە ئیجابی بدرێتەوە، شۆڕش هۆکارو دەرەنجامی دیاری کراوی خۆی هەبوو، کەدەبوایە ئەوەی مومارەسەی دەسەلاَتی دەکرد،

---

[٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە١٣٧,١٣٨.

بەوردی حسابی بۆ بکردایە، تا دەسەڵاتەکە دەسەڵاتێکی داد پەروەرانە بوایە..

شۆڕشی ١٤ی تەموز هەرچەند دەتوانین بڵێین شتێکی کوت وپڕ و چاوەڕوان نەکراوبوو لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و تەنانەت لە هەندێك باریشدا ناوخۆیی، بەڵام بەدەر نیە لە هەندێك کارتێکەری دەرەکی و ناوخۆیی و پاڵنەر بووە لە هەڵایسانیدا، لێرەدا بە کورتی ئاماژە دەدەینە هەردوو هۆکارە دەرەکی و ناوخۆیی‌یەکان.[1]

**هۆکارە دەرکی‌یەکان**

١-سەرکەوتنی شۆڕشی ٢٢ی‌تەموزی١٩٥٢ ی ئەفسەرانی ئازادیخواز لە میسر، بەسەرۆکایەتی جەمال عەبدولناصر.

٢-دروست بوونی پەیمانی بەغداد و دەرکەوتنی ناوبانگی پەیمانەکە بە ناوی بەغدادەوە کە لەسەر هەڵوێستی عێراق کەوتبوولەو کاتەدا وەك وڵاتێکی عەرەبی..

٣-زیاد بوونی هەژمونی وڵاتانی زلهێزی بەریتانیا و ئەمریکا بەسەر عێراق و سوڕانەوەی سیاسەتی دەرەکی عێراقی لە چوارچێوەی سیاسەتی ئەو زلهێزانەدا...

٤-هەڵوێستی نادروستی عێراق سەبارەت بە خۆماڵی کردنی نۆکەندی سوێس ساڵی ١٩٥٦ وهەروەها یەکێتی نێوان میسرو سوریا ساڵی ١٩٥٧ ..

٥-پەلاماری سێ قۆڵی سەر میسر و لاوازی هەڵوێستی سیاسی عێراق لەم بوارەدا..

---

[1] - فرحان، اللواء الركن عبدالكريم ، ثورة ١٤تموز فی العراق، الجزء الاول، ص٧٦,٧٥، مؤسسة الكتاب العربی للدراسات والترجمة والنشر، باريس، ١٩٨٦.

١-دواكەوتویی باری ئابوری وبژێوی خەڵكی عێراق لە كاتێكدا عێراق وڵاتێكی دەوڵەمەند و خاوەن چەندین سەرچاوەی سروشتی وەك نەوت و كانزابوو، كە زیاتر ئەم سامانە لە دەستی چەند كەسانێك دا قۆرغ دەكرا و سودی خراپیشی لێ وەردەگیرا..

٢-دواكەوتن و پشت گوێ خستنی زوربەی بوارەكانی ژیانی خەڵكی عێراق لە ڕووی تەندروستی و فێركردن و... هتد

٣-شكستی ئەو ڕاپەڕین و شۆڕشە جەماوەرییانەی كە گەلی عێراق پێی هەڵدەستا، وەڵامدانەوەی توندی لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە..

٤- زیاتر بوونی هەژمونی بەرژوەندی ئابووری و سەربازی بەریتانیا لە ناوخۆی عێراقدا و دەسەڵات گرتن بەسەر سەروەت و سامانی وڵاتدا..

٥- بەرتەسك كردنەوەی فەزای بەشداری سیاسی و مومارەسەی كاری سیاسی و حیزبی. سەركوت كردنیان لەلایەن دەوڵەتەوە، وەك ڕێگرتن لە چالاكی نواندنی ئەو پارت و ڕێكخراوانە، یاخود دەست گیر كردنی سەركردەو هەڵسوڕاوەكانیان و هەندێ جاریش لە سێدارە دانیان.[٢]

---

[٢] التطور السياسي في العراق المعاصر، تأليف مجموعة من الكتاب، جامعة بغداد، ص ٣٣١.

# فەسڵی دووەم

- هەوڵە سەرنەکەوتووەکانی پێش شۆڕشی ١٤ی تەمموز
- چرکە ساتەکانی شۆڕشی ١٤ی تەمموز
- پەلاماری کۆشکی ریحاب و هەڵاتنی نوری سەعید
- راکێشانی تەرمەکان
- کاردانەوە نێودەوڵەتی‌یەکانی شۆرشی ١٤ی تەمموز
- مەسەلەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش
- مەسەلەی یەکێتی عەرەبی
- بەرگری میللی
- گەرانەوەی گەیلانی و هەوڵی کودەتایەکی شکست خواردوو
- دادگای مەهداوی
- جولانەوەکەی شەواف
- قاسم و دەسەلاتی تاکرەوی

## هەوڵە سەرنەکەوتووەکانی
## پێـــش شۆڕشی ١٤ی تەموز

گەربەووردی سەرنجی ئەو هەوڵانە بدەین کەخراونەتە گەڕ پێش شۆڕشی ١٤ی تەممووز، لەپێناوی روخاندنی دەسەڵاتی پاشایەتیدا، ئەوەندەی تێیدا گرنگی دراوە بە ڕێگە و هۆکارەکانی ئەنجام دانی، ئەوەندە گرنگی نەدراوە بەئامانج و مەبەستەکانی، تەنانەت بەرنامەڕێژییەکی تەواو نەکرابوو سەبارەت بەستراتیژیەتی شۆڕشەکەو دیاری کردنی سەعاتی سفر بۆئەنجام دانی، تەنها کارێك کەهەمووولا لەسەری کۆك بوون، بریتی بوو لەوەی گەرکۆمەڵێك ئەفسەر بەشۆڕش هەستان ، ئەوا ئەوانی دیکە پاڵپشتی بکەن..[1]

ئەوەی لە١٤ی تەموزی ١٩٥٨ ئەفسەرانی ئازادیخواز ئەنجامیاندا، کارێك نەبوو کەلە پڕێکدا هاتبێتە ئاراوە، بەڵکو پێش ئەوەش هەندێك هەوڵی تر هەبوون بۆ روخاندنی دەسەلاتیپاشایەتی، بەلام هەل ومەرجەکان نەگونجاوبوون بۆ سەرخستنی، ئیترئایا هۆکارەکە پەیوەندی بە دەسەلاتی پاشایەتییەوە هەبوبێت، یان پەیوەندی بەو پلان و نەخشانەوە هەبوبێت کەدایان رشتبوو، یاخود پەیوەندی بەو کەسانەوە هەبووە کەبەکارەکە هەستاون، لەگەڵ ئەوەی کەئەو هەوڵانە سەرکەوتوو نەبوون، بەلام کاریگەری قوڵیان بەجێ هێشتووە لە سەرکاروانی شۆڕش و ڕەنگدانەوەی کاریگەریململانێی توند و خوێناوی لەنێوان ئەو ئەفسەرانەی هەستابوون

---

[1] خدوري، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص٤٩.

بەئەنجام دانی شۆڕش، وئەوانەشی لەدەوریان کۆبوبوونەوە لە سەرباز و مەدەنی یەکان.. [2] بەدەر لەم حاڵەتانەش هەریەك لە جوڵانەوەکەی بەکر صدقی١٩٣٦ و رەشید عالی گەیلانی ١٩٤١کاریگەری باشیان هەبوو لەسەرگوڕو تین دان بەو هەوڵانە و وەرگرتنی دەرس و پەند لێیان و دوبارە نەکردنەوەیان لەهەوڵەکانیاندا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا چەندان جوڵانەوە پێش شۆڕشی ١٤ی تەمموز هاتنە ئاراوە بێئەوەی بەرەنجامی دڵخۆشکەری لێ بکەوێتەوە، کەلێرەدا ئاماژە دەدەینە هەندێکیان:-

### *هەوڵی یەکەم تشرینی دووەمی ١٩٥٦*

پاش ڕودانی پەلاماری سێ قۆڵی سەرمیسر، خەڵکی عێراق بەتەواوی توڕەییان کڵپەی سەندبوو بەرامبەر بەدەسەڵاتی پاشایەتی لەعێراقدا، و لەم بوارەشدا ئەفسەرانی ئازادیخواز لەلیوای ١٤ی تیپی یەکەم کەلەو کاتەدا مەشقیان ئەنجام دەدا لەناوچەی چیای حەمرین، روخانی دەسەڵاتیپاشایەتی یان کردە پێویستی یەکی هەنوکەیی، لەم بوارەشدا عەقید عەبدلوەهاب شەواف فەرماندەی فەوجی سێ لەلیوای ١٤ داوای کۆبونەوەیەکی ئەفسەرانی ئازادیخوازی فەوجی سێ و فەوجەکانی تریش کردبوو، پاشان ڕێکەوتبون لەسەر ئەوەی کە فەرماندەی لیواکە (سلمان الدرکزلی)دەستگیر بکەن و پاشان بەرەو بەغداد بکشێن، ئەمەش پاش ئەوەی پشت بەکەتیبەی زرێپۆشەکان دەبەستن بەسەرکردەیی عەقید تاهر یەحیا، بۆکۆنترۆڵ کردنی شوێنە گرنگەکانی بەغداد، بەڵام هەربەزویی پلانەکە دواخرا، پاش ئەوەی زانرا کەسەرکەوتوو نابێت، ئەم هەوڵەش حەماسەتی لەنێو ڕیزی ئەفسەر و سەربازەکانی فەوجی سێدا دروست کردبوو، پاش

---

[2] الزبيدي، ليث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانية ، بغداد ١٩٨١ ،ص١٦١.

ئەوەی ئەم پلانە لەلایەن ناوەندە باڵاكانی حكومەتەوە ئاشكرا كرا، ویستیان لەچەك دایان بماڵن، بەڵام بەهۆی مەترسی لەسەرداهاتووەكەی، بڕیاردرا بگوازرێنەوە بۆ ناوچەی(H3)،ئەمەش بەبەڵگەی گۆڕانی یەكەكان (الوحدات).. [1]

## هەوڵی دووەم تشرینی دووەمی ١٩٥٦

یەكێك لەو پلانانەی كەقاسم داینا بوو بۆ شۆڕش[2]،لەو كاتەداكە فەرماندەی لیوای ١٩ بووەوبەهۆی لیواكەیەوە لەئوردون بوون، دیارە ئەمەش بەهاوكاری عەبدولسەلام عارف ئەنجامی دەدات، بۆئەم مەبەستە لەئوردونەوە نامەیەك دەنێرێت بۆڕێكخراوی مەركەزی بەغداد و تیایدا دەنوسێت لەڕێگەی گەڕانەوەی لەنزیك سنوری عێراق لەناوچەی (H3) شۆڕش ڕادەگەیەنێت، ئەمەش لەمانگی تشرینی دووەمی ١٩٥٦دا دەبێت، لەبەر ئەوەی هەرسیٚ كەسایەتی دەستەڵاتی عێراق(مەلیك فەیسەڵی دووەم، عەبدولئیلاه و[3] نوری سەعید) لەویٚ لەپێشوازییاندا دەبن، بەڵام ئەم پلانەش هەڵوەشایەوە لەبەر ئەوەی نوری سەعید ئامادەی پێشوازی كردنەكە نابێت، دەربارەی ئەم پلانە (زعیم محی الدین عبدالحمید) دەڵێت: راوێژكرا بەڕێكخراوی مەركەزی ئەفسەرانی ئازادیخواز دەربارەی ئەم پلانە، بەڵام وورياييان دابوویە عەبدولكەریم قاسم كەشۆڕش ڕانەگەیەنێت بەهۆی نەبوونی ئامادەگی تەواوبۆئەم كارە لەلایەن ئەفسەرانی ئازادیخوازەوە.. [4]

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[2] پاش مانگێك لەسەركەوتنی شۆڕش، قاسم ڕایگەیاندبوو كە هەرپاش ئەوەی دەرچووە لە كۆلیژی سەربازی ساڵی ١٩٣٤ پلانی كودەتای هەبووە وبووەتە خولیای تائەوەی لە ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ ئەو خولیایەی هێنایە دی.سەرەڕای ئەوەی لە كودەتاكەی بەكر صدقی بەشداری كردووە.

[3] مەلیك فەیسەڵ لە ٢ی ئایاری ١٩٥٣ دەسەڵاتی دەستوری تەواوی وەرگرت و كەس وەك وەصی بەسەریەوە نەما.

[4] خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر – قم ١٩٩٧ ، ص٤٩,٥٧.

### هەوڵی سێیەم پایزی ۱۹٥۷

بڕیار درا لە پایزی ۱۹٥۷دا سوپای عێراق مانۆڕێك سازبكات بەچەكی ڕاستەقینە لەناوچەی(بێخاڵ) مەبەست لەم كارەش پڕوپاگەندەكردن بوو بۆ پەیمانی بەغداد و نمایش كردنی چەكی ئەمریكی كەسوپای پێبەهێز كرابوو، بڕیاریش وابوو هەرسێ كەسایەتی دەسەڵاتی عێراقی ئامادەبن، بۆ ئەم مەبەستەش لیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخواز لێكۆڵینەوەیان لە مەسەلەكەدا كرد وبڕیاری داڕشتنی پلانییان بۆدا، لەم مانۆڕەدا كەهەندێك لەئەفسەرانیئازادیخواز بەڕێوەیان دەبرد، لەنێویشیاندا عەبدولسەلام عارف سەركردەی فەوجی دووی لیوای بیست، و عەقید روكن خلیل سعید كە فەرماندەی لیوای (۳) ی دەكرد، تەكلیف كران بەكارەكە، پلانەكەش خۆی لەدەستگیركردنی هەرسێ كەسایەتیدا دەبنییەوە وپاشان هەستانی یەكەكانی تر بەدەستگرتن بەسەر شوێنە گرنگەكاندا، ئەمەش پاش ناردنی (ووشەی نهێنی) بەڵام ئەم پلانەش بەهۆی بەشدار نەكردنی نوری سەعید و سەردانی (عەبدولئیلاه)بۆیابان، دواخرا وئەنجام نەدرا...[٥]

### هەوڵی چوارەم كانونی دووەمی ۱۹٥۸

جارێكی تر لیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخواز، ئەنجام دانی شۆرشیان خستبوویەبەرباس، تا لە۱۹٥۸/۱/٦ ئەنجامی بدەن، كەیادی دامەزراندنی سوپای عێراقی بوو، بۆئەم مەبەستەش دیارە ئاهەنگ ڕێك دەخرا لەسەربازگەی رەشید لەلایەن یەكەكانی سوپاوەو بەبەشداری زۆربەی ئەفسەرانی ئازادیخواز، كەبریتی بوون لە عەبدولكەریم قاسم فەرماندەی لیوای (۱۹) و عەقید روكن محسن حسین الحبیب فەرماندەی كەتیبەی تۆپی

[٥] الزبيدي، ليث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانية ، بغداد ١٩٨١ص١٦٣.

قورس و عەقید محمود عبدالرزاق فەرماندەی فەوجی (٢) پاش گفتۆ کردنی ئەم مەسەلە دوو پلان دارێژرا:

١-پلانەکەی عەبدولکەریم قاسم: بەپێ‌ی ئەم پلانە لەکاتی گوزەر کردنی بەبەردەم (منصە) ی سلاوکردندا کەهەرسێ کەسایەتی لەسەری دەبن، لەو کاتەدا تەقەیان لێ بکرێت، پاشان ئەفسەرانی ئازادیخواز هەستن بە گرتنی بەرپرسان و دەسەلات گرتن بەسەر یەکە سەربازییەکاندا و کشان بەرەو بەغداد و ڕاگەیاندنی شۆڕش.. بەلام لیژنەکە بەزۆرینەی دەنگ ئەم پلانەیان ڕەت کردەوە ، چونکە بەهۆی تەقەکردنەوە مەلیك فەیسەڵ دەکوژرێت ، کەئەمان بڕیاریان دابوو لە کۆبونەوەکانی پێشویاندا کەنەیکوژن هەروەها کەسانی بێ‌تاوانیشی تیا دەکوژرێت، تەنها لایەنگری ئەم پلانە قاسم و عارف بوون..

٢-پلانەکەی عەقید ڕوکن ناجی تالب: ئەم پلانە بریتی بوو لەوەی یەکە زرێپۆشەکان کەعەقیدعەبدولرەحمان عارف فەرماندەییان دەکات، و هەموو سپێدەیەك جوڵەی دەکرد لە ناوچەکەی خۆیدا لە ئەبو غرێب بەئاراستە سەربازگەی رەشیددا، بەبۆنەی یادی دامەزراندنی سوپای عێراقەوە لە١٩٥٨/١/٦ لەکاتی گوزەرکردنی بەبەغدادا هەستن بە داگیرکردنی کۆشکی ڕیحاب و ڕادیۆو پرد و دەستگیر کردنی هەرسێ کەسەکەو ڕاگەیاندنی شۆڕش، لەکاتێکدا یەکە سەربازییەکانی تر بەرەو سەربازگەی ڕەشید بکشێن و دەست بگرن بەسەر بەری (رصافە) دا..

ئەم پلانەش شکستی هێنا بەهۆی رازی نەبوونی عەقید عەبدولرەحمان عارف، بەبەڵگەی نەبوونی کەرەستەی پێویست، سەرەڕای ئەوەی ئەفسەرانی ئازادیخواز پەیمانی کەرەستەی پێویست یان پیّدابوون ...[1]

### هەوڵی پێنجەم مایسی ١٩٥٨

له١١/٥/١٩٥٨ پلانێك دارێژرا بۆ کوشتنی هەرسیّ کەسایەتی دەسەلاّتی عێراقی، لەکاتی ئەو مانۆرە سەربازییەی کەسوپا پیّی هەڵدەستا له(رطبة)، بەلاّم نوری سەعید ئامادەنەبوو، لەگەڵ ئەمەشدا بۆمبێك هەڵدرا کەلەو کاتەدا مەلیك و دەست و پێوەندەکەی دانیشتبوون، بەلاّم کەس بەرنەکەوت و لەدوایدا و لەبەرەنجامی لێکۆڵینەوەوە بەدیار کەوت کە بەشێك نەبووە لە پلانێکی نهێنی و ڕوداوەکە بیّمەبەست یاسکرا، لەگەڵ ئەوەی ئەو ئەگەرەش هەیە کە هەندێك لەئەفسەرەکان نەیان زانیبیّ بەهەڵوەشاندنەوەی پلانەکە لەلایەن ئەفسەرانی ئازادیخوازەوەو ئەو کارەیان کردبێت...[2]

### هەوڵی شەشەم مایسی ١٩٥٨

هەوڵێکی تر درا لەڕۆژی ١٢/٥/١٩٥٨ دا، پاش ئەوەی یەکەسەربازییەکان گەڕابوونەوە شوێنەکانیان، لیوای بەصرە بەسەرکردەیی (زعیم احمد محمد یحیی) لەئەبوو غرێب وەستابوو، چاوەڕوان دەکرا لەوێدا شۆڕش ڕابگەیەنێت، ڕۆڵی ئەفسەرانی ئازادیخوازیش کەلەبەغداد بوون لەژێر فەرماندەیی عەبدولوەهاب شەواف داو بریتی بوو لەوەی هەر لەگەڵ بیستنی هەواڵی ڕاگەیاندنی شۆڕشدا لەلایەن زعیم احمد محمد یحیی) وە،ئەمانیش دەست بگرن بەسەر شوێنە حەساسەکانی بەغدادا، ئەمەش بەیارمەتی

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل (١٦٣,١٦٤)

[2] خدوری، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص٤٩,٥٠.

هاوڕێکانیان لەدەرەوەی بەغداد، بەڵام پێدەچێت جیاوازی لەبیرو ڕاکاندا دروست بووبێت، بەو پێودانگەی کە نەزعیم احمد شۆرش رادەگەیەنێت و نەئەفسەرانی ئازادیخوازیش لەبەغداد جوڵە دەکەن بۆ یارمەتی دانی( شەواف).[1]

## هەوڵی حەوتەم مایسی ١٩٥٨

بەپێی ئەم پلانە دەبوایە لە ١٩٥٨/٥/٢٩ شۆڕش ڕابگەیەنرایە، ئەمەش لەبۆنەی یادی دامەزراندنی کۆلیژی سەربازیلەبەغداد، (موقەدەم عەبدولغەنی ڕاوی) کەلەو کاتەدا لەبەصرە بووە، بڕوای وایە کەهەرسێ کەسەکەئامادەن و، لەپەلامارێکی غافڵگیردا دەتوانرێت عەبدولئیلاە و نوری سەعید لەناوببرێن، سەبارەت بە مەلیکیش، وابڕیار بووە کە داوای لێبکرێت سەرۆك وەزیران دەسنیشان بکات کەسوپا ناوەکەی دەخاتە بەردەستی، لەم پلانەدا ئەفسەرانی ئازادیخواز لەبەغداد یارمەتی داگیرکردنی شوێنە گرنگەکان دەدەن، بەڵام هەندێك لە ئەفسەرانی ئازادیخواز پێیان وابوو ئەم پلانە خۆکوژی و سەرشێتانەیە، و رازی نەبون لەسەری ئەنجام بدرێت، سەرەڕای ئەوەی (ڕاوی) پلانی وردی داڕشتبوو، گەرەنتی یارمەتی دانی هاوڕێکانی لەئەفسەرانی ئازادیخوازی خستبووە ئەستۆیەوە..[2]

## هەوڵی هەشتەم حوزەیرانی ١٩٥٨

ئەم پلانە لە ڕێپێوانی شەوانەدا خۆی دەبینییەوە کە لیوای ١٩ پێهەڵدەستا لەسەربازگەی مەنصور وسەرۆکەکەی عەبدولکەریم قاسم بوو لەگەڵ لیوای بیست لە جەلەولا، ئەم دوو لیوایە هەڵدەستان بە مەشقی شەوانە لەدەوروبەری بەغداد، پاشان بچنە سەربازگەیەکەوە لەناوچەی ئەبوو

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل(٥٠)

[2] خدوری، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص٥٠.

جسره و ئەبو صیدا پێش خۆرکەوتن، بەڵام دزە کردنی ئەم هەواڵەش لەمەبەستی ڕێپێوانی شەوانە و ناوەڕۆکەکەی گەیشتە ناوەندە باڵادەستەکان لەبەغداد، کەبەردەوام چاودێری ئەم کارەیان دەکرد، هەربۆیەش لیوای ۱۹ ناچار بوو تا ڕای خۆی بگۆڕێت وازی لی بهێنێت،و کارەکە بەشێوەیەکی سروشتی ئەنجام بدرێت..

پاش ئەم ڕوداوە هەریەك لەقاسم و عارف و عەبدولەتیف دەڕاجی، زیاتر بیرو ڕاکانیان نهێنی تر کردەوە تا لەهەر هەوڵێکی تردا ئەم جۆرە دەمگۆیان ڕوونەدات.[٣]

لەئەنجامی ئەو هەوڵانەوە بەدیار دەکەوێت، ئەفسەرانی ئازادیخواز کاروبارەکانیان بەدەر بووە لەهەماهەنگی و هیچ جۆرە مەرکەزییەتێکی کار لەناویاندا نەبووە، تاهەموولایەکیان پەیوەست بن پێوەی، لەهەمان کاتدا ئەوە بەدیار دەکەوێت کەبەردەوام لەژێر ترس و تۆقین دا بووبن، بەجۆرێك کارەکانیان لەچوارچێوەیەکی بەرتەسکدا بوووە و نەیانتوانیوە بەتەواوی زەمینەی بۆ برەخسێنن،

بەدەرلەمانەش ململانێی توند هەبووە لەسەر سەرکردایەتی کردنی شۆڕش و گرتنە ئەستۆی شۆڕش، تالەداهاتوودا ناوی خۆیان هەڵبگرێت، وپشکی شێریان هەبێت لەدەسەڵاتدا..لەسەرو هەموو ئەمانەشەوە هەندێك بیرو ڕاپێیان وایە ناکۆکی هەبووە لەنێوانیاندا لەسەرچارەنوسی بنەماڵەی پاشایەتی و بەتایبەتی خودی مەلیك فەیسەڵ کەلەدوایدا تاوانی قەتڵ و عام کردنیان دەخرایە ئەستۆی یەکترەوە..

---

[٣] الزبيدي، ليث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانية ، بغداد ١٩٨١ص١٦٩.

# چرکە ساتەکانی

# شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨

هەواڵـەکانی کاتـژمێر(١٠) شـەوی ١٣/١٤ی تـەموزی ١٩٥٨ بـەم هەواڵـە دەسـتی پێکرد:

" بەیارمەتی و چاودێری خوای گەورە سەرلەبەیانی سبەینێ دووشەمە ١٤/٧/١٩٥٨ جەلالـەتی مـەلیك فەیسـەڵی دووەم و وەلی عەهـدی ئـەمین سەردانی ئەستەنبوڵ دەکەن بۆ وت وێژ لەگەڵ فەخامەتی عەدنان مەندەریس سەرۆك وەزیرانی تورکیا، دەربارەی کۆبونەوەی ئەنجومەنی پەیمانی بەغداد کە بڕیار وایە لـەکۆتایی ئەم مانگـەدا لەلەندەن ببەسترێت، شایانی باسە ڕێزدار نوری سەعید سەرۆك وەزیـران و ژمارەیـەك لەگـەورە کەسایەتی‌یەکان هاوڕێیەتی جەلالەتی مەلیك دەکەن...) پاشان هەواڵـەکان هـەروەك شـەوانی تـر بەتـەعلیقێکی ڕۆژانـەکۆتایی هـات کەلەلایـەن (کـازم الحیـدری) دەخوێنرایـەوەو تێیـدا ڕەخنـەی لەسیاسـەتەکانی جـەمال عەبدولناصـر دەگرت.[١]

خەڵکی عێراق وەك هەموو شـەوەکانی تـر بـەئاوازی ئـەم جۆرە هـەواڵ و تەعلیقانـەوە، لەسـەر جێگـەی نوسـتنیان ڕادەکشـان و سـەرنجی ئاسمـانی تـەموزی بەغدادیان دەدا، تا چـەند سـاتێك بە هێمنـی و ئاسـودەیی پشـوو بـدەن، بێئاگـا لـەوەی لـە سـبەینێیەکی بەرەبەیانـدا سـەرجەمی شـتەکان دەگۆڕێن، ئـەوەی ئـەمڕۆ قەدەغـەو بڤـەو دژ بەدەسـەڵات بووە، ئـەوا سـبەینێ دەبێتە شـۆڕش و نەبـەردی و ئازایـەتی، سـبەینێیەك ڕەوتـی ژیـانی سیاسی

---

[١] العلوی، حسن، عبدالکریم قاسم رؤیة بعد العشرین، منشورات دار الزوراء، لندن، ١٩٨٣ص١٦.

وحوكمی وولات لەبنەڕەتەوە دەگۆڕێت، عێراقی بۆیاخ کراو بە پاشا و وەلی عەهد و دەست وپێوەندەکەی، دەگۆڕێت بە عێراقێکی کۆماری کەتا ئێستا ڕەوتی سروشتی خۆی وەرنەگرتووە، بێئاگا لەوەی ئەوەی لە داهاتوویەکی نزیکدا دەگوزەرێ، لەهەناویدا زۆرێك لەمەرگەسات و ئازاریش لەگەڵ خۆیدا دێنێ.

هەر لەوشەوەدا وپێش جوڵەکردنی هێزەکەی، عەبدولسەلام عارفیش دەست دەداتە قورئانەکەی و دەیکاتەوە، دەچێتە سەرسورەتی(الانبیاء) و دەست دەکات بە خوێندنەوەی کەبەم ئایەتە دەست پێدەکات (اِقتَرَبَ لِلنَاسِ حِسَابُهُم وَهُم فِي غَفلَةٍ مُعرِضُون...) لێرەشەوە گۆڕانکارییەکان دەستیان پێکرد، هەنگاو بەرەو بارێکی نوێ نرا، ئاخۆ دەبێت ئەو بارە چۆن گوزەرا بێت؟

بیرۆکەی شۆڕش و کودەتای سەربازیشتێکی تازە نەبوو لەو ئان ساتەدا بەلای سوپای عێراقییەوە، چونکە لەساڵی ١٩٣٦ دا بۆ یەکەمین جار لەمێژووی عێراق و سەرجەم وولاتانی عەربیدا بەکر صدقی کودەتایەکی ئەنجام دا، بەڵام ئەو کات سیستمی پاشایەتی و دەسەڵاتەکەی نەکرابووە ئامانج تا وەلا بخرێن، بەڵکو تەنها ئامانجی گۆڕینی حکومەتێك بوو بەحکومەتێکی تر، ساڵی ١٩٤١ یش ڕەشید عالی گەیلانی پێشەوایەتی بزوتنەوەیەکی کرد کەناوی خۆی هەڵگرتبوو، بەڵام لەم جارەیاندا تاڕادەیەك سنوری بزوتنەوەکە بەرفراوان بوو تائەوەبوو کەهەریەك لە عەبدولئیلاه و نوری سەعید هەڵاتن و هەژمونی بەریتانی خەریك بوو دەسڕایەوە، ناچار بەریتانیا لەبەرامبەردا کەوتە جەنگەڕە لەگەڵ بزوتنەوەکە داو لەئاکامیشدا

بزوتنەوەکەی سەرکوت کردن. ئەمەش لەو کاتەدا پەیامێك بوو بۆ ئەوانەی کە دژایەتی بەرژوەندی بەریتانیایان دەکرد لە عێراقدا..

سوپای عێراقی لەو کاتەدا لە (٤) تیپ(الفرقە) پێك هاتبوون، کەدابەش بووبوون بەسەر باکورو باشوردا، هێزی پێویست لەبەغدا نەبوو بۆ جێبەجێکردنی کودەتا، تەنها چەند قوتابخانەیەکی سەربازی و کۆلیژی سەربازی و یەکەی مەشقی تەکنیکی نەبێت، جگە لەمانەش لیوایەکی پاسەوانی هەبوو لەپایتەختدا، لەبەر ئەوە لیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخواز بڕیاریان دابوو سود لەهەر یەکەو تیپێکی وەربگیرێت کەسەر بەئەفسەرانی ئازادیخوازبن وبەبەغدادا تێپەڕ بن .[1]

هەرچەند تا سەرەتای ١٩٥٨ هیچ جۆرە پلانێکی ڕێك و پێك وگونجاو دانەنرابوو بۆ ئەنجام دانی شۆڕش، چونکە لەوکاتەدا زیاتر سەرقاڵی ڕێکەوتن بوون لەسەر دیاری کردنی (کاتیشۆڕش).. سەرەڕای ئەوەی هەندێکیان پەلەیان لەکارەکە دەکرد، بەڵام هەندێکی تریان هێمن و لەسەرخۆ بیریان لەمەسەلەکە دەکردەوە، چونکە هەڵگرتنی هەر هەنگاوێکی هەڵە ئەوا بێگومان بەخراپ بەسەریاندا دەشکایەوە.. تائەوەبوو لە هاوینی ١٩٥٨دا هەواڵی ئەوە بڵاوبووبوویەوە کەعێراق لەبەردەم شۆڕشێکی چاوەڕوان کراودایە، لەو هەل ومەرجەشدا ئەفسەرانیش ناچار بوون بکەونە خۆو پلانی بۆ دابڕێژن، ئەوەشی کە زەمینەی ئەم پلان دانانەی خۆشکرد، بریتی بوو لەو هەلەی بۆیانڕەخسا، ئەویش دەرکردنی بڕیارێکی دەستەی ئەرکانی سوپا بوو لە ١٩٥٨/٧/١دا، کەتێیدا فەرمان دەکات بە لیوای بیست کەلەسەربازگەی جەلەولابوون (لە سەرڕوباری دیجلە لەباکوری ڕۆژهەڵاتی

---

[1] کەناڵی ئاسمانی ئەبوو زەبی بەرنامەی (بین الزمنین) ئامادەو پیشکەش کردنی (احمد مهنا).

بەغـداد) تـاڕۆژی ١٩٥٨/٧/١٤ بـەرەو ئـوردون بكشـێن بەسـەركردایەتی فەرماندەی لیـوا(زعـیم احمد حقـی)[2] ئەمەش بەمەبەسـتی پاڵپشتی ئوردون لەبەرامبـەر هەڕەشـەكانی ئیسـرائیلدا، لـەم نێوەشـدا عەبدولسـەلام عـارف جێگـری فەرمانـدەی لیـوای بیسـت، هەڵدەسـتێ بەئەنجام دانـی ڕێكـەوتنێك لەگـەڵ عەبدولكـەریم قاسـم كەفەرمانـدەی لیـوای ١٩بـووە،لەسـەربازگەی مەنصـور لـەنزیك بەغـداد، بـەوەی كـە عـارف لیـوای بیسـت بەئاراسـتەی داگیركردنی بەغدادا بیبات ، لەبری ئەوەی بـەرەو ئوردون بكشێت، لەهـەمان كاتـدا قـاسمیش لـەلیوای ١٩ پارێزگـاری پشـتەوەی هێزەكـەی عـارف بكـات لەكاتی كشانی بەرەو بەغداد، لەسەر ئەم بنەمایەش پلانەكە داڕێژرا..

لەئەنجامدا بەدیار كەوت كەهەوڵی شۆرش لەو ئان وساتەدا زۆر گونجاو بوو، بەو مەرجەی هەرسێ كەسایەتی دەسـەڵاتدارلەو كاتـەدا لەبەغـداد بـن، عەبدولكـەریم قاسـم و هاوڕێكـانی لەسـەربازگەی مەنصـور بڕیاریـان لەسـەر پلانەكەدا بوو لەو كاتەداو ڕێكەتبوون لەسەر كاتەكەشی..

لـە٤ی تـەموز واتـە چـوار ڕۆژ پـاش دەرچـونی فەرمانەكـەی دەسـتەی ئـەركانی سـوپا، قاسـم گەیشـتە بەغـداد و كۆبونەوەیـەكی لەهـەمان ڕۆژدا بـەرێكخراوی مەركـەزی بەغدادكرد [3]لەماڵەكـەی خۆیـدا، و تێیـدا (٧)ئەفسـەر

---

[2] خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر -- قم ١٩٩٧ ، ص٦١,٦٠.

[3] هەندێك سەرچاوە ئامـاژە بـەوە دەدەن كەهـەر ڕۆژی ١٩٥٨/٧/١ ، پـاش دەرچـوونی بڕیارەكـە بەگواسـتنەوەی لیوای بیست بەرەو ئوردون، هەندێك ڕاوێژ و بیرو ڕاگۆڕینەوە ئەنجام دراوە لەنێوان ژمارەیەك لەئەندامانی لیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخوازدا، و پێدەچێت قاسم و عارف كۆبونـەوەو تـاوتوێی مەسـەلەكەیان بـەدڵ نـەبووبێت، هەربۆیەش كۆبونەوەكە دوادەخرێت بۆ ڕۆژی ١٩٥٨/٧/٤ لەماڵی قاسم ، لەكاتی ئـەنجام دانـی كۆبونەوەكـەدا، فازڵ عەباس مەهداوی كوڕی خاڵی قاسم بـەخێرایی خۆی دەكـات بـەماڵی قاسـمداو پێیـان دەڵێـت كـەدەزگای ئیستخباراتی سەربازی بەكۆبونەوەكەی زانیوە، بەم جۆرەش ئەندامانی كۆبونەوەكە هەربەخێرایی بڵاوەی لێدەكەن، بێئاگا لەوەی كە قاسم یاری پێكردون و هیچ جۆرە ڕاستی یەك لەم مەسـەلەدا نیە، بەم جۆرەش وادەی شـۆڕش و چۆنیەتی ئەنجام دانی بەتەواوی تێك دەچێت و لیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخواز بێئاگادەبن لـە پلانەكـە، لـەم نێوەشدا تەنها قاسم و عارف و عەبدولەتیف دەراجی دەمێننەوەو لـەنێوان خۆیانـدا سـوێند دەخـۆن بـۆ یـەكتری

لەکۆی (١٥) ئەندامی لیژنەی باڵا ئامادەبوون، کەبریتی بوون لە (عەبدولکەریم قاسم سەرۆك و ئەندامێتی ناجی تاڵب، محی الدین عەبدولحەمید، عەبدولوەهاب ئەمین، عەبدولوەهاب شەواف، تاهر یحیی، محمد السبع)لەو کۆبونەوەیەدا بڕیار لەسەر جێبەجێکردنی پلانەکە درا کەناسراو بوو بە (کردەی هەڵۆ)و لەدوایدا گۆڕا بە ١٤ی تەموز، ئەوانی دیکەی ئەفسەرانی ئازادیخواز زانیارییان نەبوو لەسەر پلانەکە و کاتی جێبەجێکردنەکەی، هەرچەند هەندێك لا سنورداركردنی وادەی جێبەجێکردنەکە بۆ مەترسی دزە کردن دەگەڕێننەوە، تەنانەت پێش سەعاتی سفر هەریەك لەقاسم و عارف وابلاویان کردبووە کەپلانەکەیان ئاشکرا بوەو چیدی (کردەی هەڵۆ) ئەنجام نادرێ، دیارە لەم کارەشیاندا ویستویانە تەنها خۆیان هەستن بە کارەکە،لیوا روکن عەبدولکەریم فەرحان لە یادداشتەکانیدا دەڵێت:پاش ئەوەی لە نێوان ئەفسەرانی لیژنەی باڵادا قسەو باس لەسەر ئەوە دەکرا کەشۆڕش لەم جارەیاندا ئەنجام دەدرێت، عەبدولسەلام عارف وای بلاو کردبووە کەبەرەو ئوردون دەچێت و بەلیژنەی باڵای ڕاگەیاندبوو کە ئەو فەرمانەی بۆی دەرچووە جێبەجێدەکات، چونکە ئەو فەرماندەیەکی لیوای هەیە، لەڕاستیدا هێزی پێویست بۆ ئەنجام دانی کارەکە، بەتایبەت پاش پەیوەندی کردنی کەتیبەی زرێپۆشەکان بەلیواکەیەوە پلانەکە ئاسان بوو، تەنها دیاری کردنی ئەرك و فەرمانەکانی دەویست، بەڵام بەدیار کەوت لەنێوان هەریەك لە قاسم و عارفدا ڕێکەوتن

---

لەسەر پاراستنی نهێنی وادەی شۆڕشەکەیان، کە ئاشکرایە ئەم حاڵەتە زیاتر مەبەست پێی دزینی وادەی شۆڕش و خۆبەخاوەن زانینی شۆڕش و لەدوایدا دەست گرتن بەسەر حوکمدا و دوورخستنەوەی هاوڕێکانیان لەپۆستە زۆر گرنگەکان بوو.(سەرچاوە: ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق، تألیف لیث عبدالحسن الزبیدی، لەگەڵ کەناڵی ئەبو زەبی ئاسمانی بەرنامەی (بین الزمنین) ئامادەو پێشکەش کردنی احمد مهنا)

هەیە و بەنهێنی ئەو ڕێکەتنەشیان شاردۆتەوە تالیژنەی باڵا تێیدا بەشدار نەبن و لەدوایدا داوای جێ بەجێکردنی ئەو بڕیارانە بکەن کەپێش وەخت داویانە، چونکە ئەم دوو کەسە بڕوایان وابوو گەر بێتو شۆڕش بکەن ئەوا لیژنەی باڵا پشتگیری شۆڕش دەکەن، ئیتر ئایا سەرکەوتوو بێت یان نا.. لەدوایشدا هەرئەمە ڕوویدا.[1] هەربۆیەش کاتێك لەبەرەبەیانی ١٤ی تەموز کەشۆڕش ئەنجام دراو سوپا هاتبووە نێو بەغدادەوە، زۆرێك لەئەفسەرانی ئازادیخواز توشی سەرسوڕمان بوون لەم کارەو تەنانەت بوو بەمایەی چەندان کێشەی تر، لەگەڵ ئەوەی تێبینی کرابوو کە عارف و قاسم پاش دەرچوونی بڕیارەکەی دەستەی ئەرکان، تا ١٤ی تەموز جموجوڵی زۆریان پێوە بەدی کراوە.[2]

لەیاداشتەکانیدا فوئاد عارف دەڵێت: ڕۆژی پێنج شەممە ١٩٥٨/٧/١٠ واتە چوار ڕۆژ پێش ڕوودانی شۆڕش، هەریەك لەقاسم و عارفم بینی لەوەزارەتی بەرگریدا، لەوکاتەدا من فەرماندەی لیوای (٩) بووم، عەبدولکەریم قاسم پرسیاری (ئەنوەر سامر) بەڕێوەبەری ئەمنی ناوچەی (حلە)ی لێ کردم ...منیش پێم ووت: کەسێکی زۆر باشە، لەدوایدا زانیم کەئەم کەسە یەکێك بووە لە نزیکەکانی عارف، پاشان پیی وتم لەم ڕۆژانەدا هەواڵی گەرم دەبیستیت، پاشان داوای لێکردم کەنانی نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی ١٩٥٨/٧/١١ لەماڵی قاسم بخۆم، بەڵام کاتێك لەڕێگەدا کەگەڕامەوە بیرم کەوتەوە کەمن دەعوەتی عەبدولکەریم قاسم بووم، بەڵام لەدەستم

---

[1] فرحان، اللواء الركن عبدالكريم ، ثورة ١٤تموز فى العراق، الجزء الاول، ص٩١,٩٠ ، مؤسسة الكتاب العربى للدراسات والترجمة والنشر، باريس، ١٩٨٦

[2] خدوري، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير -- قم ١٩٩٧ ، ص٦١.

دەرچووبوو[1]. ئەمەش نیشانەی ئەو ڕاستی‌یەیە کەقاسم و عارف خولیای شۆڕش لەبیریاندا بووە، بەڵام کاتی ئەنجام دانەکەیان پاراستوە لای خۆیان، بەم جۆرەش ئامادەگی بۆ ئەنجام دانی شۆڕش گیرایە بەر، لەوانەش:

١- دانانی وردەکاری پێویست بۆ ئەنجام دانی شۆڕش.

٢- داڕشتنی ئەو بەلاغانەی کە پێویست بوو پاش شۆڕش بخوێنرێنەوە.

٣- دیاری کردنی ئەو کەسانەی لە دوایدا پۆستی وەزاری دەگرنە دەست.

٤- دابەش کردنی پۆست و پلە و دەسەڵاتەکانی حکومەتی داهاتوو لەنێوان خۆیاندا..

ئەم کارانەش بێ‌گەڕانەوە بۆ مەرجەعی ڕێکخراوی مەرکەزی ئەفسەرانی ئازادیخواز ئەنجام دران و خۆیان بەتەنها کردە خاوەنی شۆڕەکە. تەنانەت پاش سەرکەوتنی شۆڕشیش بەهەمان عەقڵەوە کاریان کردووە...

## کشان بەرەو بەغداد

قاسم و عارف پلانی جێ بەجێ‌کردنی شۆڕشیان بەوردی داڕشت، لیوای (٢٠) ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەرانی ئازادیخوازی تێدابوو هەرچەند (زەعیم روکن ئەحمەد حقی محمد علی )سەر بەئەفسەرانی ئازادیخواز نەبوو، بەڵام بەرەو ئەوە دەچوو کەبێتە نێو ڕیزی ئەم ڕێکخراوەوە وبۆ ئەم مەبەستەش (نازم تەبەقچەلی) یان (محی الدین عبدالحمید) راسپێرابوو تالەم بارەوە قسەی لەگەڵ بکەن، چونکە ئەم دوو کەسە پیوەندی پتەویان لەگەڵیدا

---

[1] عارف، فؤاد، مذكرات، تعليق د.كمال مظهر، ص١٧٥.

هەبوو،بەڵام هاتنە پێشەوەی ئەم هەلە بواری ئەم کارەی نەدا[٢]، لەچوار چێوەی پلانەکەشدا بڕیار وابوو( زعیم روکن ئەحمەد حقی) لەلایەن ئەفسەرانی لیواکەیەوە ناچاربکرێت تابەرەو فەلوجە بکشێ و لەوێ خواحافیزیان لێ بکات، ئەمەش لەڕێگەی چونیان بەرەو ئوردون..

لیواکەی احمد حقی پێك دەهات لە :

کەتیبەی یەکەم بەسەرکردەیی سەرهەنگ عەبدولەتیف دەراجی.

کەتیبەی دووەم بەسەرکردەیی سەرهەنگ یاسین محمد رەوف.

کەتیبەی سێیەم بەسەرکردەیی سەرهەنگ عەبدولسەلام عارف.

بەڵام (یاسین محمد رەئوف) ئەندامی ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخواز نەبوو، هەربۆیەش بڕیاری دەستگیرکردنی درا لەلایەن عارف و دەراجییەوە، ئەمەش لەڕێگەی چوون بەرەو بەغدا و لەحاڵەتێکدا گەر رازی نەبوو لەسەر هاوکاری کردنیان، بەدەر لەم گرفتە یەکێکی تر لەو گرفتە سەرەکییانەیکەدەبوایە قاسم و عارف چارەسەریارن بکردایە گرفتی دابین کردنی چەك و تەقەمەنی بوو، چونکە لەسیستمی پەیڕەکراوی سەربازی سوپای عێراقیدا، ڕێگە نەدەدرا کەتەقەمەنی بدرێت بەئەفسەرەکان مەگەر بە دەرچوونی فەرمانێك نەبوایە لەم بارەوە و لەلایەن دەسەڵاتی باڵای سەربازییەوە، بەڵام عارف توانی تەقەمەنی پێویست دەست بخات و پارێزگاری لێبکات وبەشێوەیەکی نهێنی بیهێڵێتەوە تاڕۆژی ١٤ی تەموز کە دەبوایە جوڵەی تێدا بکرایە..[٣]

بۆسەرخستنی پلانەکەش ئەم هەنگاوانە گیرانە بەر:

---

٢ فرحان، اللواء الركن عبدالكريم ، ثورة ١٤تموز فى العراق، الجزء الاول، ص٩٠، مؤسسة الكتاب العربى للدراسات والترجمة والنشر، باريس، ١٩٨٦

٣ خدورى، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص٦٢،٦٣.

**هەنگاوی یەکەم**: چەواشەکرنی زعیم احمد حقی، تاڕێگەیان پێ بدات خۆیان جوڵە بکەن و دڵنیای بکەنەوە لەوەی فەرمانەکە بەڕێك وپێکی جێ بەجێ دەکرێت، هێزەکە پێشڕەوی پێ دەکەن بەرەو فەلوجە بەبەغدادا و پاشان لەوێشەوە بەرەو ئوردون.

**هەنگاوی دووم** : داوا بکرێت لە زعیم احمد حقی تا لەگەل بەشی یەکەمی هێزەکە بڕوات کەلە فەلوجە دەوەستن و چاوەڕێی پاشماوەی هێزەکە بکەن.

**هەنگاوی سێیەم**: چەواشە کردنی زعیم احمد حقی لەسەر دواکەوتنی هێزەکەو دروست کردنی هەندێك بیانوو بەڵگەی واقیعی تا هیچ جۆرە گومانێك دروست نەبێت لەسەر دواکەوتنی هێزەکە..

**هەنگاوی چوارەم**: لەکاتی ئەنجام دانی جولانەوەکە نابێت زعیم احمد حقیهەر بەخێرایی دەستگیر بکرێت، نەبادا هەواڵی جولانەوەکە هەر لەسەرەتاوە دزە بکات بۆ لایەنە بەرپرسەکانی سەرەوەو هەوڵی سەرکوتی جولانەوەکە بدەن لەقۆناغی سەرەتایدا.

**هەنگاوی پێنجەم**: لیوای ١٩ کە فەرماندەکەی عەبدولکەریم قاسمە ئەرکی پاراستنیپشتەوەی هێزەکەی دەکەوێتە ئەستۆ کە بەرەو بەغداد دەکشێت، لەگەڵ دەستگیر کردنی لیوا غازی داغستانی سەرکردەی تیپی (سێیەم)..

**هەنگاوی شەشەم**: ئاگادار نەکردنەوەی ئەو هێزەی کە بەرەو ئوردون کشاوە لە جولانەوەکە تا بەتەواوی جولانەوەکە سەردەکەوێت ئەمەش لەپێناو دزە نەکردنیهەواڵەکە..

**هەنگاوی حەوتەم**: ئاگادار کردنەوەی ئەفسەرانی ئازادیخواز بۆ هەستان بەجێ بەجێ کردنی ئەرکی خۆی لەناو بەغداد کەپێشتر بۆی دیاری کراوە،

بەدەر لەو ئەفسەرە دیاری کراوانە، نابێت هیچ ئەفسەرێکی تر ئاگادار بکرێت، ئەمەش دیسانەوە بۆ پاراستنی نهێنیکارەکە.[1]

لەڕۆژی ١٣ ی تەموز قاسم وعارف سەردانێکی کوت پڕی بەغداد دەکەنەوە، بەڵام جگە لە هەندێك کەس نەبێت کەخۆیان دیارییان کردبوو، وادەی شۆڕشەکەیان بەکەس ڕانەگەیاند، لەگەڵ ئەوەی زۆر کەس چاوەڕوانی ڕودانی شۆڕشیان دەکرد..

لەسەعات (٩) شەوی ١٩٥٨/٧/١٣ لیوای (٢٠) بەسەرکردایەتی زعیم احمد حقی جوڵەی کردبەئاراستەی بەغداد لەسەربازگەی جەلەلاوە، کەکەوتبوویە دووری ١٠٠کم لە باکوری ڕۆژهەڵاتی بەغداد، تابەرەو فەلوجە بکشێن، هەرچەند لیوای(١٩) بەسەرکردایەتی عەبدولکەریم قاسم هیچ جۆرە فەرمانێکی بۆ دەرنەچوو بوو تا پەیوەندی بکات بە لیواکەی احمد حقیەوە، بەڵام قاسم بەڕێکەوتنی لەگەڵ عارف بەوردی چاو دێری جوڵەکەی دەکردو پەیمانیدا لەحاڵەتی پێویستدا بە هانای هێزەکەی عارفەوە بێت..

هەرهێندەی هێزەکەی عەبدولسەلام عارف گەیشتە سەنتەری (کاسل پۆست) لەدوری ٣٠ کم لە بەغدادەوە ، ئیتر سەرەداوەکانی شۆڕش دەرکەوتن، چونکە زعیم احمد حقی لەبەغداد دەرچووبوو، لەڕێگەی فەلوجەدا بوو، لەهەمان کاتیشدا عقید یاسین محمد ڕەوف، دەستگیرکرا، لەبەر ئەوەی ئامادەنەبوو هاوکارییان لەگەلدا بکات، لەشوێنی ناوبراویشدا عادل جلال دانرا(کەئەفسەرێکی کورد بوو)، عەبدولسەلام عارفیش بووبە سەرکردەی لیوای بیست لەوبەشەی کەمابوولەژێر دەستیدا، عەبدولەتیف دەراجیش بوو بە جێگری عارف پاش دەستگرتنی بەسەر بەغدادا، و ئەرکی

١ الزبيدي، ليث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانية ، بغداد ١٩٨١ص١٨٢.

دەستگرتن بەسەر خانەی ڕادیۆ و ڕاگەیاندنی کۆماری عێراقی خستە ئەستۆی خۆی، پاشان موقەدەم فازڵ محمد عەلی کردە سەرکردەی کەتیبەی سێ کەیەکێك بوو لە ئەندامانی ئەفسەرانی ئازادیخواز، ، عارف وەك فەرماندەی لیوای (٢٠) یش هەموو ئەم تەعلیماتانەی دەرکرد:

١-پێویستە لەسەر کەتیبەی دوو، کەسەرکردەکەی عادل جلال بوو، مەرکەزی وەزارەتی بەرگری داگیر بکات، لەگەڵ دیوانی مەلەکی لە شەقامی (الاعظمیة)و جوڵەی پاسەوانی مەلەکی پەك بخەن.

٢-پێویست بوو لەسەر کەتیبەی سێ کەسەرکردەکەی فازل محمد علی بوو لە دیجلەوە بپەڕێتەوە بۆ کەرخ ، کە(بەشی ڕۆژئاوایی بەغدادە)و لەوێ بەهاوکاری عقید عبدالرحمن عارف، برای عەبدولسەلام عارف لە سەربازگەی (الوشاویش)ئەوانیش بەهاوکاری لەگەڵ ئەو هێزەی کەلەکۆلیژی پیادەدایە و لەنێویشیاندا رائد عەبدولستار العبوسی کەیەکێك بوو لە ئەفسەرانی ئازادیخواز، هاوکاری یەکتر بکەن و کارەکان ڕاپەڕێنن.

لەسەعات (٤) سپێدەی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨، پاش ئەوەی عارف بەتەواوی پلانەکەی لەکاسل پۆست داڕشتبوو، دەستی دایە دابەش کردنی تەقەمەنی بەسەر هێزەکەیدا و بەرەو بەغداد کشان، لەماوەی نیو سەعاتدا چوونە ناو بەغدادەوە و بەرە ناوجەرگەی شار کشان، لەسەعات (٥) دا لەدیجلە پەڕینەوە بەرەو بینایەی رادیۆو داگیری کرد [١] هەرئەوێشی کردە سەنتەری سەرکردایەتی کردنی خۆی، و چاوەڕوانیکرد تاپەخشی رادێویی

---

[١] لەپلانی شۆرشدا ئاماژە نەدرابوویە داگیر کردنی ئەنتێنەکانی پەخشی ڕادیۆکە لە ئەبوغرێب بوون، عارف تەنها بینایەی ڕادیۆکەی داگیرکردبوو لە صالحیە، هیچ یەك لە ئەفسەرانی ئازادیخواز بیریان بەلای ئەوەدا نەڕۆشتبوو کەچارەنوسی شۆرشەکەیان بەندە بەو چەند زمانانەی کەلە ئەنتێنەکانی پەخشی ئەبوغرێبدا هەبوو، بەڕاستی دەستی قەدەر هاوڕای کارەکە بوو ، چونکە هیچ یەك لە لایەنگرانی دەسەڵاتی پاشایەتی نەگەیشتبوونە ئەو ئەنتێنانە تابیپچڕن و پەخشی رادیۆ ڕابوەستێت.. سەرچاوە: ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق، تألیف لیث عبدالحسن الزبیدی، ص١٩٣

کرایەوە ، ئەوکات دەستی دایە خوێندنەوەی بەیانی یەکەمی شۆڕش بەدەنگی خۆی و هانی خەڵکی و پارتەسیاسییەکانی دەدا تابڕژێنە سەرشەقامەکان وپشتگیری شۆڕش بکەن. بەم جۆرە عارف لەڕادیۆوە دەیوت( ئەمە شۆرشەکەتانە، بنەماڵەی پاشایەتی لەناوبران، ڕژێمی پاشایەتی هەرەسی هێنا، لەگەڵ هەرسیشیدا، هەموو خراپە وگەندەڵییەکانیش هەرەسیان هێنا..)

لەلایەن خۆشیەوە قاسم چاوەڕوانی ئاکامی جوڵانەوەکە بوو، ئەو هێشتا فەرماندەی لیوای (١٩) بوو، بەڵام کاتێك عارف دەستی گرت بەسەر بەغدادا، بەفیعلی قاسم سەرکردایەتی هێزەکانیشۆڕشی گرتە دەست، ئامادەبوو پشتەوەی هێزەکانی شۆڕش بپارێزێ، لەهەرجۆرە مەترسییەکی پەلاماردان، کاتێکیش بەرەو بەغداد کشا لەناوسەیارەکەیدا گوێی لەدەنگی عەبدولسەلامەوە بوو کە هەواڵی هەرەسی دەسەلاتی پاشایەتی ڕادەگەیاند، بەیاننامەی دامەزراندنی کۆماری عێراقی دەخوێندەوە، هەربۆیەش عەبدولکەریم بەخێرایی بەرو بەغداد کشا، چونکە بەتەواویبەغداد گیرابوو، سەرەتا سەردانی ڕادیۆی کردو چاوی کەوت بە عەبدولسەلام عارف، پاش دەست خۆشی لێ کردنی بەرەو بارەگای وەزارەتی بەرگری ڕۆشت و کردییە بارەگای خۆی..

دەگونجێت لەو کاتەدا قاسم هەستی بەجۆرێك نیگەرانیکردبێت کەئەفسەرێکی لە خۆی خوارتر، توانیویەتی بەو جۆرە بەغداد بگرێت و سەربکەوێت، لەکاتێکدا دەیتوانی هەرخۆی بەهێزەکەیەوە هەمان کار بکات، زۆر لا ئەوە بەدوور نازانن کە هۆکارێکی سەرەکی بوبێت لەململانێ نێوان هەردوو قاسم وعارفدا کەلەدوایدا ڕویدا.[٢]

---

[٢] خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر – قم ١٩٩٧ ، ص٦٣,٦٤,٦٥,٦٦.

## چەند بڕگەیەك لە

### بەیانی یەکەمی شۆڕش

*گەلی عێراقی بەڕێز..*

*پاش پشت بەستن بە خوای گەورەو پاڵپشتی دڵسۆزان لە رۆڵەکانی گەل و هێزە نیشتنمانی‌یە چەکدارەکان، هەنگاومان هەڵگرت بۆرزگارکردنی نیشتمانە خۆشەویستەکەمان لەژێر دەسەڵاتی خراپەکاری کەئیستیعمار سەپاندویەتی بەسەر گەلەکەمانەوە تاحوکمی بکات و یاری بەموقەدەراتەکانی بکات لە پێناو بەرژەوەندی خۆیان و گەیشتن بەبەرژەوەندییە شەخصییەکانیان..*

*برایان!*

*سوپا لە ئێوەیەو بۆ ئێوەیە، واهەستاوە بەوەی دەتانەوێت، ئەویش راماڵینی ستەمکارانە کەسوکایەتی‌یان بە مافی گەلەکەمان دەکرد، ئەوەی لەسەرتانە ئەوەیە کەپشتی بگرن و سەری بخەن، یارمەتی بدەن لە ئاراستە کردنی گوللە و بۆمبەکان بەسەر کۆشکی رێحاب و کۆشکی نوری سەعیدا..*

لەبەشێکی تری بەیاننامەدا هاتووە: *دەخوازین هەمولایەکمان یەک دەست بین لە سلێمانیەوە تا رگبە و لەزاخۆوە تا فاو ، بۆئەوەی عێراق یەک دەست بێت بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەو تاوانبارانەداو رزگار بون لەشەڕیان..*

لەکۆتایی بەیاننامەکەشدا هاتووە: بەڕاستی سوێندمان خواردووە، کەخوێنمان و ئەوەی بەلامانەوە ئازیزە، لەپێناوتاندا ببەخشین، لەبەر ئەوە ئێوەش متمانەتان هەبێت و دڵنیابن کە ئێمە درێژە بە کارەکانمان دەدەین لەپێناو ئێوەداو پێویستە حوکم بگەڕێتەوە بۆ دەسەڵاتێک کە لەگەلەوە سەرچاوەی گرتبێت و هەڵقولابێت و لەسەرخواستی گەل بڕوات، ئەمەش ئەنجام نادرێت،

تەنهابەدامەزراندنی کۆمارێکی میللی نەبێت کەدەستی گرتبێت بەیەکێتی تەواوی خاکیعێراقـەوە و پەیوەنـدی برایانەشـی هـەبێت لەگـەڵ وڵاتـانی تـری عـەرەبی وئیسـلامی و کـار بەبنـەماکانی نەتەوەیـەکگرتوەکان بکـات و ئیلتیزامـی هـەبێت بەپەیماننامـەو پرۆتۆکۆلەکانـەوە بـەپێی بەرژەوەنـدی نیشـتمانی و بڕیارەکـانی کـۆنگرەی بانـدۆک ، وپێویسـتە هـەر لەئێسـتاوە حکومـەتی نیشـتمانی ناوبنرێـت بەکۆماری عێراق، و لەپێناو جێبەجێکردنیخواستیگەلیش ، سەرۆکایەتییەکەمان سـپاردووە بەشـێوەیەکی کـاتی بـە ئەنجومـەنی سـیادە، کەمومارەسـەی دەسەڵاتەکانی سەرۆک کۆمار دەکات، تا هێندەی ریفراندۆمێک ئەنجام دەدرێت و گەل سەرۆک دیاریدەکات..

داواکارین لە خوایگەورە سەرکەوتومان بکات لە کارکردنمان بۆ خزمەتی نیشتمانی ئازیزمان، هەر خوای گەورە بیسەرو وەڵامدەرەوەیە..

لەبری سەرکردەی گشتی

هێزە نیشتـمانییە چەکدارەکان

بەغداد، ٢٦ ژی الحجه ١٣٧٧

## شۆڕش یان کودەتا

پێش ئەوەی بچمە ناو وەڵامی ئەو پرسیارەی ئایا ئەوەی لە ١٩٥٨/٧/١٤ دا ڕویدا شۆڕش بوو یان کودەتا، بەپێویستی دەزانم پێناسەی هەریەك لە چەمکی (کودەتا) و (شۆڕش) بکەم..

**کودەتا**: گۆڕانکاریەکی کوت پڕو یەکلاکەرەوەیە لەحکومەتدا، بەهۆی دەستێوەردانی سوپاوە، یان هەندێك لەپێکهاتەکانی سوپاوە، دێتە کایەوەو تێیدا هێزبەکاردەهێنرێت، یان ترساندن بەهەڕەشەی بەکارهێنانی هێز، وەك کودەتاکەی ناپلیۆن پۆناپارت لەساڵی ١٧٩٩، لۆی ناپلیۆن لەساڵی ١٨٥١، پاش کودەتا ڕیفراندۆمی گشتی ئەنجام دەدرێت کەمەبەستی شەرعیەت دانە بەو واقعەی کەهاتۆتە ئاراوە.[1]

**شۆڕش**: گۆڕانکاری جەوهەری‌یە لە بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەوڵەتێکی دیاری کراودا، لەم کارەشدا جەماوەر ڕۆڵی سەرەکی تێدا دەگێڕێ، ئامانجی گۆڕانی جەوهەری‌یە لەسیستمی سیاسی یان کۆمەڵایەتی ئەو دەوڵەتەدا، لەسەرکەوتنی شۆڕشدا دەستور دەگۆڕێت لەگەڵ ڕژێمی حوکمڕاندا، بەڵام شەخصیەتی دەوڵەت دەستکاری ناکرێت و نابێتە مایەی هەرەس هێنانی ئیلتیزامە نێودەوڵەتی‌یەکانی، لەبەناوبانگترین شۆڕشەکان شۆڕشی فەرەنسای ساڵی ١٧٨٩یە.[2]

بۆزیاتر ڕوو نکردنەوەی ئەو حاڵەتەی کەلە ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ دا هاتە ئاراوە دەکرێت هەڵسەنگاندنێکی کورت بکەین لەنێوان ناوەڕۆکی کودەتاو ناوەڕۆکی شۆڕشدا، تابزانین ئاخۆ ئەوەی ڕوویدا شۆڕش بوو یان کودەتا..

---

[1] المسيري، عبدالوهاب، (الموسوعة السياية) الطبعة الاولى ، مارس ١٩٧٤،ص٩١.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل(٧٥).

## جیاوازی نێوان کودەتاو شۆڕش

| شۆڕش | کودەتا |
| --- | --- |
| ١-گۆڕانێکی جەوهەریە لە بارودۆخی سیاسیو کۆمەڵایەتی وولاتێکدا. | ١-گۆڕانی کوت وپڕو یەکلا کەرەوەیە لەحکومەت و سیستمی فەرمانڕەوایی وڵاتدا. |
| ٢-جەماوەر لەگەڵ هێزە سیاسییەکاندا پێی هەڵدەستن. | ٢-سوپا یان بەشێك لەسوپا، یان هەندێك گەورە کاربەدەستی وڵات پێی هەڵدەستێ |
| ٣-ئامانجی گۆڕانی جەوهەرییە لە سیستمی سیاسی یان کۆمەڵایەتی ، بێدەستکاری شەخصیەتی دەوڵەت. | ٣-ئامانجی گۆڕانکارییە لەدابەش بوونی دەسەڵاتی سیاسیودەستە فەرمانڕەوا جیاوازەکان یان کەسە جیاوازەکان. |
| ٤-سروشتی ڕێپێوان و پەنابردنە بەر هۆکاری سیاسی زاڵە بەسەریدا. | ٤- زیاتر سروشتی توندو تیژی زاڵە بەسەریدا. |
| ٥- پێویستی بەڕیفراندۆم نیە، چونکە جەماوەر خودی خۆی پێی هەستاوە. | ٥- پاش کودەتا ڕیفراندۆم ئەنجام دەدرێت بۆ پێدانیشەرعیەت بەکودەتاکە. |

لێرەوە دەتوانین بڵێین کەشۆڕشی ١٤ی تەموز سەرەتا وەك کودەتایەکی (فوقی-وەتەنی) سەری هەڵدا، لەم بوارەشدا متمانەی کردە سەر سوپابەسەرکردە جیاوازەکانیانەوە و پاشان سود وەرگرتن لە ڕەگەزەکانی کوتو پڕی و نهێنی بوون و چەواشەکردن و قۆستنەوەی هەلەکان، لەم بوارەشدابزاوتیمیللی ڕۆڵی ڕاستەوخۆی تیا نەگێڕا تەنها پاش ڕاگەیاندنی شۆڕش نەبێت.[1]

کەواتە دەتوانین بڵێین لەڕاستیدا ئەوەی ڕویدا کودەتایەکی سەربازی بوو، نەك شۆڕش، ئەم کودەتایەش کۆمەڵە ئەفسەرێك پێی هەستان و دەسەلاتی پاشایەتیان روخاند، بەلام پاش ڕاگەیاندنی شۆرش خەڵکی لەدەوری کۆبونەوە و تێکەڵ بوون لەگەڵیدا، وپشتگیریان لێ کرد و بەتەواوی سەریان خست[2] .

لەکۆتایی ئەم باسەدا دەکرێت ئاماژە بکەین بۆ دوو خاڵێك:

١-هەروەك لە پێناسەی کودەتادا هاتبوو کەپاش سەرکەوتنی پەنا دەبرێتە بەر ئەنجام دانی ڕیفراندۆمی گشتی بۆ شەرعیەت پێدانی، لەبەیاننامەکەی شۆڕشیشدا هەمان بەڵێن درابووکە پاش سەرکەوتنی شۆڕش ڕیفراندۆم ئەنجام دەدرێت، دیارە ئەمەش بۆ شەرعییەت دان بووە بەو کارە پێی هەستاون..

٢- گەر لە زمانی بەیاننامەکە وردببینەوە دەبینین کە جەماوەر دەکاتە خاوەنی کارەکە و بە چەندان برگەو ڕستەوە بەجەماوەرەوە گرێی دەدا، دیارە ئەمەش بەرەنجامی هەست کردنە بەوەی کەڕەگەزی جەماوەر لەکارەکەدا بەشداری پێ بکات، هەربۆیەش دەبینین کەلەگەڵ سەرکەوتنی

---

[1] نجم، محمود، المقايضة بين برلين وبغداد، الخلفية التأريخية لحرب لم تنته بعد، منشورات الغد، ص١٦,١٧.
[2] مجلة گولان العربی، عدد ٢٦ تموز ١٩٩٨، مقابلة مع السيد محسن دزيی، اجراه كريم حسن، ص٤٧-٥٠.

کارەکە لەڕێگەی ڕادیۆوە جەماوەر هان دەدرێت تا بڕژێنە سەرشەقامەکان و پەلاماری شوێنەوارەکانی دەسەڵاتی پاشایەتی بدەن..

بەم جۆرە دەبینین لە بنەڕەتدا شۆڕشی ١٤ی تەموز کودەتایەك بووە کە زۆربەی ڕەگەزەکانی کودەتای تیا بەرجەستە بوون وەك ( بەکارهێنانی توندو تیژی، گۆڕینی شەخصیەتی دەوڵەت لە پاشایەتی بۆ کۆماری، بەڵێن دان بەئەنجام دانی ڕیفراندۆم.. هتد )تالە دوایدا بەشداری جەماوەرو پارتە سیاسیەکان سیمایەکی شۆڕشگێڕانەیان پێبەخشی...

## ڕۆڵی جەماوەرو پارتە سیاسیەکان

### لە ١٤ی تەموزی ١٩٥٨دا

لەبەرە بەیانی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ کودەتای سەربازی وڕاپەڕینی جەماوەری پێکەوە گرێ دران، لەکاتژمێر (٨) ی سەرلەبەیانی واتە (١,٣٠)کاتژمێر و نیوێك پاش ڕاگەیاندنی شۆڕش، لە بەغداد و شارو شارۆچکەکانی تردا، جەماوەر بەسەرجەمی توێژەکانەوە هاتبونە سەرشەقامەکان و ئاوێزانی داوا و بانگەوازە یەك دوایەکەکانی عەبدولسەلام عارف بوون کەلە ڕادیۆوە ئاراستەی دەکردن، بەم جۆرەش شەپۆلی جەماوەر عێراقی هەژاند..

شایانی باسە پارتەسیاسی‌یەکانی ناو بەرەی یەکێتی نیشتمانی تاڕادەیەك ئاگادارییان هەبوو بەسەر شۆڕشەکەدا، حزبی شیوعی و پارتی نیشتمانی دیموکراتی بەڕەسمی لەڕۆژی ١١ی تەموزدا لەلایەن قاسمەوە ئاگادار کرابوونەوە، واتە سێ ڕۆژ پێش ١٤ی تەموز، بەڵام پارتی بەعس و پارتی سەربەخۆیش هەمان ئەوکاتە بەوادەی کودەتاکەیان زانیبوو ، ئەمەش نەك بەڕەسمی بەڵکو لەڕێگەی لەئەفسەرە بچوکەکانی ناو ئەفسەرانی

ئـازادیخوازەوە کەلـەوادەی کودەتاکـە ئاگـادار کرابوونـەوە، بـەم جـۆرەش پارتەکان هەریەك لەلایەن خۆیەوە پێداویستییان سازکردبوو بۆ لایەنگری و سەرخستنی کارەکە، هەربۆیەش لەگەڵ ڕاگەیاندنی شۆڕش لەرادێوە، ئەندام ولایـــەنگرانی ئـــەو پارتانـــە لەحەشـــارگەکانیان هاتنـــە دەرەوە و ڕژانـــە سەرشەقامەکان خۆپیشاندان و پەلاماریان دەستپێکرد، دیارە لەگەڵ ئەندام لایەنگرانی ئەم پارتانەشدا کەسانێکی زۆریشی پێوە ئاڵاوە کەسەر بەهیچ یەك لەم پارتانە نەبوون..

لێرەشـەوە جـەماوەر بـەجۆرێك ڕژانـە سەرشـەقامەکان کەخـەریك بـوو بارەکـە لەدەسـتی سـوپا دەربچـێت، جـەماوەر پـە لامـاری پەیکـەری (مـۆرد)"ژەنراڵـی بـەریتانی کـە سـاڵی ١٩١٧ بەغـدادی داگیر کردبـوو"داو ڕوخانـدیان. پاشـان پەیکـەری مـەلیك فەیسـەڵی یەکـەمیش ڕوخێنـرا، لەدوایشـدا بـەخێرایی ڕویـان کـردە باڵێۆزخانـەی بـەریتانیا و هـەوڵی وێرانکردنیـان دا، بـەڵام هەربـەزووی سـوپا بـەرەنگاریان بوونـەوە ڕێگـەیان لێگرتن، لەگەڵ ئەمەشدا وێرانکاری و تاڵان لەناو شاردا بڵاو بوەو، ئەمـەش سەرەڕای داخستنی دوکان و بازاڕەکان.. لەهەمووشی دەرکەوتوتر پەلاماری جەماوەر بوو بۆ سەر کۆشکی پاشایەتی و بەتاڵان بردنـی شت و مەکەکانـی وهـەمان ئـەم حاڵەتـەش بەسـەر کۆشـکی نـوری سـەعیدا هـات، جـەماوەر بـەڕۆحی سەربازییەوە پـەلاماریان دەبـرد و بەدارو چەقۆ شاڵاویان دەبرد.[1] هەرچەند ئەم جۆرە بەشدارییە زیاتر شێوازێك لـە پاشاگەردانی و بێنـەزمی پێوە دیارە و نیشانەی تـوڕەیی خـەڵکی بووە لەدەسەڵاتی پاشایەتی، بەڵام دەسەڵاتی سەربازی توانی لەکۆتایداو لەئاستێکدا ڕای بگرێت و ئاوێزانی

---

[1] کەناڵی ئاسمانی ئەبوزەبی بەرنامەی (بین الزمنین) ئامادەو پێشکەش کردنـی (احمد مهنا) کۆتـایی سـاڵی ٢٠٠١.

بكات بەکودەتاکەو توانی بە شۆڕش ناو زەدی بکات، بەم جۆرەش شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ لەدایك بوو، دیارە ئەم باسەش زۆر قسەی تر هەڵدەگرێت، بەڵام لێرەدا بەم برە کۆتایی پیێدێنم و ئاماژە دەدەمە خاڵێکی تر، کەئەویش بریتییە لەوەی ئایا دەسەڵاتی پاشایەتی بەو جۆرە قێزەون بوو کەهیچ کەس دژ بەم شۆڕشە نەوەستێتەوە بەتایبەت لەسەر ئاستی سەربازی؟

زۆرلا پێیان وایە کە جەماوەری لایەنگری دەسەڵاتی پاشایەتی خۆی( لە دەرەبەگ و ئاغاو چینی دەوڵەمەندان و سەرمایەداراندا دەبینییەوە)، لەگەڵ ئەوانەی بەپیرۆزییەوە سەیری بنەماڵەی پاشایەتییان دەکرد کەئەمانە لە نەوەی پێغەمبەرن (دروودی خوای لێبێت)، دیارە ئەمانەش هێندە کەم نەبوون، قەبارەیەکیان بۆخۆیان هەبووە، بەڵام دەکرێت هێندە متمانەیان بەوە نەبووبێت کەشۆڕش سەربکەوێت و بارەکە بەوجۆرەی لێبێت، ئەم حاڵەتەش ڕاستەوانە بەسەر سوپاش دا دەشکێتەوە، دەبینین زۆربەی یەکە سەربازییەکان لەکاتی بیستنی هەواڵی شۆڕشدا، دەکەونە حاڵەتێکی زۆر حەساسەوە کەهیچ جۆرە چارەنوسێکی دیاریان لە بەرچاودا نەبووە، هەربۆیەش ناچار بوون چاوەڕێ بکەن تابزانن بارەکە بەچ لایەکدا دەکەوێت، ئەو کات هەڵوێست وەرگرن، لەو کاتەشدا تەنها جوڵانەوەیەکی دیارو بەرچاو هەبوو بێت دژ بەشۆڕش، جوڵانەوەکەی عمر علی بووە لە دیوانییە، کەئەویش هەر بەزوویی سەرکوت کرابوو، ئەمە سەرەڕای ئەوەی هەندێك کەس کە پێیان وایە ئەو حاڵەتە جەماوەری و خرۆشانەی لەبەغداد دروست بوو، شتێکی چاولێکەری بووە، گەربێتوو شۆڕش سەرنەکەوتایە چی کرا بە دەسەڵاتی پاشایەتی هەمان کاریش دەکرا بە شۆڕش گێران...

# پەلاماری کۆشکی ڕیحاب و
# هەڵاتنی نوری سەعید

سەرەتا دەبێت بۆ پێشینەی پەلاماری کۆشکی ریحاب و لەناوبردنی هەریەك لە نوری سەعید و وصی وشافیصل ی دووەم، بگەرێنینەوە بۆچەند ساڵێك بەر لە رووداني شۆرشی چواردەی تەموزی ١٩٥٨ دیارە هەریەك لەم کەسایەتیانە، پێگەیەکی پتەوی بەریتانی بوون لە عێراقداو دەرباز بونیشیان مایەی ترسێکی گەورە دەبوو بۆ سەر داهاتوی شۆرشی ١٤ی‌تەموز، بەو پێودانگەی‌سەرلەنوێ بەپاڵپشتی ولاتێکی زلهێزی وەك بەریتانیا جارێکی تر بێنەوە سەر دەسەڵاتی عێراقی، لەبەر ئەوە لەناوبردنی ئەم سێ کەسەی دەسەڵاتی عێراقی، ئەرکێکی گرنگ بوو بەلای ئەفسەرانی شۆرشەوە، نەبادا وەك( رەشیدعالی گەیلانی) یان لێ بەسەربێت وجوڵانەوەکەیان زووبکوژێتەوە.. بۆزیاترئاگابوون لەو هەولانەی کەویستراوە ئەم سێ کەسایەتی یە لەناو ببرێت لە لایەن ئەفسەرانی ئازادیخوازەوە ، ئامارە دەدەینە چەند هەوڵێك :

١- لە پێش گەرانەوەی قاسم بە خۆی و سوپاکەیەوە لە ئوردون لە مانگی تشرینی دووەمی ١٩٥٦ بۆ عێراق، کاغەزێك دەنێرێت بۆ رێکخراوی بغدادی ئەفسەرانی ئازادیخواز و ئەوەی تیا دەڵێت کە شۆرش رادەگەیەنێت کاتێك سنوری عێراقی بری لە نزیك ( ئێچ پری) لە بەرئەوەی هەرسێ‌کەسایەتی دەسەڵاتی عێراقی بەخێر هاتنەوەی ئەو هێزە دەکەن و لەو جێگەیەدان ، بەلام لە دوا ساتەکانی کۆتایدا ئەم پلانە

هەڵدەوەشێتـــــەوە لەبەر ئەوەی نوری سەعید ئامـــادەی ڕێوڕەسمەکە نابێت..

٢-لــە ١١ /٥/١٩٥٨ پلانێکــی تــر داڕێــژرا بــۆ لــەناوبردنی هەرســیٚ کەسایەتیەکە ئەمەش لە کاتی ئەو مانۆڕەی ســـوپا پیٚی هەڵدەستا لە ( ڕوتبە) و لەو کاتەدا مانۆڕەکە ئەنجـام درا، نارنجۆکێك فڕێدراو لەو کاتـەدا مەلیك و دەست و پێوەندەکەی دانیشتبون ، بەڵام کەسیـان برینـدار نەبوون بـەڵام لـە دوایـداو پـاش لێکۆڵینـەوە ڕاگەیـەنرا کارەکـە بەشـێك نـەبووە لـە پلانێــکی نهێنی ، بەڵکو کارێکی مەبەستداریش نەبووە.. [1]

٣-پلانێکی تر ئامادە کرا لە ١٩٥٨/٥/٢٩ بەبۆنـەی ئاهـەنگی یادی ٢٥ سـاڵەی دامەزراندنیکۆلیـژی ئەرکانـەوە لـە بغـداد ، کـە داڕێـژەرانی پلانـەکـە بڕوایان وابووە هەرسیٚ کەسەکە ئامادەی ئاهەنگەگە دەبن ، بەڵام ئاهەنگەکە دوا خرابوو بۆڕۆژی (٥ شەممە) ١٩٥٨/٦/٥ ،بەهۆی سەردانی عەبدولئیلاه و نوری سەعید بۆ دەرەوەی وولات بەم جۆرەش پلانـــەکەش واز لیٚ هێنـرا بەهۆی نەبوونی پێداویستی تەواوەوە بۆی . [2]

ئەمـە سـەرەڕای جیـاوازی لـە ڕاو بۆچـونی لیژنـەی بـاڵای ئەفسـەرانی ئـازادیخواز بـەدی دەکرێـت دەربـارەی مەسـەلەی لـەناوبردنی هەرسـیٚ کەسایەتی، وبوارنەدان بە دەربازبوونیان ...

بەرەبـەیانی ١٤ ی تـەموزی ١٩٥٨ کاتێـك لیـوای بیسـت بـە (٣) هـەزار سەربازەوە بەرەو بغداد دەکشیٚ، کاتـژمێر (٣٠ ،٤ ) ی سـەرلە بەیانی ١٤ ی تـەمووز خۆیـان دەکـەن بـەناو شـاری بغـداد دا و هەڵدەسـتن بـە داگیرکردنـی

---

١

شوێنە گرنگ و هەستیارەکان ، بەتایبەت بینایەی ڕادیۆ ، پاشان لە کاتژمێر (٦) ی سەرلەبەیانی دەوروبەری کۆشکی ڕیحاب دەگرن ، لەم نێوەشدا فەرمان دەردەچێت بۆ(رائد منزر سلیم ) لە لیوای بیست کە بە فەرماندەیی سرییەك ئەو کارەی گرتبوویە ئەستۆ ، ئەم سرییەش لە سەعات (٦) دا گەیشتبوونە کۆشك و پێگەو شوێنی خۆیان بەدەوری کۆشکدا داگیر دەکەن .

لەهەمان کاتدا کە هێزەکان شوێنی خۆیان گرتبوو لە دەوری کۆشکدا مولازم ( فالیح حەنزەلْ ) پەیوەندی دەکات بە ئەفسەرانی پارێزگاری کۆشکەوەو پێ یان ڕادەگەیەنێت کە یەکەکانی لیوای بیست دەسەلاّتیان گرتووە بەسەر بغداداو کودەتا روویداوە.[1] ئەم سریەی رائد منزر سلیم کە ژمارەیان بە (٤٠ ) کەس مەزەندە کرابوو ، بەدرێژای لەسەر شۆستەکان وەستابوون ولولەی تفەنگەکانیان ئاراستەی کۆشك کردبوو ، لە بەرامبەر دەرگای نیزامی باخچەی کۆشکیشدا، ڕەشاشێك دانرابوو کە رائد منزر سلیم لە پشتیەوە بووبوو...

لە دەوروبەری کاتژمێر (٦/١٥) ی سەرلەبەیانی تەقە بە ئاراستەی کۆشکدا کرا ، یەکەم دەست ڕێژی گوللە بەر پەنجەرەکەی ژووری نوستنی عبدولئیلاه کەوت لەقاتی یەکەم ، وشوشەکانی بەتەواوی‌شکاند، بەم جۆرەش سەرجەمی پاسەوان و کاربەدەستانی کۆشك تووشی سەرسورمان هاتن، لەو کاتەشدا کە بەرگری و تەقەکردن درێژەی دەبێت، نەقیب

---

[1] دەڵێن مەلیك و عەبدولئیلاه نامەیەك ئاراستەی ئەو ئەفسەرانە دەکەن کە دەوری کۆشکیان گرتبوو، تێیدا پێیان ڕاگەیاندبوون کە بەرگری ناکەن و خۆیان دەدەن بەدەستەوە..

عبدالجواد حامد [٢] داوای هاوکاری دەکات لە عبدولسەلام تا کەرەستە و چەکیان پێ بگەیەنن ، لە بەرئەوەی ئیشەك و تەقەمەنیان لێ بڕابوو ، بۆئەم مەبەستەش نەقیب محمد علی سعید دەچێتە قوتابخانەی پیادەو یارمەتی پێویست دەست دەخات. [٣]

لەهەمان کاتیشدا عبدالستارالعبوسی لەبەرەنجامی پەیوەندیو داواکردنی پێداویستی سەربازی لە سەربازگەی (الوشاویش) کەلەژێر فەرمانڕەوای براکەی عبدالسلام عارفدا بووە ، بەخۆیو پێداویستی سەربازیيەوە بەرەو کۆشکی ڕیحاب بەڕێ دەکەوێت ، بەدوریش نازانرێت کەئەو زانیاريانەی گەیشتوەتە عەبدولسەلام عارف هەڵە بووبێ ، تاوای لێ کردبێ فەرمانی لەناوبردنی دانیشتوانی کۆشك بدات گەر بەرەنگاريان نواند، پاش هاتنی کۆمەکی سەربازی پێویست شەڕ تادەهات گەرمتر دەبوو ، هەندێ لە ئەفسەرەکان لەدەرگای تەنیشتەوە دەچنە باخچەی کۆشکەوە ، لەوکاتەشدا لەلایەن عبدالستارالعبوسیەوە ، سێ موشەکی بازۆکا ئاراستەی کۆشك دەکرێ بەهۆی تۆپی ١٠٦ملم ، بەم جۆرەش لەبەرنجامی ئەم بۆردومانانەوە دوکەڵ لەقاتی سەرەوەی کۆشك بەرزدەبێتەوە عەبدولئیلاه فەرمان دەدات بەئەندامانیی بنەماڵەی پاشایەتی تاسەرجەمیان دابەزنە ژێر زەمینەکەی کۆشکەوە. ئیتر دڵنیا دەبێت بواری هەڵاتنیان نەماوە،

---

[٢] زۆربەی ئەفسەرانی ئازادیخواز کەلەدوای شۆڕش چاوپێکەوتنیان لەگەلا کراوە، پێیان وایە کەرائد عبدالجواد حامد یەکێك بووە لەئەفسەرانی سریەکەی منذر سليم (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق، ليث عبدالحسن الزبيدی، ص١٨٦)

[٣] لەدیدارێکی ڕۆژنامەی (الاتحاد ) ژمارە(١٩٢) ١٣تموز ١٩٩٦دا، کە مستەفا صالح کریم لەگەڵ دوو ئەفسەری سەر بەڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخوازدا ئەنجامی داوە، باس لە بەشداری ئەو دوو ئەفسەرە دەکات لەپەلاماری کۆشکی ڕیحاب و بینایەی ڕایۆدا ، کەیەکێکیان برینداا بووە، ئەوانیش هەریەك لە (نقیب مستەفا عبدالله) و (شێخ نوری شێخ سەعید ) بوون، لەم پەلامارەشدا ئەفسەرانی کورد وبەشدارییان هەبووە..

دەشـــگونجێت بـــەهۆی هـــاتنی العبوســـی بۆناوچـــەکە دەگونجێـــت بـــواری هـەلاتنیان بەتـەواوی نـەمابێت، گـەربێتوو بیریـان لەهـەلاتن کردبێتـەوە، بـەم جۆرەش مەلیك فەیسەڵ و عەبدولئیلاه و بنەماڵەی پاشایەتی خۆیان دەدەن بەدەستەوە، و لـەدەرگای پشتەوەی کۆشـك دێنـە نـاو باخچـەی پێشـەوەی کۆشـــکەوە، لـــەکاتی گـــەڕانی العبوســـیدا بـــەناو کۆشـــکدا دێتـــە دەرەوە، غەدارەیـەکی بەدەسـتەوە دەبێـت دەسـت دەکاتەدەسـتڕێژکردن بەئاراسـتەی بنەماڵەی پاشایەتی کەلە باخچەکەدا وەستابوون، لە ئاکامدا مەلیك فەیسـەڵ و عەبـدولئیلاه و مەلیکـە نەفیســەو ژمارەیــەك لــە ئەنـدامانی بنەماڵــەی پاشـایەتی دەکـوژرێن، هەنـدێك سەرچاوەش بـاس لـەوە دەکـەن کـە کەمـەلیك فەیســەڵ کاتێــك تەقــەی لێکـراوە بەســەختی برینــدار دەبێــت و ڕەوانــەی خەستەخانەی (پاشایەتی) دەکەن ودەخرێتەژێر چاودێرییەوە، بەلام بەهۆی ســەختی برینەکەیــەوە گیــان لەدەســت دەدات..[1] بــەم جــۆرەش بنەماڵــەی پاشـایەتی قـەتڵ وعـام کـران بـیٚهیچ جـۆرە دادگـایی و لێپرسـینەوەیەکی یاسـایی، بەتـەواویش ئاشـکرانەبوو کـە ئایـا العبوسـی هەرلەخۆیـەوە ئـەم کـارەی ئـەنجام داوە یـان فـەرمانی پێکرابـوو بەتایبـەت لەلایـەن عارفـەوە، چـونکە کاتێــك لەلیژنــەی بــالادا گفتــو گــۆ لەســەر چارەنوســی بنەماڵــەی پاشایەتی کرابوو، بەتەنها عەبدولسەلام عارف لەگەڵ ئەوەدابووە کە دەبێت بنەماڵـەی پاشـایەتی لـەناو ببرێن نـەبادا ولاتـانی نێـو پـەیمانی بەغـداد یـان ئـوردون هـەوڵی گەڕانـەوەیان بـدات و شـۆڕش شکسـت بێنێتـەوە، بەدەر لـەم ڕایـەش هەنـدێکی تـر داوایـان وابـووە کەجگـە لەمـەلیك فەیسـەڵ کەڕەوانـەی دەرەوەی ولات بکرێــت، هەریــەك لــەنوری ســەعید و عەبـدولئیلاه لەبـەردەم

---

[1] الزبيـــدي، ليـــث عبدالحســـن، (ثـــورة ١٤تمـــوز ١٩٥٨ في العـــراق) الطبعـــة الثانيـــة ، بغـــداد ١٩٨١ص١٨٦,١٨٧,١٨٨.

دادگا بوەستێنرێن و فەرمانی سێدارە بسەپێنرێت بەسەریاندا، لەنێو ئەم بیرپایانەشدا، عەبدولکەریم قاسم بێ‌دەنگ بووە و لایەنگری هیچ لایەکی نەکردووە،[٢]

فوئاد عارف لەیاداشتەکانیدا و لەلاپەڕە (١٧٧,١٧٨)دا لەم بارەیەوە دەنوسێت: لەڕاستیدا زۆر نیگەران بووم لە کوژرانی مەلیك فەیسەڵ و خێزانەکەیان، لەم بارەیەشەوە سەرزەنشتی هەریەك لە( قاسم و عارف)م کرد، چونکە دەمزانی کەکوشتنی مەلیك فەیسەڵ لەبەرنامەی شۆڕشدا نەبوو.. لەبەرامبەردا عەبدولسەلام عارف بەتەعلیقەوە پێی ووتم" ئەوە لەبەر ئەوەی کەماوەیەك یاوەری مەلیك بوویت ، بۆیە هێندە نیگەرانی بۆیان؟" ووتم" بەڵی من یاوەری فەیسەڵ بووم و دانی پیادەنێم و پەشیمان نیم، بەڵام پێویست نەبوو مەلیك بکوژرێت"، قاسم لەم قسەیەدا لایەنگری کردم ، ئەمەش حەقیقەتێکە بۆ مێژوو وپێی ووتم " هەندێك کار لەدەرەوەی ئیرادەی مرۆڤ ڕوودەدەن و لەدەرەوەی بازنەی نەخشە بۆ کێشراودان.." هەروەها فوئاد عارف مەسەلەی نیگەرانی لەسەر کوشتنی مەلیك فەیسەڵ بۆ دوو خاڵ دەگەڕێنێتەوە یەکەمیان / لەبەر ئەوەی کوڕی غازی بووە کەپاشایەکی نیشتمان پەروەر بووە، دووەمیشیان/ لەبەر ئەوەی کەمەلیك فەیسەڵ تەمەنی منداڵ بووە و کاری وڵاتی بەدەست نەبووە..

هەرلەم بارەیەشەوە تالب حامدی برازای عەبدولکەریم قاسم دەڵێت" قاسم زۆر نیگەرانی کوژرانی مەلیك فەیسەڵی کەم تەمەن بووە.."[٣]

---

[٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو..

[٣] کەناڵی ئاسمانی ئەبو زەبی بەرنامەی(بین الزمنین) ئامادەو پێشکەش کردنی (احمد مهنا) ساڵی (٢٠٠١)

سەرجەمی ئەفسەرانی ئازادیخواز ئەوە دوپات دەکەنەوە کە لە کۆبونەوەکانیاندا دەربارەی چارەنوسی بنەماڵەی پاشایەتی هیچ جۆرە بڕیارێکی یەکلاکەرەوەیان نەداوە، بێگومان لێرەدا دەبێت ئاماژە بدەین بە خاڵێکی گرنگ ئەویش کاتێک هەریەك لەقاسم و عارف وادەی شۆڕشیان لەنێوان خۆیاندا شاردەوە و بێئاگاداری لیژنەی باڵا هەستان بەئەنجام دانی شۆڕش، لەم ڕووەوە بەرپرسیارێتی یەخەی لیژنەی باڵا ناگرێت سەبارەت بە کارەساتی کۆشکی ڕیحاب ئەوەندەی ڕووبەڕووی قاسم و عارف دەبێتەوە، لەنێوان هەریەك لەقاسم و عارفدا لەڕووی مەیدانییەوە بارەکە زیاتر یەخەی عارف دەگرێتەوە لەبەر ئەوەی سەرکردەی مەیدانی کارەکە بووە و ئاگاداری سەرجەم جموجوڵەکان بووە و لە عارفەوە بڕیارەکان دەرچوون، بەگەڕانەوەش بۆ بۆچوونی عارف سەبارەت بە چارەنوسی بنەماڵەی پاشایەتی کەلە پێشەوە ئاماژەمان پێدا و(لەیس عەبدولحەسەن زوبێدی) لە کتێبی (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق)دووپاتی دەکاتەوە زیاتر بەرپرسیارییەتیەکە یەخەی عارف دەگرێتەوە، وەك لە قاسم، هەرچەند هەندێکی تر پێیان وایە قاسم ئەم بڕیارەی دەرکردبێت، بەو پێودانگەی کەقاسم ڕەخنەی لە جەمال عەبدولناصر گرتبوو سەبارەت بە مامەڵەکردنی لەگەڵ مەلیك فاروقدا و چۆنیەتی بەڕێکردنیان ووتبووی" ویستویانە منیش وەك عەبدولناصر بە مۆسیقای پاشایەتی بەڕێیان بخەم..! "هەروەها لەهەندێك شوێندا قاسم باسی لەوە کردبوو کە پلانی کوشتنی ئەو سێکەسەی داڕشتووە.[1]

[1] العلوی، حسن، عبدالکریم قاسم رؤیة بعد العشرین، منشورات دار الزوراء ، لندن، ١٩٨٤، ص٣٠,٢٩.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پاش ئەنجام دانی کارەساتەکە هیچ دەسەلاتێك هەڵنەستا بەئەنجام دانی لێکۆڵینەوە لەم بارەیەوە، هیچ یەکێکیش لەئەفسەرانی بەشداربووی کارەکە بانگ نەکران تا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێت، جگە لەوە نەبێت کە (العبوسی) ڕاپۆرتێك بەرزدەکاتەوە بۆ قاسم و تێیدا دان بەوەدا دەنێت، کەئەو بەپاڵنەری شەخصی تەقەی لەبنەماڵەی پاشایەتی کردووە.. بەڵام بەپێی هەندێك بیروڕا، پێدەچێت (العبوسی) لەسەر داوای قاسم ئەم ڕاپۆرتەی نوسیبێت، تالەبەرامبەر کارەساتێکی لەو جۆرەدا پایەی کەسایەتی قاسم لەکەدار نەبێت،.[٢]

پاش کۆتایی هاتنی شۆڕش و هاتنەکایەی دەسەلاتی کۆماریش ، مەرسومێکی کۆماری دەرچوو سەبارەت بە دەست بەسەراگرتنی کەل و پەل و سەروەت و سامانی بنەماڵەی پاشایەتی، ئەم مەرسومە کە ژمارە (٢٣) بوو لە ١٩٥٨/٧/١٩ دەرچوو، بەناوی وەزارەتی داراییەوە تۆمارکرا ..

لەهەمان ڕۆژدا حاکمی سەربازی گشتی بەیانێکی دەرکرد و تێیدا هاتبوو،کە بڕیار دراوە سەرجەم کۆشکە پاشایەتییەکان و کۆشکی دەسەلاتدارانی سەردەمی پێشوو، ئەو ماڵ و موڵکەی تێیدایەتی ، بکرێت بە ناوی دەوڵەتەوە و دەست درێژی کردنەسەری ئەو جێگەو کەل و پەلانە وەك دەست درێژی کردن وایە بەسەر دەوڵەت و دەست درێژی کارانیش سزا دەدرێن..

شایانی باسە سەروەت و سامانی بنەماڵەی پاشایەتی لەکۆتایدا بەم جۆرە خەملێنراو دیاری کرا:

---

[٢] هەمان سەرچاوەی پێشوولاپەرە ١٢٧.

* بنەماڵەی پاشایەتی خاوەنی (١٧٧٥٩٦٩) دۆنم موڵکن، لە (وەزیریەو نوعمانیەو شاوی و خانەقین و پێنجوین و سەرسەنگ و موسەیەب )...

* کۆشـــکەکانی بنەماڵــەی پاشــایەتی، کەســێ کۆشــکی ســـەرەکی دەگرێتەوەو بریتین:

١-کۆشکی ریحاب کەرۆژی ١٤ی تەمموز سوتاو کەل و پەلەکەی ناویشی تالان کرا.

٢-( دار الملك علی) لە کەرادەی مەریەم.

٣-کۆشکی (الزهور) کەمەلیك غازی تێیدا دادەنیشت و کەرەستەو کەل و پەلە کانی ناوی هیچی دەست کاری نەکراوە.

* رەصیدی دارایی: (٥٠٠٠٠٠) نیو ملیۆن دۆلار لە ئەمریکا خرابوویەوە بانکەوە بە ناوی مەلیك فەیسەڵی دووەم،

* برێکی بەرچاو لـە ئـاڵتون و موجەوهـەرات دۆزرانـەوە کـە لـەدەرەوەی وڵات دانرابوو پاشان دەوڵەت مامەڵەی پێوە کردن.[1]

---

[1] تاريخ الوزارات العراقية فى العهد الجمهوري، الجزء الاول، ١٤/٧/١٩٥٨-٧شباط ١٩٥٩، تأليف مجموعة من الاساتذة سنة ٢٠٠٠، ١١٥,١١٦,١١٧.

## هەڵاتنی نوری سەعید

نوری سەعیدی (سەرۆك وەزیرانی یەكێتی هاشمی) لەساڵەكانی كۆتایی دەسەڵاتی پاشایەتی‌دا خۆی سەرقاڵ كردبوو بە سیاسەتی دەرەكی بەتایبەت مەسەلەی پەیمانی بەغداد و یەكێتی هاشمی نێوان عێراق و ئوردون و دژایەتی كردنی سیاسەتەكانی عەبدولناصر لەوكاتەدا،لەهەمان كاتدا هیچ جۆرە بایەخێكی نەدەدا بە مەسەلەی ناوخۆیی و تەنانەت زۆر جار گاڵتەشی دەكرد بە ئۆپۆزیسیۆن و پێی وابوو لەچەند سەد قوتابی و پارێزەرێك تێناپەڕن ، كەدیارە ئەمەش بە هێزی پۆلیس چارەسەر دەكرێن، هەربۆیەش زۆر دڵنیا بوو لەكاروباری دەوڵەت...[٢]

نوری سەعید ناسراوبوو بەوەی كەپێشەوایەكی سیاسی بەتەمەنە و بەدەستی ئاسنینی حوكمی عێراق دەكات هەربۆیەش ڕۆڵێكی بەرچاوی بینیوە لە بەڕێوەبردنی كاروباری سیاسی عێراقدا و نزیكەی ١٤جار پۆستی سەرۆك وەزیرانی عێراقی گرتۆتە دەست، ئەمە جگە لەوەی هەندێك جاریش پۆستی وزاری تری وەرگرتووە، دۆستی نزیكی بەریتانیا بووەو پەیوەندی توندوتۆڵی لەگەڵ بنەماڵەی پاشایەتیدا هەبووە، بەدەر لەم حاڵەتەش بەكەسایەتی‌یەكی سیاسی نێودەوڵەتی سەردەمی خۆی هاتۆتە ژماردن، وتوانیویەتی ڕۆڵی بەرچاو بگێڕێت لەو بوارەدا، هەرچەند لە دوایدا هەندێك ناوەند باس لەوە دەكەن بیروڕاكانی بەرەو ئەمریكی بوون كشاوە، ئەمەش لەبەرەنجامی ململانێ‌ی‌نێوان ئەمریكاو بەریتانیا و هەوڵدانی‌هێنانەوەی عێراق بۆ چوارچێوەی هەژمونی خۆیان، ئەم بارەش كاتێك بەڕوونی دەركەوت كە نوری سەعید و عەبدولئیلاه سەردانی ی‌باڵیۆزخانەی

[٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٢٣

ئەمریکایان کردبوو لە۱۹٥٦/۱۱/۲۲ پاش پەیمانی بەغداد و هەروەها ئاگایی دانی ئەمریکی‌یەکان بەنوری سەعید لەئەگەری ڕودانی کودەتایەك دژ بەدەسەلاتی پاشایەتی لە عێراقدا، هەرچەند نوری زۆر لەوە تورە دەبێت و دەڵێت پەیوەندیمان لەگەڵ سوپادا زۆرباشەو گومانمان لە دڵسۆزییان نیە.[1]

نوری سەعید بەهۆی سوربونی لەسەر شوێن کەوتنی ڕۆژئاوا، کەوتبوویە ژێر ڕەخنەی قورسی سیاسیەکانی وولاتەوە، پێش شۆڕش دەستی دابوویە هەندێك پرۆژەی ئابوری گەورە بەتایبەت لە بورای ئاودێری و دروستکردنی بەنداودا، کەلەبەرەنجامیدا ولات سودو گەشەی باشی کرد، هەرچەند ئەو پرۆژانەبەزۆری پرۆژەی درێژخایەن بوون پاش شۆڕش ئاکامی خۆی دابەدەستەوە، وەك پرۆژەکانی ئەنجومەنی ئاوەدان کردنەوە..

نەیارەکانی نوری سەعید ڕەخنەکانیان لە نوری سەعید لەسەر ئاستی سیاسەتی دەرەکی چەند خاڵێکی دەگرتەوە لەوانە (هاوکاری پتەوی عێراق و بەریتانیا، و بەتین کردنی پەیوەندی بنەماڵەی پاشایەتی هاشمی لەسەر ئاستی دەرەوە وەك یەکێتی هاشمی نێوان عێراق و ئوردون)، ئەم جۆرە کارانەی نوری سەعید لەڕەهەندێکی سیاسیدا کۆدەبوونەوە کە توانی گەرەنتی چەند دەستکەوتێکی پیٚبکات، لەلایەك ئارامی ناوخۆیی و بەرەو پێش بردنی گەشەی ولات، ولەلایەکی دیکەشەوە دەست خستنی بەرژەوەندی بەرجەستە بۆ عێراق بەتایبەت لەڕووی سەربەخۆیی سیاسیەوە..

---

[1] نجم، محمود، المقايضة، بين برلين وبغداد ، الخلفية التأريخية لحرب لم تنته بعد، منشورات الغد، ١٩٩٢، ص٤٠,٤٦.

**بەرەبەیانی ١٤ی تەموز عقید عەبدولسەلام عارف ئەفسەرێکی بەناوی (بهجت سعید) تەکلیف کرد تا هەستێ بە دەستگیر کردنی نوری سەعید، یان کوشتنی گەر ویستی هەڵبێت، شایانی باسە کۆشکەکەی نوری سەعید کەوتبووە گەڕەکی (کەرخ) لەباشوری بەغداد لەسەر کەناری ڕۆژئاوای ڕوباری دیجلە، شەوی ١٣ی تەموز نوری زوو چوە سەر جێگەی نوستن بەو هیوایەی کەڕۆژی ١٤ی مانگ لەگەڵ (مەلیك فەیسەڵ و عەبدولئیلاه )داسەفەری ئەستەنبوڵ بکەن بۆ بەشداری کۆبونەوەی سەرەتایی پەیمانی بەغداد...**

**عەبدولسەلام عارف داواشی لە( وصفی تاهر) کردبووکەلەگەڵ بهجت سعید دا بێت، لەبەر ئەوەی (وصفی) ماوەیەك مورافیقی نوری بووە و بەتەواوی شارەزایماڵی نوری سەعیدبووە و یەکێکیش بووە لەئەفسەرانی ئازادیخواز، ئەم دوکەسە لەگەڵ هێزەکەیان سەعات (٥) سەرلەبەیانی گەیشتبوونە کۆشکەکەی نوری سەعید و دەوریان گرتبوو، بەڵام پێدەچێت یەکێك لە خزمەت گوزارەکانی نوری سەعید، ناوبراوی ئاگادار کردبێتەوە کاتێك گوێی لە دەنگی تەقە بووە،[٢] هەربۆیەش نوری بە خێرایی ماڵەکەی بە جێ دێڵێت، لەدەرگای پشتەوەی کۆشکەکەیەوە دەچێتە دەرەوە کەسەربازەکان ئەو دەروازەیان نەگرتبوو، ئەو دەرگایەش دەچووە سەر ڕوباری دیجلە، پێدەچێت کاتێك وصفی تاهر چوەتە ماڵی نوری سەعید یەکەم کەس بووە زانیویەتی نوری هەڵاتووە، هەربۆیەش بە خێرایی**

[٢] ناجی شوکت لەیاداشتەکانیدا(١٨٩٤-١٩٧٤) دەڵێ: سرییەیەك سەرباز دەوری ماڵی نوری سەعیدیان دابوو، بەڵام دەستیان نەکەوتبوو، هەڵاتبوو بۆ جێگەیەکی نادیار، پاش ئەوەی لەلایەن ئەو نانەوایەی کەنانی بۆ دەکردن هەموو بەیانییەك، هەواڵی ئەوەی زانیبوو کە ژمارەیەك سەرباز بەڕێوەن بەرەو ماڵەکەی.. سەرچاوە ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق، لیث عبدالحسن الزبیدی، ص ١٩٠..

فەرمانی بەسەربازەکانی دابێت تا بەتەواویدەوری ماڵەکەی نوری بگرن، بەڵام دیارە نوری نەکەوتبووە بەردەستیان.[1]

ئەوەی کەنوری سەعیدی دەربازکردبوو کەسێك بوو بەناوی (حسون عیسی الحمدانی) کەبەلەمی پێ بووەو خەریکی ڕاوی ماسی بووە، لەوکاتەدا کە گوێی لەدەنگی تەقە دەبێت تۆڕەکەی دەپێچێتەوە و بەرە قەراغی ڕووبارەکە دێت، سەیردەکات کەنوری سەعید بە بیجامەکەیەوە کە هێڵی شینی تیابووە ڕاوەستاوە، بەحسون دەڵێت تابەلەمەکەی بۆ بهێنێتە قەراغ ڕووبارەکەو ئەویش بە خێرایی داواکەی بۆ جێبەجێ دەکات، و نوری سەعید سەردەکەوێت بێئەوی سەلام بکات، چونکە دیاربووە کەزۆر شپرز بووە، هەربۆیەش حسون ناچار دەبێت پرسیاری لێبکات:

خێرە پاشا هیچ ڕووی نەداوە؟

ئەویش کەزۆر داکۆکی لەوەکردبووەوە تالەناوەڕاستی بەلەمەکەدا دانیشێت لەوەڵامدا ووتبووی هیچ نیە!! شتێك بدە بەسەرمدا بم پەڕێنەرەوە ئەو بەر ڕووبارەکە..

جارێکی تر حسون خۆی پێڕاناگیرێت و دەڵێت: خێرە پاشام ئێمە ئامادەین هاوکاریت بکەین!

ناچار نوری سەعید دەڵێت: هەندێك ئەفسەری قەشمەر کەجەمال عەبدولناصر هەڵی خەڵەتاندوون چەکیان هەڵگرتووە لە دژمان، پاشان وتبووی : یەڵلا ئاسانە بڕۆ!!

کاتێك کەبەلەمەکە لەقەراغی ئەوبەر ڕووبارەکە نزیك دەبێتەوە، سەیریان کردبوو خەڵکێکی زۆر کۆبونەتەوە، ناچار دەچنەوە بۆ ناوەڕاستی

---

[1] خدوري، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص٧٥،٧٦،٧٧.

ڕوبارەکەو بەرەو (باب الشرقی) بەڕێ دەکەون، بەڵام ئەویش گونجاو نابێت، لەوکاتەدا حسون ڕوودەکاتە نوری سەعید پیّی دەڵێت: بۆلەگەڵمان نابیت ؟ ئەویش لەوەڵامدا دەڵێت : دەمەوێت بمگەیەنیتە هەرماڵێك کە قادرمەیەکیان هەبێت ودابەزێتە سەرئاوی ڕووبارەکە بۆئەوەی ڕاستەخۆ بچمە ژوورەوە تابەوشکانیدا نەڕۆم.. پاش مشتومڕێکی زۆر لەنێوانیاندا، چەند ڕێگەچارەیەك دەخاتە بەردەست نوری سەعید، بەڵام ڕازی نابێت، نوری سەعید دەیویست بگاتە باڵێۆزخانەی بەریتانیا یان ئەمریکا، تاکاردانەوە لەبەرامبەر شۆڕش بگرێتەبەر..

جارێکی تر حسون پیّی دەڵێت:پاشام وەرە ماڵی ئێمە، ئێمە دەت شارینەوە و جلەکانت بگۆڕە کەس نات ناسێتەوە! ئەم قسەیە بەتەواوی نوری سەعید توڕە دەکات و دەڵێت: کوڕە بابە خۆمن شکستم نەخواردووە، بەڵام بم گەیەنەرە ماڵێك تائەم قەشەرانە تەمبێ بکەم، نامەوێت نیگەران بن، پاداشتی ماندوو بونتان دەدەمەوە.[2]

نوری بەرەو لای باکوری بەغداد دەکشێ بەلای کەناری ڕۆژئاوایدا،[3] ودادەبەزێت و بەحسون دەڵێت نانتان بۆ دەکرم و ئیتر دەڕوات وناگەڕێتەوە[4] پاش ئەوەی لە حسون جیادەبێتەوە دەچێتە ماڵی دکتۆر صالح مهدی البصام لەکەڕادەی مەریەم، کەزۆر دورنەبووە لەماڵەکەی خۆیەوە و لەوێشەوە بەسەیارەکەی (مورتەزا بەسام) برای صالح البصام پاش ئەوەی دەیخەنە سندوقیی سەیارەکەوە بەرەو صالحیە دەڕوات و پاشان بۆ کازمییە

---

[2] العلوی، حسن، عبدالکریم قاسم رؤیة بعد العشرین، منشورات دار الزوراء ، لندن، ١٩٨٤، ص٢٠,٢١,٢٢.

[3] خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر – قم ١٩٩٧ ، ص٧٧.

[4] العلوی، حسن، عبدالکریم قاسم رؤیة بعد العشرین، منشورات دار الزوراء ، لندن، ١٩٨٤، ص٢٢.

و بۆماڵی (الحاج محمود الاسترابادی)[1] کەیەکێك بووە لە هاوڕێکانی، شەوێك لەوێ دەمێنێتەوە ، نوری هەموو ئەم هاتو چۆیەی لە کاتێکدا ئەنجام دەدا، کە لە ڕادیۆوە پەیتا پەیتا سەرکردایەتی شۆڕش بەیانی بڵاو دەکردەوە و خەڵاتی ١٠هەزار دیناری دەدایە هەرکەسێك کەنوری سەعید بەزیندوویی یان مردوویی چنگ بخات[2].. لەوکاتەدا کە ئەم جۆرە داوایە بڵاودەکرایەوە لەڕادیۆوە، حسون زۆر بێدەنگ لەناو ماڵ ومناڵەکەیدا دانیشتبوو، مناڵەکانی دەوریان دابوو، وباسیان لە چارەنوسی شۆڕش دەکردەوە، بەڵام حسون ژوورەکە بەجێ دێڵێت و دەچێتە سەربان، لەو شەوەدا لەماڵی حسون زۆر کەم خەوتن هەموولا بیریان لەچارەنوسی شۆڕش دەکردەوە، بێئاگا لەوەی کە حسون یارمەتی نوری سەعیدی داوە کەهەڵاتووە، ئەم زانیاریانەش پاش یەك سەعات لەکوژرانی نوری سەعید حسون خۆی گێڕایەوە بۆ ماڵ ومناڵەکەی، نیگەران بوو لەوەی کەنوری بەگوێی نەکردو نەهات لەگەڵیا بۆماڵەوەیان.[3]ئەم هەڵمەتە ئیعلامییە گەورەی قاسم و عارف نیشانەی

---

[1] سەبارەت بە چارەنوسی بنەماڵەی(ئیسترابادی) ئەنجومەنی عورفی سەربازی لە کۆبونەوەی رۆژی ١٤/٨/١٩٥٨ئەم بڕیارانەی دەرکرد:

-حوکم درا بەسەر هەریەك لە محمود ئیسترابادی و فاتمە و حەیدەرو عەبدولئەمیر ئستراباد‌ی بەزیندانی کردنی سەخت بۆماوەی سێ‌ساڵ.

-حوکم درا بەسەر موزەفەر ئیسترابادی و زوهرە حەیدەر بەزیندانی کردن بۆماوەی پێنج ساڵ .

-حوکم درا بەسەر کازم زوغیر بەزیندانی کردن بۆ ماوەی یەك ساڵ.

بڕیاردان بە دورخستنەوەی زوهرە حیدرو فاتمە حیدر بۆ دەرەوەی عێراق پاش کۆتایی هاتنی ماوەی حوکم دانەکەیان...سەرچاوە: تاریخ الوزارات العراقیة فی العهد الجمهوری، الجزء الاول، ١٤/٧/١٩٥٨-٧شباط ١٩٥٩، تألیف مجموعة من الاساتذة سنة٢٠٠٠ص١٥٧.

[2] الزبیدي، لیث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانیة ، بغداد ١٩٨١ص١٩١.

[3] گێڕانەوەی حەسەن ئەلعەلەوی لەکتێبی (عبدالکریم قاسم رؤیة بعد العشرین) لاپەڕە (٢٠) کەحسون خزمی نزیکی عەلەوی بووە، عەلەوی خۆی لەواقعەکەی ماڵی حسوندا ژیاوە..

نیگەرانی بوو لە هەڵاتنی نوری سەعید، ئەمەش لەبەر مەترسی ئەوەی نەبادا نوری بەخۆشاردنەوەی هەوڵی دژە کارێك بدات، یان پەنا بۆ ئوردون بەرێت و لەڕێگەی ئوردونەوە شۆڕش سەرکوت بکات.[4] نوری لەماڵی ئیسترابادی دەمێنێتەوە تائەوەی کە پشکنین دەست پیدەکات و ماڵ بەماڵ دەگەڕێن تادەگاتە نزیك ماڵی ئیسترابادی، هەربۆیەش نوری عەبایەکی ژنانە دەدات بەسەریدا ماڵی ئیسترابادی بەجێ دەهێڵێت، و ژنەکەی حاج محمود ئیسترابادی وخزمەتگوزارەکەیاز لەگەڵدەبێت و سواری سەیارەکەی ئیسترابادی دەبن، کەموزەفەری کوڕی ئیسترابادی لێی دەخوڕێت، بەرەو ماڵی (محمد العریبی) دەچێت کەیەکێك بووە لە شێخەکانی تیرەی (البو محمد) لەوکاتەشدا کەچاوەڕێی ڕەلامی ماڵی العریبی دەبێت، گەنجێك لەماڵەکە دێتە دەرەوە و هەواڵی نوری سەعید بەخێرایی دەگەیەنێتە سەرانی شۆڕشەکە، هەربۆیەش پێدەچێت نوری شوێنەکەی بەجێ هێشتبێت و بەپێ لەگەڵ ژنەکەی ئیسترابادیدا ئەو ناوەیان چۆڵ کردبێت، دیارە لەو کاتەدا نوری سەعید عەبای ژنانەی بەسەرەوە بووە، کاتێکیش خەڵکی سەرنجی دوو ئافرەتیان دابوو پێکەوە ڕۆشتوون بەسەر شۆستەکەدا، لەژێر عەباکەوە بیجامەکەی نوری دیار بووە، بۆیان دەردەکەوێت ئەوە نوری سەعیدە و لەوێدا دەبێتە دەنگە دەنگ کەئەوە نوری سەعیدە، کاتێکیش نوری زانیبووی کەهیچ دەرفەتێکی لەبەردەممدا نەماوەتەوە و ئاشکرابووە، دەمانچەکەی دەردێنێ و خۆی دەکوژێت، هەر بەخێرایی خەڵکی بەرەو شوێنەکە دەچن ولەوێشدا ئەفسەرێك ئامادە دەبێت تەقە دەکات لە خێزانی ئیسترابادی و دەیکوژێت، هەرچەند هەندێك پێیان وایە کەنوری سەعید

---

[4] خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر – قم ١٩٩٧ ، ص٧٨.

کوژراوە نەك خۆی کوشتبێت [1] بەڵام زۆربەی ڕاکان پێیان وایە کەنوری خۆی کوشتوە نەك کوژرابێت بە و بەڵگەیەی کەپاش کوژرانی نوری سەعید کەس بانگەشەی کوشتنی نوری سەعیدی نەکرد تا ئەو خەڵاتە گەورەیەش وەربگرێت کەلەلایەن شۆڕشە وە بۆ ئەم مەبەستە دیاری کرابوو، بەدەر لەوەی لەو کاتەدا ئەمە بەکارێکی شۆڕشگێڕانە وەسف دەکرا.[2]

پێش ئەوەی هەواڵی کوشتنی نوری بگاتە عەبدولکەریم قاسم، قاسم وەصفی تاهری ناردبوو تانوری سەعید دەستگیر بکات، بەڵام وەصفی کاتێك دەگات سەیردەکات نوریکوژراوە، ئەویش تەرمەکەی دەیگەیەنێتە وەزارەتی بەرگری بەم جۆرەش یەکێکیترلەکۆڵەکەکانی دەسەڵاتی عێراقی تیاچوو ومەترسی ئەفسەرانی شۆڕش ڕەوییەوە لەسەر مەترسی کاردانەوەی خراپ لەبەرامبەر شۆڕشدا، نوری لەگەڵ مەلیك فەیبسەڵ و عەبدولئیلاە، لە دووڕۆژدا کوژران و عێراقیش پێی نایە قۆناغێکی نوێوە کەئەویش عێراقی کۆماری بوو، کەقۆناغێکی نوێی ژیانی سیاسی عێراق بوو بەسەرجەم ئەو گۆڕانکارییانەی لەهەناویدا هەڵی گرتبوو..

---

[1] لیث عبدالحس الزبیدی لە کتێبی ثورة ١٤تموز فی العراق، ل(١٩٢) دا دەڵێت: نوری کوژراوە نەك خۆی کوشتبێت، چوونکە ژنەکەی ئیسترابادیشی لەگەڵا کوژراوە..

[2] خدوری، مجید العرب المعاصرون، ادوار القاده فی السیاسه، دار المتحده للنشر،١٩٧٣، ص٨٤، هەروەها ئەڵقەی دووەم لەبەرنامەی (بین الزمنین) لەکەناڵی ئەبو زەبی ئاسمانی، سەبارەت بە عەبدولکەریم قاسم..

## بەیاننامەی شۆڕش بەبۆنەی کوژرانی ( نوری سەعید )ەوە

" گەلی عێراقی خۆشەویست"

سەرکردایەتی شۆڕش دڵنیا بوو لەوە کە تاوانبارو خائنی یەکەم نوری سەعید خۆی شاردبویەوە لە خانویەکی نزیك (باب الشرقی) و پاش ئەوەی خانوەکەگەمارۆ درا و فەرمان دەرچوو بە پشکنینیو هێزەکانمان بەمەبەستی جێ بەجێکردنی ئەرکەکەیان چوونە ناو خانوەکەوە ، لەو کاتەدا ئافرەتێکی عەبا بەسەر هەڵدێت و دەست دەکا بەتەقەکردن، پاشان کاتێك گەل دەزانێت بەم تاوانبارە و دەتوانن دەست بگرن بەسەریدا، ئەوکات دەزانن کەئەو کەسەی جلو بەرگی ئافرەتی لەبەردابووە تاوانباری یەکەم و خائن ناسراو بەدوژمنی پلە (١)ی گەل نوری سەعید بووە..

ئێمەش مژدەتان پێ رادەگەیەنین و توانراوە تەرمەکەی بگوازرێتەوە بۆ دادوەری پزیشکی، بەم بۆنەیەشەوە هیوام وایە لەهەموو لایەك هێمنی و یاسا بپارێزن و بڕیاری قەدەغەکردنی هات و چۆ پەیڕەو بکەن..

زەعیم روکن عەبدولکەریم قاسم

سەرکردەی هێزە چەکارەکان

١٩٥٨/٧/١٥[٢]

---

[٢] تاريخ الوزارات العراقية فی العهد الجمهوری، الجزء الاول، ١٤/٧/١٩٥٨-٧شباط ١٩٥٩، تألیف مجموعة من الاساتذة سنة٢٠٠٠ص٥٦.

# کاردانەوە

# نێودەوڵەتی‌یەکانی شۆڕشی ١٤ی تەموز

شۆڕشی ١٤ی تەموز، لەوڵاتێکی دەوڵەمەندی وەک عێراق و جێگە هەژموونی بەریتانی، هەروا ڕوداوێکی سادەنەبوو کەبەسەر جیهاندا تێپەڕ ببێ و هیچ جۆرە کاردانەوەیەکی نەبێت، بەتایبەت پاش ئەوەی ڕەمزەکانی دەسەلاتی پاشایەتی هیچیان نەمانەوە تا هەندێک وڵاتی زلهێزی وەک بەریتانیا پشتیان پێ ببەستنەوە لەپێناو گەڕانەوەی دەسەلاتی لە عێراقدا، لەهەمان کاتیشدا لەگەرمەی جەنگی ساردی نێوانی ئەمریکا و سۆڤییەت ئەم مەسەلەیە جێگەی مشتو مڕ و خوێندنەوەی بەرژەوەندییەکان بوو، هەربۆیەش دەبینین وولاتانی جیهان بەگشتی و وڵاتانی خاوەن بەرژوەندی تایبەت بەعێراق هەریەک بەجۆرێک گوزارشتیان لەسیاسەتی خۆیان کرد، ئیتر ئایا ئەو هەڵوێستانە لەبەرژەوەندی دەسەلاتی تازەی عێراق بوبێت یان پێچەوانەی، لێرەدا ئاماژە دەدەینە هەڵوێستی هەندێک وڵات کە گۆڕانکارییەکان بەشێوەیەک لەشێوەکان پەیوەندی پێیانەوە هەبووە..

***هەڵوێستی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو***

لەگەڵ بیستنی هەواڵی ڕوودانی شۆڕش، جەمال عەبدولناصر زۆرخۆشحاڵ بووپێ‌ی و هیوای وابوو کەبتوانێت بیلکێنێت بەکۆماری عەرەبی یەکگرتووەوە، لەهەمان کاتیشدا ئەو هەژمونەی نوری سەعیدی لەبەردەمدا نەما کەبووبووە بەربەست لەبەردەم برەودان بە فیکرەی یەکگرتنی وڵاتانی عەرەبی کەسەرەتاکەی لە میسرو سوریاوە دەستی پێکردبوو... لەکاتی ڕودانی شۆڕشدا عەبدولناصر لە یۆگسلاڤیابوو، لەگەڵ

(تیتۆ)ی سەرۆکی ئەو وڵاتە لەدورگەی (بریۆنی) کۆبونەوەی هەبوو، هەواڵی شۆڕشـی لـەڕادێووە بیسـت و پاشـان بەبروسـکەی ڕەسمـی لەبەغـداد[1] و قـاهیرەوە هەواڵەکـەی پێگەیشـت. کەتێیـدا بـاس لەهـەواڵی شـۆڕش و سـەرکەوتنی دەکـات، داواشـی لێکرابـوو کـەدان بنێت بەحکومـەتی تـازەدا، بەڵام عەبدولناصر دەیویست زیاتر لە دان پیانان بۆ حکومەتی تازە ئەنجام بدات، هەرهێنـدەی لـە ١٩٥٨/٧/١٥ هێزی ئەمریکی لەکەنارەکانی بـەیروت دابەزی، بۆپارێزگاری کـردن لـە حکومەتەکـەی (کمیـل شمعـون) عەبدولناصـر لایـەنگری خـۆی بـۆعێراق دەربـڕی، هەربـەخێرای سـەردانی مۆسـکۆی کردلـە١٩٥٨/٧/١٦ ، لەکاتێکـدا لەڕێگـەی گەڕانەوەیـدا بـوو بۆقـاهیرە، گفتوگۆی لەگەڵ خرۆشۆڤ کرد سەبارەت بەهەل و مەرجەکەو هاتنـە ناوەوەی ئـەمریکا و ئەگـەری پـەلاماری عێـراق لەلایـەن بـەریتانیا و ئـەمریکاوە لـەو کاتـەدا، پـاش ئـەوە لـە ١٩٥٨/٧/١٨ گەڕایـەوە دیمەشـق و لەوتارێکیـدا ڕایگەیانـد هەرهێرشـێك بکرێتـە سـەر عێـراق وەك ئەوە وایە هێـرش بکرێتـە سەر کۆمـاری عـەرەبی یـەکگرتوو، لـە١٩٥٨/٧/١٩ یـش پێشـوازی لەوەفـدی تازەی عێراقی کرد بەسەرپەرشتی عەبدولسەلام عارف..[2]

***هەڵوێستی ئوردون***

ئوردون هەڵوێستی توندو نەیاری بەرامبەر بەشۆڕشـی١٤ی تـەموز هـەبوو، بەو پێودانگـەی کەهـەردوو بنەماڵـەی پاشـایەتی عێـراق و ئوردونی ئامۆزای یـەکتر بـوون و هـەروەها ئـەو پەیوەندییـە سیاسییەش کەهـەردولای پێکـەوە

[1] ئەنجومەنی سیادەی عێراقی پاش (٣) سەعات لەسەرکەوتنی شۆڕش، بروسکەیەك ئاراستەی عەبدولناصر دەکات و تێیدا داوای دان پیانان دەکات بەحکومەتی تازەی شۆڕشدا و عەبدولناصریش پاش (٣) سەعات داواکەیان جێبەجێ دەکات و دان دەنێت بەحکومەتی تازەدا..( سەرچاوە: ثورة ١٤تموز١٩٥٨ في العراق ، ليث عبدالحسن الزبيدى، ط٢، بغداد، ١٩٨١ ،ص٢٠٧)

[2] خدورى، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص٨٣,٨٢.

گرێدابوو، تاگەیشتبوویە ئاستی دروست بوونی یەکێتی نێوانیان، بەدەر لەم دوو هۆکارە، حکومەتی ئوردون لەوەش دەترسا کەئەم بزاوتە ئوردونیش بگرێتەوە وببێتە هۆی هەرەسی دەسەلاتی پاشایەتیش لەو ولاتەدا، بۆپارێزگاری کردنی ئەم دەسەلاتەوە و ڕوونەدانی گۆڕانکاری سیاسی لەچەشنی ئەوەی لەعێراق ڕوویدا، حکومەتی بەریتانیا هێزی دابەزاندە ئوردونەوە..[1]

***هەڵوێستی تورکیا***

لە١٩٥٨/٧/١٨ پاش شکستی پیلانی دەستێوەردانی بەریتانیا لەعێراق و لەڕێگەی ئوردونەوە، حکومەتی ئەمریکا، بەریتانیای لەوە ئاگادار کردەوە کەتورکیا بڕیاری داوە پەلاماری عێراق بدات و داگیری بکات، بۆئەم مەبەستەش داوای هاوکاری ئەمریکای کردووە، بەتایبەت لەڕووی ئاسمانییەوە، لەبەرامبەردا وەڵامی حکومەتی بەریتانی زۆر خێراو یەکلاکەرەوەبوو، کەدژی هەرجۆرە کارێکی لەم چەشنەبوو.. دیارە ئەمریکا پاش شۆڕشی ١٤ی تەموز پیلانێکی وەهای هێنابوویە ئاراوە لەم جۆرە، تاکاری لەسەر بکات و تورکیا لەلایەن خۆیەوە هەستێت بەم کارە و ئیسرائیلیش بەرامبەر بەکۆماری عەرەبی یەکگرتوو، بەم جۆرە ئەمریکا دەیویست سەرلەنوێ نەخشەی جیۆپۆلەتیکی ناوچەکە بگۆڕێ، بەلام نەیاری بەریتانیا و دروست بوونی ململانێ لەگەڵ یەکێتی سۆڤییەت، وازی لەم فیکرە هێنا..[2] هەرپاش شۆڕش حکومەتی تورکیا لەبەیانێکدا ڕایگەیاندبوو" سەرکێشکارە سیاسییەکانی عێراق، لەپشت هەستان بە

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٨٤.

[2] نجم، محمود ، المقايضة بين برلين وبغداد الخلفية التأريخية لحرب لم تنته بعد، منشورات الغد، ص٥٣,٥٢.

کودەتاکەیانەوە، هەوڵی دەسەڵات، گرتنیان بوو بەسەرپەیمانی بەغدادا، کەسەرچاوەی ئاشتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، هەروەها هەڵبژاردنی ڕۆژی کۆبونەوەکە(١٤/٧/١٩٥٨) بۆ ئەنجام دانی کودەتاکەیان باشترین بەڵگەی ئەم ڕاستی‌یەیە [٣] جگە لەمانەش بە پێی پەیامی( قونسوڵییەی بەریتانیا لە ئەستەمبوڵ ١٨/٧/١٩٥٨) ئاماژە بەوە دەکات تورکیا لە هەموو ئەو دەوڵەتانەی هەڵوێستیان نواندووە، بەرامبەر باری سیاسی تازەی عێراق، توندتر بووە و هەوڵی داوە کارێك بکات ، هەربۆیش سەرنجی هەڵوێستی کوردی داوە لەکوردستانی عێراق تابزانێ خۆیان سازنەداوە !! تائەویش لەلایەن خۆیەوە تەقەلای کوردەکان پوچەڵ بکاتەوە و باکوری عێراق داگیر بکات [٤] لەڕاستیدا ئەمە ترسێکە لە ناخی تورکیادا بەردەوام زیندووە، لەگەڵ نزیك بوونەوەی هەرجۆرە گۆڕنکارییەك لەعیراقدا، تورکیا دەکەوێتە خۆسازدان بۆ ئەوەی نەبادا کوردەکانی عێراق سود لەم جۆرە هەلانە وەربگرن وبە گوتەی خۆیان لە عێراق جیاببنەوە ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەو خەونەشیان ناشارنەوە و لەم جۆرە کاتانەدا باسی دەکەن، کە ویلایەتی موصل سەر بەتورکیا بووە و بەزۆر لێی دابڕاوە.. [٥]

***هەڵوێستی ئەمریکا***

ئایزەنهاوەری سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، پاش بیستنی هەواڵی شۆڕش، ڕایگەیاندبوو: ئەمە ئەو وڵاتەبوو کەئێمە متمانەمان

---

[٣] الزبيدي، ليث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانية ، بغداد ١٩٨١ ص٢١١,٢١٢.

[٤] بارزانی، مسعود، بارزانی و بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، ل٧٢، چاپی یەکەم بەکوردی، ١٩٩٨، چاپخانەی خەبات، دهۆك..

[٥] دەکرێت لە گەڵ هەر جۆرە هەوڵێکی کوردەکانی عێراقدا، ئەمانیش خەونەکەیان زیندوو بکەنەوە و وەك دوورگەی قوبروصی لێ بکەن..

کردبووه سەری تاوەك پێگەیەك بەکاری بهێنین بۆگەشەکردنمان لەناوچەکەدا[1] هەروەها ئایزەنهاوەر ئەم شۆڕشەی بەشۆڕشێکی چینی وەسف کرد و وتی گەربێتوو گۆڕانکارییەکان بەم جۆرە ڕووبدەن وهەڵوێستی جدی لەبەرامبەردا وەرنەگیرێت، ئەوا دەبێتە مایەی سڕینەوەی هەژمونی ڕۆژئاوا لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، لەهەمان کاتدا ئەم شۆڕشەی بەراورد کرد بەکودەتای کۆمۆنیستی لە چیکۆسلۆڤاکیا و سەرکەوتنی کۆمۆنیستەکان لەچین ساڵی ١٩٤٩ و هەوڵی کۆمۆنیستی بۆدەستگرتن بەسەر کۆریا و هیندی چینیدا لەساڵی ١٩٥٠.[2]

***هەڵوێستی بەریتانیا***

هەرلەیەکەم ڕۆژی شۆڕشی ١٤ی تەموزەوە، بەریتانیا هەوڵی هاتنە ناوەوەی سەربازی دەدا بۆ لێدانی شۆڕش، ئەم دەستێوەردانەشی بەستبوویەوە بە متمانە کردنە سەر هێزی ئەمریکی، بەلام ئەمریکا ڕەتی بەشداری کردنی کردەوە لەم هەوڵەدا، هەرچەند بەریتانیا هێزی سەربازی خۆی دابەزاندە ئوردون بەمەبەستی پارێزگاری کردن لە شاحسێن.[3]

لێرەدا دەکرێت سەرنجی هەڵوێستی ئەمریکا بدەین سەبارەت بەدەست وەردان لەعێراق، لەلایەك نەرمی دەنوێنێت سەبارەت بەپرۆژەی تورکیا بۆ هاتنە ناوەوەی عێراق، کەدیارە تورکیا هەروا بەئاسانی نەیدەتوانی بێ پرسی ئەمریکا ئەم کارە بکات و پاشان ئەمریکاش بەئاسانی دەیتوانی تورکیا لەعێراق بهێنێتە دەرەوە و خۆی دەست بگرێت بەسەر عێراقدا،

---

[1] کەناڵی ئاسمانی ئەبوزەبی بەرنامەی( بين الزمنين) ئامادەو پێشکەش کردنی (احمد مهنا) بۆ زانینی درێژەی هەڵوێستی ئەمریکا پاش شۆڕش خوێنەر دەتوانێت سەیری باسی (جوڵانەوەکەی شواف) بکات.

[2] نجم، محمود، المقايضة بين برلين وبغداد الخلفية التأريخية لحرب لم تنته بعد، منشورات الغد، ص٢٨.

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٣٨.

هەرچەند دەکرێت لەو کاتەدا تورکیا هەوڵی گەڕانەوەی ویلایەتی موصلی دابێت بۆ ژێر دەسەلاتی خۆی، بەرامبەر بەرژەوەندییەك کەتورکیا بۆئەمریکای دابین بکات، بۆیە ئەمریکا نەرمی دەنوێنێت دەربارەی پرۆژەی تورکیا.. بەلام سەبارەت بەپرۆژەکەی بەریتانیا ئەمریکا ئامادەنییە هاوکاری بکات، کەئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە بەریتانیا جارێکی تر هەژمونی خۆی بەسەر عێراقدا تۆخ دەکاتەوە لەکاتێکا کەهەژمونی بەریتانیا بەسەر عێراقداو لەبەرامبەر هەژمونی ئەمریکادا لەپێش شۆڕشی ١٤ی تەموز لەپاشەکشەدا بووە، بەم جۆرەش دەبینین ناکۆکی دروست دەبێت لەنێوان بەریتانیاو ئەمریکادا تادەگاتە ئەوەی بەریتانیا بەلای سۆڤییەتدا بیشکێنێتەوە، و ئەمریکاش دەست بداتە سازدانی جولانەوەی شەواف ودەستوەردان لەکاروباری عێراق...

### هەڵوێستی یەکێتی سۆڤییەت

پاش ٢٤ سەعات لەسەرکەوتنی شۆڕش لەعێراق، یەکێتی سۆڤییەت دانی نا بەرژێمی تازە دروست بووی عێراقدا، لەهەمان کاتیشدا خەڵکی خۆپیشاندانی گەورە ڕژانە سەرشەقامەکان وەك پشتگیری بۆ گەلی عێراق دژ بەهەوڵەکانی دەستێوەردانی ئەمریکی لەکاروباری ناوخۆیی لوبنان و عێراقدا، لەم بارەیەشەوە دوو بەیاننامە دەرکرا لە ١٦و١٧/٧/١٩٥٨ داو ڕەخنەی لەئەمریکاو بەریتانیا گرتبوو سەبارەت بەبانگەشەی ئەوەی کەولاتانی لوبنان و ئوردون داوای دابەزاندنی هێزیان کردووە لە ولاتەکانیاندا، لەم بارەشەوە حکومەتی سۆڤییەت لەدوو توێی نامەیەکدا بۆسەرانی ئەمریکاو بەریتانیاو فەرەنساو هند، ئاگایی خۆی دابوو لەم

بارەیەوە و ڕایگەیاندبوو دەستوەردان لەکارو باری ناوچەکە، لەکۆتایدا ئاکامی چاوەڕوان نەکراوی لێ دەکەوێتەوە.[1]

***هەڵوێستی چین***

ڕۆژی ١٦ی تەموزی ١٩٥٨کۆماری چین دانی نا بە کۆماری تازە دروست بووی عێراقدا و خۆشحاڵی خۆی دەربڕی سەبارەت بەڕزگاربوونی عێراق لەپاشکۆیەتی ئیمپریالیزم، لەڕۆژی ١٧ی تەموزیشدا ڕۆژنامەکانی چین ڕایانگەیاند کەهەزاران چینی خۆیان خۆبەخش کردووە تا بەرگری لەکۆماری تازە دروست بووی عێراق بکەن، دژ بەهەرجۆرە دەستێوەردانێکی ئەنگلۆ-ئەمریکی [2].

***هەڵوێستی ئێران***

لەئێران ژمارەیەك لە بەکرێگیراوە ئەوروپی یەکان هەوڵیاندا دزە بکەنە ناو عێراق و دەست بدەنە کاری تیرۆرکردن.. هەروەها شای ئێرانیش ماتەمی وڵاتەکەی ڕاگەیاند بۆماوەی (٨) ڕۆژ بۆگیانی ئەوانەی کەلە ١٤ی تەموزدا کوژران..[3]

***هەڵوێستی ئیسرائیل***

بن گۆریۆنی سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل لەبەردەم لیژنەی ئاسایشی دەرەکی لەکنێستی ئیسرائیل رایگەیاند: بەڕاستی ئاسایشی ناوچەکە بەتەواوی کەوتۆتە ژێر کاریگەری مەترسیدارەوە بەهۆی شۆڕشی عێراقیەوە، لەبەر ئەوە داواکاریمان تازە دەکەینەوە تاچەکی قورسی ڕۆژئاوامان پێبگات، هەروەها داواکەمان دووپات دەکەینەوە بۆ هەرسێ

---

[1] الزبيدي، ليث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانية ، بغداد ١٩٨١ ص٢١٠.

[2] نجم، محمود ، المقايضة بين برلين وبغداد الخلفية التأريخية لحرب لم تنته بعد، منشورات الغد، ص١١٢,١١٣.

[3] الزبيدي، ليث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانية ، بغداد ١٩٨١ ص٢١٣

دەوڵەتی ڕۆژئاوایی کەئەو زەماناتانەمان بۆ نویٚ بکەنەوە کە ساڵی ١٩٥٥ سەبارەت بە پاریٚزگاری مانەوەمان لەسنورەکانی ئیٚستامان داکۆکی دەکاتەوە.. ولد گۆلمانی باڵیٚۆزی ئەمریکا لەعیٚراق دەڵیٚت: مردنی نوری سەعید زیانیٚکی گەورەبوو بۆ ئیسرائیل..[٤]

بەم جۆرەش بەدەر لەهەڵویٚستی توندی هەندیٚك وولات لەسەر شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ لەعیٚراقدا، پاش مانگیٚك زیاتر لە(٥٠) دەوڵەتی جیهانی دانییان نا بە حکومەتی تازەی عیٚراق لەڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا، ماوەیەکی زۆریش تیٚ نەپەڕی تا ئەوەی دەسەلاتی تازە لە عیٚراقدا بەرەو سەقامگیر بوون ڕۆشت..[٥]

---

[٤] هەمان سەرچاوەی پیٚشوو لاپەڕە٢١٣.

[٥] خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر – قم ١٩٩٧ ، ص٨٤.

# ڕاکێشانی تەرمەکان

یەکێك لەو دیاردانەی کەلەگەڵ شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ هاتەکایەوە بریتی بوو لەڕاکێشانی تەرمی ئەوانەی کوژرابوون بەسەرزەویدا و سوکایەتی کردن پیّیان، بێگومان ئەم دیاردەیە بەجۆرێك بوو کە کوژراوەکەلەهەموو بەهایەکی مرۆیی دەشۆرایەوە، هەرچەند ڕەگ و ریشەی ئەم دیاردەیە دەگەڕێتەوە بۆسەدەی نۆزدەهەم و ئەنجام دانی کاری لەم جۆرە لەدژی والی‌یەکانی دەسەڵاتی عوسمانی کەبەسەر بەغدادەوە دانرابوون وەك (عەلی پاشا)١ تەنانەت پێش ئەوەش لە مێژووی عێراقدا و لە سەردەمی ئەمەوی وعەباسیەکاندا شتی لەم جۆرە ڕویداوە وەك شەهیدکردنی حەزرەتی (حسینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیب). بەڵام دەکرێت ئەم دیاردەیە لەگەڵ هەڵایسانی شۆڕشی ١٤ی تەمووزدا زیاتر بەرفراوان بوویێت ، تائەوەدی کەبوبێتە یەکێك لەدەرهاویشـ تەکانی شۆڕشەکەو پاشان ئیجراکردنی لەلایەن شیوعیی‌یەکانەوە بەجۆرێك کەوەك دەگێڕنەوە کەم ڕۆژ هەبووبێ کەسێ ڕانەکیشرابێ تەنانەت بەزیندوویی.. بەدەر لەم حاڵەتە لەسەرەتاوە دیاردەکە گەیشتبوویە ئاستێك هەندێ کەس بەشۆڕشی بزانن! لێرەدا دەکرێت هەڵوێستەیەك لەسەرئەم دیاردەیەبکەین و بپرسین ئایا ئەم حاڵەتە توندوتیژی شۆڕشە یان بەشێکە لەشۆڕش؟ ئایادەکرێت شۆڕشێك بێ ئەم جۆرەدیاردانە ئەنجام بدرێت؟

کاتێك هێرش کرایە سەر(کۆشکی ریحاب) پەیتا پەیتاش لەلایەن دەسەڵات دارانی سەربازیشەوە و لەڕێگەی رادیۆوە بانگەواز بڵاودەکرایەوەو هانی خەڵکی دەدرا تابرژێنە سەرشەقامەکان لەدژی دەسەڵاتی پاشایەتیو

---

[1] کەناڵی ئاسمانی ئەبووزەبی، بەرنامەی (بین الزمنین) ئامادەو پێشکەش کردنی (احمد مهنا) سەرەتای ٢٠٠٢.

راپەرن. بەم جۆرەش هەرهێندەی پەلاماری سەرکۆشکی ریحاب لەلایەن ئەفسەرەکانەوە بەپایان گەیشت، بارەکە درایە دەست[2] ئەو جەماوەرەی کەخۆیان هانیان دابوون بڕژێنە سەرشەقامەکان! ئەوانیش هەربەخێرایی حەبلیان هێناو دەستیان دایە راکێشانی تەرمەکان ولەم نێوەشدا تەرمی (عەبدولئیلاهی) خالی مەلیک فەیسەلی دووەم ، زۆربەخراپی مامەلەی لەگەلدا کرا، [3] شاهید حالێك دەگێڕێتەوە کەتەرمەکەی عەبدولئیلاهیان بەبەردەممدا ڕاکێشا،کەرووت کرابوویەوە وهیچ جۆرە جل و بەرگێکی لەبەردا نەبوو!، عەبدولئیلاه کەسێکی سپی پێست بوو،ئەوانەی ڕایان دەکێشا عەورەتی عەبدولئیلاهیان بڕیبوو خستبوویانە ناودەمی یەوە، لەکۆشکی ریحابەوە حەبلیان خستبوویە ژێربالی یەوەو راکێشرابوو هەتا بەردەم بارەگای وەزارەتی بەرگری و لەوێدائەندامێکی حزبی شیوعیەك هەستابوو (١٠٠) چەقۆی لێدابوو،پاشان هەلواسرابوو بەعەموودێکی کارەبادا هەرلەبەردەم وەزارەتی بەرگریدا،[4] تەرمی نوری سەعیدیش

[2] العلوی،حسن (عبدالکریم قاسم رؤیة بعدالعشرین) دار الزوراء للنشر،لندن ١٩٨٣ چاپی یەکەم ل.٣٦.

[3] عەبدولئیلاه خالی مەلیك فەیسەلی دووەم، بەداڕێژەری سیاسەتی عێراقی دێتە ژماردن پاش مردنی مەلیك غازی وهاتنە سەرکاری مەلیك فەیسەلی کەم تەمەن، لەپشت پەردەوە بەرپرسی یەکەمی دەسەلات بووە، پەیوەندی پتەوی هەبووە لەگەل بەریتانیادا، پێویستە بووترێ لەناوبردنی هەرسێ کەسایەتی دەسەلاتی عێراق(مەلیك فەیسەل و عەبدولئیلاه و نوری سەعید) بەو جۆرە و چاوپۆشی لێ نەکردنیان لەبەرئەوەبووە نەبادا یەکێك لەم کەسایەتی یانە پەیوەندی بەولاتێکی وەك بەریتانیاوە بکەن و جارێکی تر بگەڕێنەوە سەرکورسی حوکمڕانی عێراق هەروەك لەبزوتنەوەکەی ڕەشید عالی گەیلانی ١٩٤١ دا رویدا، هەروەها مەترسی دروستبوونی پالپشتیش بۆیان لەناوخۆی عێراقدا.. لەناو بردنی ئەم سێ کەسە پێش ١٤ی تەمموزیش هەروەها هەولی لەناوبردنیان دراوە لەلایەن سەرکردەکانی شۆڕشەوە..

[4] لەهەمان ئەو جێگەیەدا سالی ١٩٤٥ پاش ئەوەی بەکۆمەلێك فێل توانرا قەناعەت بکرێت بەسەرهەنگ

**لەعەبدولئیلاھ خراپتری پێکرا. نوری سەعید ئاگاداربوو لەوەی کەچی کرابوو بەتەرمەکەی عەبدولئیلاھ، لەبەرئەوە دەیویست بەھەرنرخێك بووبێت خۆی ڕزگاربکات.[1] بەڵام کاتێـــك کوژراوتەرمەکەی برایە بارەگای وەزارەتی بەرگری و پاش ئەوەی کەدڵنیابوون لەوەی نوری ســەعیدە، لەوێدا مایەوە هەتا شەقامەکانیبەغداد چۆڵ بوون لەخەڵکی داخ لەدڵ دژ بەکاربەدەستانی سەردەمی پاشایەتی، شەوبەنهێنی تەرمەکەیان گواستەوە بۆ گۆڕستانی (بابولموعەزەم) و کرابەژێر خۆڵەوە،[2] بەڵام لەڕۆژی دوایدا جەماوەری بەغداد بەھاندان و رۆڵ بینینی شیوعیەکان روویان کردە گۆڕستانەکەو تەرمەکەی نوری سەعیدیان لەژێر خۆڵ دەرھێناو رایان کێشا بەدوای خۆیاندا،ئەم کارە ھەرچەند وەبەرھاتووی ھەڵوێست و سیاسەتەکانی خودی نوری بوو، بەڵام شیوعیەکانیش رۆڵی گەورەیان تێدا گێڕابوو، بەم جۆرەش تەرمەکەی نوری سەعید دەرھێنراوبەسەر شەقامەکاندا راکێشرا،ھەتا گەیەنرایە بەردەم بینایەی باڵێوزخانەی میسرولەوێدا پاشماوەی جەستەکەیان سوتاند.[3]**

---

صلاح الدین صباغ،کەیەکێ بوو لەو چوارئەفسەری بزوتنەوەکەی رشید عالی گەیلانی و ھەرئەم مابوریەوە،
تالەتورکیا بگەرێتەوەو پاش گەرانەوەی بریاری لەسێدارەدانی بەسەردا جێبەجێکرا، و لەبەردەم بارەگای وەزارەتی بەرگریدا حوکمەکە جێبەجێکرا ،لەوکاتەشدا کەبەسێدارەکەوەبوو،(دیارە سێدارەیەکی تایبەت و بەرزیان بۆ دانابوو ) عەبدولئیلاھ بەژێر تەرمەکەیدا بەگاڵتەپێکردن و لەخۆبایی بوونەوە بەسەیارەکەی هات و
چۆی دەکرد ، ھەرلەھەمان ئەو شوێنەشدا خۆی ھەڵواسرا بەعەموودێکی کارەبادا (اطراف من التأريخ العراق
المعاصر، بحث لم تنشرللمفكر والمحامى العراقى محمد احمد الراشد..

[1] دەکرێت ویستبێتیان بەدەردی تەرمی عەبدولئیلاھی لێنەیەت، دیارە ئەمەش پاش بینینی چارەنووسی عەبدولئیلاھ
و ئاگاداربوونیش لەرقی پەنگ خواردووی جەماوەر لەنوری سەعید..

[2] خدوری، د.مجید (العراق الجمهوری) چاپی ئێران ۱۹۹۷ ،چاپخانەی ئەمیر-قوم، ل.۷۹.

[3] کەناڵی ئەبووزەبی ئاسمانی بەرنامەی (بین الزمنین) ئامادەوپێشکەش کردنی (احمد مهنا) سەرەتای ۲۰۰۲.

لەدرێژەی ڕاکێشانەکەدا زۆرێك لەئەندامانی لەشیان بڕیبوو،لەهەمان کاتدا ئەوکەسانەی پارچەیان لێکردبوویەرە بەکۆڵانەکانی بەغدادا دەیان گێڕاو دەیان ووت: ئەمە پارچەی جەستەی نوری سەعیدە! یەکێك لەوانەی ڕوداوەکەی بەچاوی خۆی بینیوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: کەسێك لەوانەی تەرمی نوری سەعیدی ڕادەکێشا پەنجەیەکی نوری سەعیدی بڕیبوو خستبوویەدەمی نورییەوە وهاواری دەکرد بەم پەنجەیە بڕیاری کوژرانی هەزاران کەس درا[٤] لەگەڵ هەموو ئەمانەشداو لەو هاوینە گەرمەدا تەرمەکەی نوری سەعید بۆگەنی کردبوو،کاتێکیش بەسەر شەقامەکاندا ڕادەکێشرا ناوسکی هاتبووە دەرەوە... ئەمانە دوو دیمەنی سەعاتە سەرەتاییەکانی تەمەنی شۆڕش بوون، بەڵام ئەوەنەبێ تەنها لەم حاڵەتەدا شتی لەم جۆرە رویدابێ، ئەنجامی حوکمی ٣٨ساڵەی دەسەلاتی پاشایەتی ئەم بارەی دروست کردبێ! بەڵکو گەر وردتر سەرنج بدەین ئەم حاڵەتە هەم لەبزوتنەوەکەی شەواف لەموصل لە١٩٥٩/٣/٨ وکارەساتەکەی کەرکوکی١٤و١٩٥٩/٧/١٥ دووبارەبونەتەوە، بۆنمونە لەبزوتنەوەکەی شەوافدا پاش ئەوەی دەیان کەس بەسەر شەقامەکانیشدا ڕاکێشران و بەعەموودی کارەبادا هەڵواسران بەخودی سەرکردەی بزوتنەوەکەشەوە، یەکێك لەشیوعیەکان بەناوی (جرجيس فتح الله نصراني)پاش ئەوەی تەرمی کەسایەتییەکی ناسراوی شاری موصل ڕادەکێشرێ کەناوی(شێخ هاشم عبدالسلام) بووە، جرجيس هەڵدەستێ بەڕیشی ئەو کەسایەتییە پێڵاوەکانی پاك دەکاتەوە!![٥] ئەم جۆرە کارە هەرچەند بەووردی توێژینەوەی

---

[٤] محمد احمد الراشد نوسەرو بیریاری عێراقی (مێژووی‌سیاسی عیراق) بلاّونەکراوەتەوە

[٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو

کۆمەلایەتی لەسەرنەکراوە، بەڵکو تەنها وەك توونددوتیژی شۆرش ناوی براوە، کەکاتێك جەماوەرێکی چەوساوە دژ بەدەسەلاتێکی داسەپاو ئەنجامی دەدات. لەم نێوەشدا پارتە سیاسی یەکان دەستخۆشی یان لەمەسەلەکە دەکرد، هەروەك چۆن هەندێ لەگەلانی ناوچەکە بەجۆرێك لەهەڵچوونی عێراقییەکانیان وەسف دەکرد، تەنانەت هەندێ لەتوێژەرەکان گەلی عێراقی لەسەربنەمای ئەم جۆرە دیاردەیەوەسف دەکەن.. بەلام لەراستیدا گەرواقیعیانە لەمەسەلەکە بڕوانین دەبینین پێچەوانەی ئەم بارەیە، بەڵکو مەسەلەکە کارێکی ترسنۆکانەیە،کەهیچ جۆرە ئازایەتی یەکی تێدا بەدی ناکرێت، جەماوەر لە١٤ی تەموزی ١٩٥٨ هیچ جۆرە قەلایەکی تۆکمەیان نەگرت،هەروەك لەشۆڕشی فەرەنسی وکوباو ئێراندا ڕویدا، هەروەها رووبەڕووی تانك و زرێپۆش و گوللەکانی دوژمن نەبوونەوە تا تەرمەکانیان رابکێشن وەك گوزارشتێك لەسەرکەوتنەکەیان، بۆنمونە بێئاگابوون لەوەی کەچی لەکۆشکی ریحابدا ڕوویداوە، تائەوەی مەسەلەکە بەتەواوی یەکلاکرایەوە لەلایەن سوپاوە، ئەوکات جەماوەر چوونە کۆشکەوە،هیچ دەستێکی جەماوەری تیانەبوو، ئیتر کەی راکێشانی تەرم و سوکایەتی پێکردنی کارێکی شۆڕشگێری و ئازایەتی یە؟بەتایبەت لەکۆمەڵگەیەکدا کەخاوەنی ئاینێکە دژی ئەم جۆرە کارانەیە! ..لەراستیدا سەرکردایەتی شۆرشیش ناتوانێ خۆی لەم بەرپرسیارێتی یە دەرباز بکات کەڕێگەی بەئەنجام دانی وەها کارێك داوە، تەنانەت سوپا تەرمەکانی دەدایە جەماوەر تابەو جۆرەی لێبکەن، ئەمەش وەك رەمزێك بۆسەرکەوتن. لەم نێوەشدا ئەوە بەدیار دەکەوێت کەشێوازێك لەمامەڵە هەبووە لەلایەن سوپاوە

لەگەڵ ئەو تەرمانەدا،هەندێك دراوە بەجەماوەر تابەو جۆرە یلێبکرێت و هەندێکی تریش پارێزراون..

لەم پێودانگەشەوە ئەم جۆرە دیاردەیە بووەتە بەشێك لەو شۆرش و کودەتاو بزوتنەوانەی لەعێراقدا کراون لەبەردووهۆکار:_

١ - دەبینین ئەو سەرکردەو سەرۆکانەی هاتونەتە سەردەسەڵات، لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی شەرعی نەهاتوونەتە سەرحوکم، بەردەوام لەپێناومانەوەو چەسپاندنی حوکمەکەیاندا، پشتیان بەدەسەڵاتی سەربازی بەستوە بۆپارێزگاری لەکورسیەکەیان و ڕێگەیان نەداوە بەئازادی بیروراو، هەڵبژاردنی ئازادانەو دیاری کردنی نوێنەری راستەقینەی خۆیان، هەربۆیەش کەوتوونەتە دژایەتیکردنی خەڵکی و سەپاندنی تاکە ئایدیاو پارتێك بەسەریانداو سەرکوت کردنی ئەوانەشی کەنەیاری ئەو دەسەڵاتەبوون، ئەمەش قۆناغی توندڕەوی و سەرکوت کردن و ستەمی دەسەڵاتە،کەلەدوایدا ئاکامی هاوشێوەی شۆرشی ١٤ی تەمووزی لێدەکەوێتەوە.

٢-ئەوجەماوەرەش کەلەژێر سایەی ئەودەسەلاتەدا ژیاوەو چەندین ساڵ تالاوی سیاسەتی هەڵە و چەواشەو دکتاتۆریەت و سەرکوتکردنیئەو دەسەلاتەی چەشتووە، وپارتە سیاسیەکانیش کەهەمیشە لەوجۆرە فەزایانەدا یان لەقۆناغی زۆرنهێنی خەباتدا بوون، یان خەباتی چەکداریان دەستداوەتێ، تینوی رۆژێك بوون تۆڵەی خۆیان بسەننەوە، و لەچرکەساتی سەرکەوتنی شۆرشدا بەم گیانی تۆڵەسەندنەوەوە دێنە گۆڕەپانەکەوە. هەربۆیەش دەبینین بەرەنجامی ئەوکارەی کەجەماوەرو پارتەسیاسیەکان و دەسەلاتی سەربازی ئەوئاکامەی لێ دەکەوێتەوە کەباسمان کردلەسەرەتاوە.

# بەرگری میللی

ناکرێت حوکمی سەربازی زۆر درێژە بکێشێ گەر هەوڵی پەیداکردنی شەرعیەتێك نەدات، بێگومان ئەم شەرعیەتەش لەڕێگەی متمانەی گەلەوە دەبێت،ئەو خۆپیشاندان و پێشوازییە گەرمەی کەخەڵکی بەغدادهەرلەیەکەم ساتی سەرکەوتنی شۆرش دەریان بڕی، ودڵخۆش بوونیان بەهاتنەناوەوەی سوپاودەست گرتن بەسەرحوکمدا، وای کرد عەبدولکەریم قاسم هان بدات لەسەر ئەو بیروڕایەی کەشۆڕشەکەی شۆڕشێکی سەربازی و جەماوەری بووە، لەپێناو ئەوەشی بەڵگەی بەشداری گەل و پشکی لەسەرخستنی شۆڕشدا لەدەستدابێت، بڕیاری دامەزراندنی لیژنەیەکی هەمیشەیی دا، کەخەڵکی لەڕێگەیەوە دەیانتوانی گوزارشت لەپشتگیری راستەقینەی خۆیان بکەن لەشۆڕش، لەم نێوەدا هیچ هۆکارێکی باشتری بەدەستەوە نەبوو، جگەلەدامەزراندنی میلیشیایەکی مەدەنی و ڕێکخستنی لەسەرشێوازی ئەو میلیشیایەی کەلەووڵاتانی کۆمۆنیستیداهەبوو.[1]

لەسەرئەم مەسەلەیە زۆرلا بڕوایان وایە کەخاوەنی فیکرەی گەلێکی چەکدار، یان ڕاهێنراو لەسەرچەك، لەبنەڕتدا دەگەڕێتەوە بۆمەلیك غازی، کەسەرقاڵی دامەزراندنی سەربازگەی (لاوان) بوو ئاوێتە بەسروودی جەنگی، بەلاّم لەسەردەمی خۆیدا، لەگەڵ کەسدا پێی نەجەنگاوە، هەرچەندە ئەم کارەی مەلیك غازی پاش خۆی سوودی لێوەرگیرا ،کاتێك ئەم هێزە تەکلیف

---

[1] خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر – قم ١٩٩٧ ، ص ١١٣.

کران بەپاراستن و پاسەوانی بەغداد و شارەکانی تر، لەکاتی چوونی هێزی عێراقی بۆشەڕی بەریتانیەکان لەلیوای دلیم لەسالی١٩٤١ دا..[٢]

ڕۆژی یەکەمی شۆڕش هەندێ لەکوڕانی گەڕەکی عەباسییە لەکەڕادە مەریەم کۆدەبنەوە، بەمەبەستی لێکۆڵینەوەی ئەوەی پێویستەلەسەریان ئەنجامی بدەن بۆپارێزگاری لەشۆڕش، هەربۆیە بڕیاردەدەن کۆمەڵەیەك پێك بهێنن، کەپارچەیەك قوماشی یان بەستبوو بەباڵیانەوەو لێی نوسرابوو(بەرگری میللی) ئەمەش وەك لاسایی‌کردنەوەیەك بۆبەرگری گەلی (بۆر سەعید) دژی هێرشی سێ قۆڵی بۆسەرمیسر، هەرهێندەی ئەم (کۆمەڵە لاوە)کاتێك بەرەو (گۆڕەپانی جەنگ )کشان لەشەقامی رەشید!! دەستیان دایە وێران کردن و شکاندنی ناونیشانی سەردوکان و بازاڕەکان و شکاندنی شوشەی دوکان و شوێنە بازرگانیەکان.. هەرچەند زۆر گومانیش لەسەر ئەوە هەن کەکەسانی تریش هەبوون پێش دامەزراندنی بەرگری میللیش کاری لەو جۆرەیان کردبێ، بەتایبەت لەڕۆژی یەکەمدا کەتەنانەت خەڵکی خەریك بووباڵێوزخانەی بەریتانیاش وێران بکەن و شۆڕش لەدەستی ئەفسەرکان دەربچێ!

پاش دوو هەفتە لەسەرکەوتنی شۆڕش عەبدولکەریم قاسم ڕێگەی دا بەدامەزراندنی میلیشیایەك بەناوی(بەرگری میللی)، ئەمەش بەبڕیارێکی سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکان ژمارە(٩٨٩) لە١٩٥٨/٨/١دا.[٣] ئەم کارەش وەك دووبارەکردنەوەی نەریتی بەرگری میللی لەلای وولاتانی

---

[٢] العلوی، حسن (عبدالکریم قاسم رؤیة بعد العشرین) منشورات دار الزوراء، لندن ١٩٨٣، ص٣٨.

[٣] دەکرێت لەسەرەتادا مەترسی ئەوەی هەبووبێت کەپەلاماربدرێت، لەلایەن وولاتێکەوە تا سودیش لەمانە وەربگرێت، یاخود مەترسی ئەوەی هەبووبێت هەڵگەرانەوەیەکی سەربازی ڕووبدات وەك ئەوەی موصل، لەم حاڵەتانەدا ئەم جۆرە تەشکیلانە سودی خۆیان دەدا بەدەستەوە.

سۆسیالیستی هاتە ئاراوە، وەك ئەوەی ڕووبەڕووی هێزی نازییەکان بوونەوە.. بەدەر لەم حاڵەتەش لەهەڵمەتێکی ڕاگەیاندنی پشتیوانی بۆ ئەم هێزە لەڕۆژنامەکاندا وێنەی ئەو ژن و پیاوە بەتەمەنانە بڵاودەکرایەوە کەتەمەننای بوونە ئەندامیان دەکرد لەو ڕێکخراوەدا و بەوهیوای پلەی شەهیدیان دەست بکەوێت. دیارە ئەمەشیان زیاتر بۆجەنگاندنی بنەماڵەی پاشایەتی مەبەست بوو کەهیچیان لەدوا بەجێ نەمابوو جگە لە گۆڕستانێك نەبێت..[1]

لەلایەکی دیکەشەوە هەر بە خێرایی حزبی شیوعی دەست پێشخەری دروست کردنی کۆمەڵەی چەکداریان کردلە ژێر ناوی بەرگری میللی کە هاو تەریبی خواستی قاسم بوو، لەروانگەیەشەوە پارتی ناوبراو دەستی کردە دانانی نوسینگە بۆ ناو نوس کردنی خۆبەخشەکان و لەم بارەیەوە حزبی شیوعی لە بەیاننامەیەکیدا سەبارەت بە پێکهێنانی بەرگری میللی و لە ١٣ خاڵدا کۆمەڵێك ڕێنمایی بۆ ئەندامانی دەرکردووە سەبارەت بە گرنگی پێکهێنانی بەرگری میللی و شێوازی پێکهێنان و نیشانەی ناسینەوەی ئەم بزوتنەوەیەو هەروەها شێوازەکانی خۆناساندن و بڵاو بوونەوە بەناو عێراقدا، ئەمە سەرەڕای چەندان تێبنی و ڕێنمایی تر کەخۆی لە تۆکمەکردن و کۆنترۆڵ کردنی ئەم میلیشیایەدا دەبینێتەوە.

ئەم مومارەسە یەك لایەنە لە نێو بەرەی یەکێتی نیشتمانیدا و بە بێ داواکاری رەسمی لەدەسەڵات، وای کرد تا لە سنوری باری ئاسایی دەربچێت و مەترسی دروست بکات بۆ سەر حکومەتی تازە دروست بووی

---

[1] العلوی، حسن (عبدالکریم قاسم رؤیة بعد العشرین) منشورات دار الزوراء، لندن ١٩٨٣، ص٣٨-٤٠

عێراق، هەربۆیەش حکومەت لە ١٧ی تەممووزدا بەیانی ژمارە(١٦) ی تایبەت بەم بوارەی دەرکرد و تێیدا ئاگایی دابوو بە هاوڵاتیان بۆ وەڵام دانەوەی ئەو جۆرە داوایانەو لەهەمان کاتدا ئاماژەی بەوە دابوو حکومەت خۆی بەرگری میللی پێك دێنێ و بۆ ئەم مەبەستە حاکمی سەربازی لە ٢٠ی تەمموز بڕیاریدا سەرجەمی نوسینگەکانی ناو تۆمارکردن دابخات جگە لەوانەی کەرێگەیان پێدراوە..

دەکرێت لەم نێوەشدا قاسم ویستبێتی سود وەربگرێت لە پێك هێنانی ئەم میلیشیایە لەلایەك بۆ بەرەنگاربوونەوەی یەکێتی خوازەکان و لە هەمان کاتدا بۆ پشتگیری کردنی زیاتری سوپاو دەسەڵاتەکەی.. هەر پاش ئەوەش ئەنجومەنی سیادە لە رۆژی ١٩٥٨/٨/١ دا یاسای بەرگری میللی داڕشت کەخۆی لە (١٣) ماددەدا دەبینیەوە وتایبەت بوو بە ئەرکی ئەندامانی ئەم رێکخراوەو بەشداربووانی و مەرجی بەشدار بوون و ئیمتیازاتەکانیو هەندێك یاسای تایبەتی تر بەتایبەت، لەڕووی سەربازییەوە..شایانی باسە لە رۆژەکانی سەرەتای ناو نوسیندا خەڵکێکی زۆر روویان دەکردە نوسینگەکانی ناو تۆمار کردن و لە دوو رۆژی یەکەمدا نزیکەی (٧٠٠٠) کەس ناویان تۆمار کردبوو، بڕیاریش درا (عەقید روکن شاکر علی )بکرێتە سەرکردەی بەرگری میللی [٢]

لێرەدا دەتوانین پێکهاتەی ئەم تەشکیلاتە لەپاش شۆڕشی ١٤ی تەموز لەچەند خاڵێکدا شی بکەینەوە:-

[٢] تأریخ الوزارات العراقیة فی العهد الجمهوری، الجزء الاول، ١٤/٧/١٩٥٨-٧/٢/١٩٥٩، تألیف مجموعة من الاساتذة، سنة٢٠٠٠،ص١٤٨،١٤٩،١٥٠،١٥١،١٥٢.

١-ئەم تەشكیلاتە پاش شۆڕش دروست بوو، واتە پاش ڕووخانی دەسەڵاتی پاشایەتی و لەم بوارەدا هیچ جۆرە ڕۆڵێكیان نەگێڕا لەروخاندنی فیعلی ئەم دەستەڵاتەدا، ئەندامەكانیشیان پاش كۆتایی هاتنی شۆڕش خۆیان خۆبەخش دەكردبۆشەڕێك كەكۆتایی هاتبوو!! ئەمانە لەژێر سایەی حكومەت و دەستەڵاتێكدا دروست بوو بوون كەحیزب پاڵپشتی لێدەكردن، واتە كاتی كارەكەیان بەسەر چووبوو..

٢-هیچ نەبەردییەكی ئەنجام نەدا لەگەڵ هێزە داگیركەرەكاندا وەكودەركردنی ئەو هێزانە لەوڵاتدا،

٣-ئەوەی لەسەر ئەم تەشكیلە تۆماركراوە زیاتربریتی بووەلە(سوكایەتی كردن بەهاوڵاتیانی بێ گوناە، دژایەتی كردنی خەڵكی و دەستگیركردنی مامۆستاوپسپۆڕانی زانكۆیی، بێ هیچ حسابێكی باری كۆمەڵایەتی یان، ئازاردان و پەلاماردانی ئەوانەی خۆیان پێیان وابوو لەگەڵ دەسەڵاتی تازەدا نین).

٤-ئەمانە زیاتر وەك ڕێكخستنی ئاسایش و پۆلیس و دەزگای هەواڵگری وابوون، لەگەڵ بوونی جیاوازی لەوەی كەئەمانە هیچ جۆرە موچەیەكیان وەرنەدەگرت لەبەرامبەر كارەكانیانداو پەیوەست نەبوون بە دیسپلینی سەربازییەوەو بەئاسانی دزە دەكرایە ناویانەوە..

٥-هیچ جۆرە مەرج و پێوەرێكی كاركردنیان نەبوو، بەم جۆرەش لەو هەل و مەرجە ناسك و دژوارەی باری خێڵایەتی و حزبیدا، ئەمانیش گرفتی نوێ و تەنگ و چەڵەمەیان بۆ خەڵكی دروست كردبوو..

٦-هەموو ئەم جۆرە ڕێكخستنە میللییە چەكدارانە، بەجیاوازی ناوەكانیانەوە،لەپێناو ڕووبەڕوو بونەوەی سوپایەكی سەربازی پێك دەهاتن،

لەبەرئەمەش دەبینین ناکۆکی بەردەوام هەبوو لەنێوان ئەم ڕێکخستنەودەزگاکانی ئاسایش و هەواڵگری سەربازیدا.[1]

٧-بەرگری میللی ئەو مافەی دابوو بە خۆی کەبەبێ پابەندبوون بە یاساوە، دەسەڵاتی دەزگاکانی دەوڵەت بە کاربهێنێ، لەبەر ئەوەش حزبی شیوعی ڕۆڵی هەرە گەورەیان هەبوو لە پێکهێنانی ئەم بەرگرییەدا، لەدوایدا تەواوی کارەکانیان بەسەر ئەم حزبەدا شکایەوە.[2]

بەسەرجەم ئەو خاڵانەی باس کران لەسەرپێکهاتن و شێوازی کاری ئەم ڕێکخستنە، ئاخۆ دەبێت ئەرکیان چی بووبێ؟ بەتایبەت لەسەردەمێکی ناسکی پاش شۆڕش ودابەش بوونی عێراق بەسەردووپارچەدا لەسەرکردایەتی یەکەیەوە هەتاخوارەوەو تاچەند ئەم هێزە ڕۆڵی هەبووە لەزیاتر قوڵکردنەوەی ئەوبارەدا.

## ئەرکەکانی بەرگری میللی

١-لەسەرەتاداو لەبەرکەمی ژمارەی ئەندامەکانی، لەوناوچانەدا دروست بووبون کەدەیانتوانی پارێزگاری لەئاسایشی ناوخۆی خۆیان بکەن، یان وەستانەوە دژ بەهێرشی دەرەکی. واتە ئەرکی یەکەمیان پارێزگاری کردن بوو لەخۆیان.

٢-پاش ئەوە لەبەرامبەر ئەو چین و توێژانەدا وەستانەوە کەنەیاری عەبدولکەریم قاسم بوون، خۆشەویستیان بۆ قاسم نەبوو ئەمەش لەڕێی چاودێری و هەڕەشەکردن لێیان.

---

[1] هەمان لاپەڕەو سەرچاوەی پێشوو.

[2] بارزانی، مسعود، بارزانی و بزوتنەوەی رزگاری خوازی کورد، چاپی یەکەمی کوردی،١٩٩٨، دهۆك، ل٧٢

٣-لەسەردەمی توندتر بوونی ململانێی هەردوو سەربازگەی ناوخۆیی لە عێراقدا کە بەهۆی ناکۆکی قاسم و عارفەوە هاتبوە کایەوە، ئەمانە ڕۆڵی باشیان گێڕا لەدەستگیرکردنی سەرکردەکانی ئۆپۆزیسیۆندا.

٤-لەشەواندا دادەبەزینە شاروشارۆچکەکان و نمایشی دەسەڵاتی خۆیان دەکرد و دەستدرێژیان دەکردە سەرکەل وپەلی تایبەتی هاوڵاتیان و پشکنینی ماڵەکانیان و ئەنجام دانی کاری توندو تیژی دژی ئەوانەی خۆیان مەبەستیان بوو..[1]

گەربەووردی سەرنجی ئەوکارانەبدەین کەئەم میلیشیایە پیێی هەستاوە، دەبینین زیاتر خۆی لە هەندێ کاردا بینیوەتەوە کەمایەی ترس و تۆقین و دڵەڕاوکێی خەڵکی بووە، چونکە هیچ یاسایەکی ئەوتۆ نەبووە تاپەیوەست بن پێوەی، بەدەر لەم حاڵەتەش ئەوەی زیاتر مەسەلەکەی بەرەو توندی بردبوو، دەتوانین لەم دوو خاڵەدا کورتی بکەینەوە:

١- حزبی شیوعی لەبەرەنجامی ئەو مومارەسە سیاسییەی کەچەندین ساڵ بوو هەیان بوو، هەربەخێرایی توانیان دەست بگرن بەسەر ئەم میلیشیایەدا، و هێزەکانی بەرگری میللی و ملیشیاکانی لایەنگری خۆیان بەسەرجەم پارێزگاکاندا بلاو کردەوە،[2] بەجۆرێك لەدرێژەی ململانێی نێوان شیوعی و نەتەوەپەرستەکان و بەعسییەکاندا، بەرگری میللی ڕۆڵی گەورەیان گێڕالەدژایەتی کردنی دوژمنەکانی حزبدا، بەتایبەت پاش شکستی جولانەوەکەی شەواف لەموصل ١٩٥٩،[3] لەم نێوەشدا پەیوەندی

---

[1] خدوري، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص ١١٤.

[2] الخرسان، صلاح ، (صفحات من تاريخ العراق السياسي الحديث – الحركات الماركسية ١٩٢٠-١٩٩٠) مؤسسة العارف للمطبوعات ، الطبعة الاولى ٢٠٠١ ، ص(٩٠)

[3] الزبيدي، ليث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانية ، بغداد ١٩٨١ ص ٤٠٥، ٤٠٦.

توندو تۆڵ هەبوو لەنێوان سەرکردەکانی ئەم حزبە و قاسمدا و چەندین پلانیان ئامادەکردبوو تا کاری لەسەربکەن، ئەم کارانەش لەڕێگەی ئەندامانی لیژنە مەرکەزیو مەکتەبی سیاسییەوە دەگەیەنران، کەبەهۆی کارتی هەمیشەییەوە لەبارەگاکەی خۆی لەوەزارەتی بەرگریدا سەردانی قاسمیان دەکرد.[٤]

بەم جۆرەش حزبی شیوعی وەك لایەنگری قاسم لەدەوری کۆبونەوەولەو ئەنجامەشەوە دژەکانی خۆیان لە ناو دەبرد لەپارتەکانی تر و لەژێرسایەی دەسەڵاتی قاسمدا، تاهێندەی بگەنە ئاستێك کەمەترسیش بۆسەر خودی قاسمیش دروستن بکەن، بەڵام لەبەرهەل و مەرجی نێودەوڵەتی کەلەبەرژەوەندییان نەبوو، ڕێگەیان بەخۆیا نەدەدا کارێکی لەو جۆرە بکەن ، چونکە ئەوان دەیانزانی کەقاسم شیوعی نیە و ناشیەوێت ببێتە شیوعی،[٥] لەوئەنجامەشەوە دەبینین پاش ساڵێك لەشۆڕش وکارەساتی موصل و کەرکوك، قاسم لەوتارێکیدا لەکاتیکردنەوەی کلێسایەکدا لەبەغداد، ئیستینکاری شیوعیەکانی کردو ڕازی بوو لەسەرئەوەی کەهەڵوێست بەرامبەریان وەربگرێت! لێرەدا دەتوانم بڵێم نەرمی نواندنی قاسم بۆهەندێ پارتی سیاسی لەسەردەمی دەسەڵاتیدا زیاتر یامەبەستی هاوسەنگی پێکردنیانی بووە لەگەڵ هێزەکانی ترداو،یان مەبەستی جێبەجێکردنی هەنگاوێکی سیاسی بووە، وەك یاسای ڕاوەستانی چالاکی

[٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل(٤٠٦).

[٥] زۆربەی سەرچاوە مێژوویەکان باس لەوەدەکەن کە عەبدولکەریم قاسم شیوعی نەبووە، بەڵکو کەسێکی نیشتمان پەروەر بووە، بۆدرێژەی ئەم باسە سەیری کتێبی العراق المعاصری د. عبدالوهاب حميد رشيد بکە ل١٤٠.

حزبەکان، وەگەرنا قاسم خۆی بەمۆڵکی هیچ پارتێك نەزانیوەو لەسەربنەمای بەرژەوەندی هاوبەش مامەڵەی لەگەل کردوون.

٢-لەئەنجامی دوولەت بوونی دەسەلاتی سەربازی وولات پاش شۆڕش، لەنێوان قاسم و عارفدا، پارتەسیاییەکان تادەهات ئەم لەت بوونەیان قوڵتر دەکردەوە، شیوعیەکان لەدەوری قاسم کۆبونەوە و نەتەوە پەرستەکان وبەعسییەکان لەدەوری عارف کۆبونەوە لەسەرەتادا، لەم بوارەشدا قاسم سودی باشی بینی لەبەرگری میللی، کەهەرچەند سروشتی شیوعیەت زاڵ بوو بەسەریدا، بەلام تاڕادەیەك شەرعیەتی رەسمیشی پێدرابوو، بەرەسمی شیوعیەکان نەیان دەتوانی خۆیان بکەن بەخاوەنی، ئەمەش یارمەتی دەرێکی باش بوو بۆ قاسم تابەتەواوی بتوانێت نەیارەکانی پێ سەرکوت بکات، هەربۆیەش دەبینین کەبەرگری میللی تاکۆتایی دەسەلاتی قاسم مایەوە. هەرچەند لە پاش ڕوداوەکانی موصل و کەرکوکەوە قاسم بەڕەسمی ئەم ڕێکخراوەی هەلوەشاندەوە، بەلام تادواین ساتی دەسەلاتی قاسم دەورو کاریگەرییان هەبوو، پێویستە ئەوەش بڵێین گەر بێتوو تاوانەکانی حەرەس قەومی نەبوایە کە پاش کودەتای شوباتی ١٩٦٣ پێکهات،لەوانە نەبوو عێراق هەرگیز دەست درێژییەکانی بەرگری میللی لەبیر بکردایە..[١]

لەکۆتاییدا ماوەتەوە ئەوەی بڵێین کەمیلیشاکانی بەرگری میللی، هەمان فۆرمی دادگاکەی مەهداوی بوون، هەردوو لا وەك دەزگایەك بەکاردەهێنرا بۆچەسپاندنی دەسەلاتی سەربازی بەسەرتەواوی ولاتدا، بەتایبەت لەقۆناغە سەرەتاییەکاندا، بەلام ترساندنی خەڵکی و دەستگیرکردنی بێ تاوانان وزیندانی کردنیان، مایەی تورەیی خەڵکی بوو

---

[١] خدوري، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص١١٥

لەم میلیشیایە، هەرچەند (بامەڕنی) بەرپرسی ئەم تەشکیلە وەك مەهداوی نەکەوتە بەردەستی کودەتا چیانی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ و توانی هەڵبێت لەووڵات و دوربێت لەو چارەنووسەی کەتووشی مەهداوی و قاسم هات لەکۆتایی‌دا..[٢]

بەسەرجەم ئەو پێکهاتەو هاوشێوەیەی کەوەك بەرگری میللی وابوو، چ لەسەردەمی قاسم و چ دوای ئەو سەردەمەش،گەرسەرنج بدەین ئەم جۆرەهێزە وەك کەرەستەیەك و دەستێکی پۆڵاین بەکارهێنراون بۆتەصفیەکردنی نەیارانی دەسەڵات، و بەتالان بردنی سەروەت و سامان وئەتکی شەرەفیان، هەڵوێست و ئاکاری جوان نەك هەرلەم پێکهاتانە نەوەشاوەتەوە، بەڵکو ڕەمزێك بوون بۆ ترس و تۆقین و دڵە راوکێ و قێزەونی، ئەم پێکهاتە لەحکومەتە کۆمارییەکانی دواتریشدا هەبووە و هەریەك بەناوێك و پاساوێکەوە کاریان کردووە، بەڵام بەگشتی کارەکانیان نەبنەمایەکی یاسایی هەبووەو نەمێژوویەکی جوانیشی بۆخۆی تۆمار کردووە، هەمیشە بەشێك بوون لەحاڵەتی کتوپڕ و ئەحکامی عورفی و ترس و دڵەڕاوکێیان لەناخی هاوڵاتیاندا چاندووە..

---

[٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل(١١٥).

# مەسەلەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش

شتێکی چاوەڕوان کراوبوو کەپاش سەرکەوتنی شۆڕش دابەش بوون و لێکترازان لەنێو سەرکردەکانی شۆڕشدا ڕووبدات، ئەم حاڵەتەش ڕەوشی هەموو ولاتێکە کاتێك سەرکردەسەربازییەکان لەڕێگەی کودەتای سەربازییەوە، دەست دەگرن بەسەریدا[1] ڕێگە نادەن بەوی تر بێتە پێشەوە لەدەسەڵات بەو پێودانگەی ئەم کودەتای کردووە و هەردەبێت ئەمیش لەدەسەڵاتدا بێت، تائەوەی یەکێکی تری هاوچەشنی خۆی کودەتایەکی تر دەکات و وەك ئەوەی پێشووی خۆی لێ دێت.. چاوگی ئەو ناکۆکیو ململانێیەی ڕوویدا لەنێوان باڵە سەربازییەکاندا بریتی بوو لەجێبەجێ نەکردنی بڕیاری لیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخواز بەپێکهێنانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لەئەندامانی باڵا، و مومارەسەکردنی هەردوو دەسەڵاتی جێبەجێکردن و یاسادانانیان بدرێتێ لەولاتدا بۆماوەیەکی ئینتیقالی دیاری کراو، لەهەمان کاتدا پێکهێنانی حکومەتێکی مەدەنی کەپێك بێت لەپێشەوای پارتە سیاسیەکان، پاشان هەڵبژاردن ئەنجام بدرێت بۆپێکهێنانی ئەنجومەنی نیشتمانیکەنوێنەرایەتی سەرجەم هێزە نیشتمانی و پێشکەوتنخوازەکان بکات، وکۆڵەکەی سیستمی دیموکراسی لەولاتدا بچەسپێنن، پاش ئەوە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش هەڵبوەشێنرێتەوە و دەسەڵاتی سەربازی بگەڕێتەوە شوێنی خۆی، یاخود ئەوەی دەیەوێت بەشداری سیاسی هەبێت واز لەکاری سەربازی بهێنێت و مومارەسەی کاری سیاسی بکات.[2] هەربۆیە گشت لا هیواو ئاواتی

---

[1] خدوری، د.مجید( العراق الجمهوری) چاپی ئێران، ١٩٩٧، ل(١٢٣)

[2] الزبيدي، ليث عبدالحسن (ثورة١٤تموز١٩٥٨ في العراق) ط٢، بغداد ١٩٨١ ، ص٣١٩.

زۆریان گرێ دابوو بە دامەزراندنی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشەوە، کەپاش شۆڕش بڕیار وابوو یەکلا کەرەوەی سەرجەم کارو بارەکان بێت و سەرجەم دڵسۆزان و کەسانی پسپۆڕ، بتوانن کاری تیا بکەن، بەلام لە راستیدا بە هۆی خۆپەرستی و خۆشویستنی کورسی دەسەلات، دانەمەزراو شۆڕش چووە قۆناغی ململانێ و لەدەستدانی تواناو وزە سود بەخشەکان و بەم جۆرەش ولات زیانی زۆری لێ کەوت.[٣]

ئێوارەی یەکەمی دوای شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ یەکەم ناکۆکی نێوان ژەنراڵەکانی نێو رێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخواز سەری هەڵدا، ئەو ناکۆکییەش بریتی بوو لەدانەمەزراندنی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش،[٤] چونکە لەدەزگایەکی لەم جۆرەشنەدا دەتوانرا رایەکی دەستەجەمی دروست ببێ لەسەر کێشەکان و چارەسەرکردنیان و لەهەمان کاتدا ئەم دەزگایە وەك بەربەستێك بوو بۆدروست نەبوونی حوکمی تاك رەوانە و لێکترازان و سەرکوت کردنی یەکتر..

هەربۆیەش دەبینین ئەم ئەنجومەنەلەئامانجەسەرەکییەکانی لیژنەی بالای ئەفسەرانی ئازادیخواز بووەو لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشیشدا دەبوایە خێراکاری لەسەر بکرایەو جەختی لەسەربکەنەوە..

سەبارەت بەئامانجەکانی لیژنەی بالای ئەفسەرانی ئازادیخواز، محسن حسین الحبیب،کەنەیارێکی قاسم بوو پاش شۆڕش، لەگەواهییەکانیدا دەڵێت (( بنەماو ئامانجەکانی شۆڕش لەچەندین کۆبوونەوەدا دیاری کران،

---

[٣] فرحان، اللواء الركن عبدالكريم ، ثورة ١٤تموز في العراق، الجزء الاول، ص٩٠,٩١ ، مؤسسة الكتاب العربي للدراسات والترجمة والنشر، باريس، ١٩٨٦

[٤] کەناڵی ئاسمانیئەبوزەبی، بەرنامەی (بين الزمنين)ئامادەو پێشکەش کردنی (أحمد مهنا) سەرەتای ٢٠٠٢

و زۆر گفتو گۆیان بەدوورو درێژیلەسەرکرا، خۆگەر بێتو هەندێ لەو ئامانجانە روون و ئاشکرا نەبووبن،لەکاتی کۆبونەوەکاندا نەدەنوسرانەوە،[1] تابۆ داهاتوو بپارێزرێن، ئەمەش بەپێی بڕیاری خۆمان بوو کەئەم جۆرە شتانە نەنووسرێنەوە نەبادا ئاشکرابن لەلایەن دەسەلاتی پاشایەتییەوە)) محسن لەو ئامانجانەی کەباسی کردووەو ژمارەیان(٢٠) ئامانجە وبڕیار وابووە پاش سەرکەوتنی شۆرش کاریان لەسەربکرێت و جێبەجێ بکرێن یەکێك لەوانە بریتی بووە لەمەسەلەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش، و بەم جۆرە باسی لێوەکراوە(( پێك هێنانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لەئەندامانی لیژنەی بالای ئەفسەرانی ئازادیخواز، ئەم ئەنجومەنە هەلدەستێت بەکاری دەسەلاتی یاسادانان، تائەو کاتەی کەهەلبژاردنی پەرلەمانی ئەنجام دەدرێت).[2] هەرسەبارەت بەم مەسەلە لیوا روکن عەبدولکەریم فەرحان کەئەندامی لیژنەی بالای ئەفسەرانی ئازادیخوازبووە دەلێت (( زۆر بەدەگمەن کۆبونەوەی دەستەی بالا بەتەواوی ئەنجام بدرایە، ئەمەش لەبەر زۆر هۆکار، چونکە زۆر قورس بوو ئەندامێك سەرجەم کۆبونەوەکان بکات، و گفتوگۆ لەسەر سەرجەم بڕیارو راسپاردەکان بکات، لەهەمان کاتیشدا هیچ شتێك لە کۆبونەوەکاندا نەدەنوسرایەوەو تەنانەت نوسینی سەرەقەلەمیش قەدەغەبوو، بەم جۆرەش دۆکیۆمێنتی رەسمی لە

---

[1] لیژنەی بالای ئەفسەرانی ئازادیخواز، بنەمایەکی توندو تۆلیان دارشتبوو،لەپێناو دزە نەکردنی زانیارییەکان بۆدەزگاکانی هەوالگری سەربازی،یەکێك لەو هۆکارانەی گرتبویانە بەر بریتی بوو لەوەی کەبەهیچ جۆرێك رێگەنادرێت بە نوسینی مەسەلەکان کاتێك لەکۆبونەوەکاندا تاوتوێ دەکرێت، خۆگەر زۆر پێویستی بەنووسین بکردایە،ئەوا دەبوایە پەنابرایەتە بەر هەندێ شێواز کەپەیوەندی بەرێکخستنەکەیانەوە نەبوایە، واتە بەکارهێنانی رەمز، بەتایبەت ئەم حالە لەنامەناردندا پەیرەو دەکرا، هەرئەمەش هۆکاری سەرەکی بووە بۆشێوازی پەیوەندیان لەو سەردەمەدا، پرۆتۆکۆلێکی ئیمزاکراو لەنێوانیاندا نەبووە، بەتایبەت سەبارەت بەمەسەلەکانی دوای شۆرش.. سەرچاوە(ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) تأليف ليث عبدالحسن الزبيدي، ط٢، ١٩٨١ ، ص ١٢٢.

[2] العلوى،حسن (عبدالكريم قاسم رؤية بعدالشرين) منشورات دار الزوراء،لندن، ١٩٨٣ ، ص١٢٨ .

نێوانماندا نەبوو، ئەمەش وای کرد، شتەکان لە یاد بچنەوە و بیرو ڕای جیاواز دروست ببێ.))[3]

حەسەن ئەلعەلەوی سیاسەتمەدارو توێژەرەوەی مێژووی عێراقی هاوچەرخ، پاش توێژینەوەیەکی وورد، لەسەر سەرجەم ئامانجەکانی لیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخواز، دەگاتە ئەو ئاکامەی لەو (٢٠) ئامانجەی کەمحسن حسین الحبیب دەستنیشانی کردوون، قاسم سێ ئامانجیانی جێ بەجێ نەکردووە یەکێکیان مەسەلەی دامەزراندنی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بووە.

بۆیە پاش سەرکەوتنی شۆڕش، لە ڕۆژی ١٥ی تەمووز ژمارەیەك لەئەندامانی لیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخواز دەچنە لای عەبدولکەریم قاسم لەبارەگاکەی خۆی لەوەزارەتی بەرگری ومەسەلەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی لەگەڵدا باس دەکەن،ئەویش ڕەوانەی لای عەبدولسەلام عارف یان دەکات،کەکەسی دووەمی دەسەڵات بووە، بەڵام لەلایعارفیش وەڵامی ئیجابی وەرناگرن [4] جگەلەمەش ئەوەی زیاتر مایەی

---

[3] فرحان، اللواء الركن عبدالكريم ، ثورة ١٤تموز في العراق، الجزء الاول، ص٩٠,٩١ ، مؤسسة الكتاب العربي للدراسات والترجمة والنشر، باريس، ١٩٨٦

[4] عەبدولسەلام عارف لەسەرەتادا دژی دامەزراندنی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بوو،ئەمەش لەبەر زۆر هۆکار لەوانەش متمانە بوونی زۆری بەخۆی و حەز کردن لە دەسەڵات و هەروەها لاوازی قاسم و نیگەرانییەکانی و بەئاسانی قەناعەت پێکردنی، جگە لەمانەش کاریگەری نواندن لەسەر قاسم، عارف دەیویست وەك رووکارێك سەرەتا قاسم بە کاربهێنێت وەك لە میسر چۆن ڕوویدا، تا هەرکات هەلی بۆ هەڵکەوت لای بەرێت و وەك (محمد نجیب) ی لێ بکات کەعەبدولناصر چۆن لای دا لە دەسەڵات، بەڵام کاتێك هەستی بە هێز و دەسەڵاتی قاسمی کرد لە ناو سوپا و جەماوەردا، دەستی دایە جوڵاندنی مەسەلەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، بەو هیوایەی سەرجەم دەسەڵاتەکانی لەدەست دەرنەچێت.. سەرچاوە(ثورة ١٤تموز في العراق، اللواء الركن عبدالكريم فرحان، الجزء الاول، ص١٤٣,١٤٤ ، مؤسسة الكتاب العربي المدراسات والترجمة والنشر، باريس، ١٩٨٦

نیگەرانی ئەو ژمارە ئەفسەرەبوو،ئەوەبوو کە ئەو پۆستانەی بۆیان دانرابوو بەشێوازێك لەدورخستنەوەی خۆیان دەزانی لەدەسەلاتی وولاتدا، بۆنمونە (سەرهەنگ عەبدولوەهاب شەواف) [1] کرابووە فەرمانەدەی حامیەی موصل، هەندێ ئەفسەریتریش نیگەران بێزاربوون لەسەرئەوەی قاسم و عارف وادەی شۆڕشیان لێشاردوونەتەوە، رفعت الحاج سری سەرەڕای ئاگاداربوونیشی لەشۆرش پەیوەندی پێوە نەکردن، [2] لەئەنجامی ئەم حالەتەشەوە فیکرەی کودەتا سەری هەلدا، چونکە بەتەواوی دەسەلات کورت کرابوویەوە لەدەستی قاسم و عارف داو، بۆنمونە قاسم سەرۆك وەزیران و وەزیری بەرگری و سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکان بوو، عارفیش جێگری سەرۆك وەزیران و وەزیری ناوخۆ بوو،کەئەمانە هەموو پۆستی گرنگ و بنەرەتی بوون بەلای ژەنرالەکانەوە، [3] بەم جۆرەش سەرجەمی ئەفسەرانی تر جگە لە(عەبدولەتیف دەراجی) نەبێت، هەموویان دوورخرانەوە بۆ پۆستە لاوەکی‌یەکان.. [4]

---

[1] بۆ درێژەی ئەم باسە سەیری جولانەوەکەی شەواف بکە.

[2] بۆنمونە عقید رفعت الحاج سری، رەتی ئەوەی کردەوە پەیوەندی بکات بەوەزارەتی بەرگرییەوە لەکاتی بیستنی هەوالی شۆڕش لەڕادێوەوە بەلام قاسم و عارف موقەدەم (نعمان ماهر الكنعاني)یان نارد بۆلای (سری) لەمالەکەی خۆیتا سەردانی وەزارەتی بەرگری بکات، ئەمەش پاش چەند سەعاتێك لەئەنجام دانی شۆڕش، لەسەرەتادا (سری) رەتی ئەوەی کردبووە بچێت لەگەلیدا، بەلام سوربوونی کەنعانی لەسەرخواستەکەی وای لێکردبوو کەرازی بکات و بچێت بۆوەزارەتی بەرگری. سەرچاوە (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) تأليف ليث عبدالحسن الزبيدي، ط٢، ١٩٨١ ، ص٣٢١.

[3] کەنالی ئەبوزەبی ئاسمانی بەرنامەی (بين الزمنين) ئامادەو پێشکەش کردنی (احمد مهنا) ٢٠٠٢.

[4] پاش شۆڕش پۆستەکان بەم جۆرە دانران (زەعیم رکن احمد صالح العبدی) حاکمی سەربازی گشتی( کەلەپێشدا ئەم پۆستە درابووە عقید عبدالوهاب شەواف ، بەلام بەهۆی ناکۆکی نێوان شەواف و عارف ئەم پۆستە درایە العبدی کەلەپێشدا پۆستی سەرۆکی ئەرکانی سوپای هەبوو، زەعیم روکن عبدالعزیز العقیلی سەرکردەی تیپی (الفرقە) یەك، زەعیم روکن نازم تەبەقچەلی سەرکردەی تیپی دوو، زەعیم روکن خلیل سعید سەرکردەی تیپی سێ و زەعیم روکن محی‌الدین عبدالحمید سەرکردەی تیپی چوار، سەرهەنگ عبدالوهاب شەواف کرایە فەرماندەی

بێگومان کاتێك لیژنەی باڵا بڕیاری رووخاندنی دەسەڵاتی پاشایەتی دابوو، بیری لەکێشەی بەدەستەوە دانی تەبریری سیاسی نەکردبووەبۆئەم کارە، وپاشان کەشۆڕش ئەنجام درا، هەربەخێرایی هەستیان بەوەکرد کەپێویستە لەسەردەستووری کۆن بمێننەوە، تا ئەوکاتەی ئەم دەستوورە بەشێوازێکی یاسایی هەڵدەوەشێنرێتەوە، بۆئەم مەبەستەش شارەزایانی یاسایی لەمەسەلەکەیان کۆڵییەوە و وادەرکەوت هەموولا کۆکن لەسەرهەڵوەشاندنەوەی دەستوورە کۆنەکە، و بەو پێودانگەی میللەت رەتی کردۆتەوە ئەمەش بەبەڵگەی ئەوەی کەمیللەت پاڵپشتی شۆڕش بووە و واتە شۆرشیش بۆی هەیە ئەم کارە بکات، بۆیە خێرا پاش دوو هەفتە بەسەر ئەنجامدانی شۆڕش دا دەستورێکی کاتی داڕێژرا، تاجێگەی دەستوورەکەی پێشوو بگرێتەوە، ئەم دەستورەش لەلایەن لیژنەیەکی وزارییەوە داڕێژرا، بەو مەبەستەی لە ماوەی ئینتیقالی دەسەڵاتدا کاری پێبکرێت، تائەوکاتەی دەستورێکی نوێ لەلایەن ئەنجومەنی نیشتمانی عێراقەوە دادەڕێژرێت، ئەم ئەنجومەنە میللەت هەڵی دەبژێرێت، بەڵام ئەو ماوە ئینتیقالییە دیاری نەکرا، کە چ کات کۆتایی دێت و هەڵبژاردن ئەنجام دەدرێت، لەگەڵ ئەمەشدا نەشیان دەویست بەکاتێکی دیاری کراوەوە بیبەستنەوە، هەروەك چۆن لەمیسر رویداو ناچاربوون بیگۆڕن.[٥]

بەم جۆرەش چیدی پاساوێك نەمایەوە بۆدامەزراندنی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، کەکاری دەسەڵاتی یاسادانان بکات و دەستوری نوێ دابڕێژێت. دەکرێت لەم حاڵەتەدا قاسم ویستبێتی داڕشتنی

---

حامیەی موصل، کەئەم پۆستەی بەشێوازێك لەدورخستنەوە و پەراوێزخستنی خۆی دەزانی.. سەرچاوە(ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) تأليف ليث عبدالحسن الزبيدي، ط٢، ١٩٨١ ، ص ٣٢٠.

[٥] خدوری، مجید ، هەمان سەرچاوەی پێشوو ل(٩٢)

ئەودەستووره لەژێر چاودێری خۆیدابێت و رێگەنەدات دەستورێك دابڕێژرێت کەزیان بەسیاسەتەکانی بگەیەنێت، لەلایەکی تریشەوە ئەو کەسانە کەسانی یاسایی بوون وناتوانن شتێك بەسەرقاسمدا بسەپێنن کەرازی لەسەرنەبێت.. پێویستە ئەوەشمان لەیاد نەچێت لەڕووی کردەیشەوە کاتێك قاسم ئەنجومەنی سیادەی عێراقی کەلە سێ کەس پێك دەهات دامەزراند، پێدەچێت بەتەواوەتی فیکرەیدامەزراندنی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی لای نەیارەکانیسڕی بێتەوە، هەرچەندە قسەلەسەر ئەوە هەیە کەئەم ئەنجومەنە زیاتر شکڵی بووە و دەسەڵاتی ئەوتۆی نەبووە.

ئەو هۆکارانەیکەبووبەمایەی دروست نەبوونی ئەنجومەنیسەرکردایەتی شۆڕش:-

١-لەنێو ئەفسەرانی لیژنەی بالادا، بیروڕایەکی یەکگرتوو نەبوو، تاپێکەوە کۆیان بکاتەوە و لەچوارچێوەی ئامانجەکانیاندا بزاوتیان پێبکات، هەربۆیە لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشدا دەبینین سەرقاڵ بوون بەناکۆکی شەخصی و دەست خستنی پلەو پایەو دورخستنەوەی هاوڕێکانیان لەدەسەڵات.[1]

٢-نەبونی دۆکیۆمێنت و نوسراوی رەسمی لەنێوان ئەندامانی لیژنەی بالادا، بەتایبەت سەبارەت بەو ئامانج و خواستانەی کەبڕیاربووە دوای سەرکەوتنی شۆڕش بهێنرێنە دی، بۆیە دەبینین ئەو ئامانجانە بەشاراوەیی ماونەتەوە و هەرکەسەو بەجۆرێك باسیان لێوە دەکات.[2]

---

١ مولود، د.محمد عمر(الفدرالية وامكانية تطبيقها في العراق) رسالة دكتورا، طبعة الاولى، مطبعة وزارة التربية، اربيل ، سنة ٢٠٠٠ ص ٧٣.

[2]، هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەرە.. بۆئەم باسە خوێنەر دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆئەم سەرچاوانەی لای خوارەوە:

٣-نەبوونی هەماهەنگی لەنێو ریزەکانی لیژنەی بالآدا، ئەمەش دەرەنجامی نەبوونی سەرکردایەتی‌یەکی یەکگرتوو بوو، بۆنمونە عەبدولکەریم قاسم وەك سەرۆکی ناوەندی بەغداد ئیعترافی پی‌کرابوو، نەك وەك پێشەوای بزووتنەوەکە.

٤-جیاوازی دیدو تێڕوانین و ڕکابەری لەنێوان پێشەوایانی لیژنەکەدا، دیاردەیەکی بەرچاوبوو، هەریەکە لەو پێشەوایانە دەیان ویست ژمارەی زۆری ئەفسەر بەلای خۆیاندا رابکێشن، بۆنمونە رکابەری توند هەبووە لەنێوان شەواف و قاسم بۆ ئەنجام دانی شۆرش،[٣] ئەمەش لەپێناو خاوەنداریێتی شۆڕش و پاوانکردنی دەسەلآت، وناوزەدکردنی شۆڕش بەناوی ئەوەی کەشۆڕشەکە ئەنجام دەدات، هەروەك چۆن لەدوایدا هەمان حالەت لەشۆڕشی ١٤ی تەموزدا رویدا..

* عبدالکریم قاسم رؤیة بعدالعشرین نوسینی حسن العلوی ل(١٢٨) ١٩٨٣.
* العراق الجمهوری نوسینی دکتۆر مجید خدوری ل(٤٣,٤٢) ١٩٩٧.
* مذکرات ناظم الطبقچلی نوسینی جاسم مخلص المحامی ل(٣٤٧,٣٤٦) ١٩٨٥.
[٣] خدوری. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل(٥١).

## بنەما سیاسی و دەستورییەکانی کۆماری عێراق

### ئەنجومەنی سیادە

پاش ئەنجام دانی شۆرش، مەسەلەیەکی سەرەکی وخێرا کە دەبوایە پەلەی لێ بکرایە، مەسەلەی سەرۆکایەتی کۆماری بوو، ئەمەش لەپێناو شەرعیەت دان بەو مەراسیم و بەیاننامانەی کەدەردەکران، پێش ئەنجام دانی شۆرش رێکەوتنێك هەبوو لە نێوان ئەفسەرانی ئازادیخوازدا کەدەسەلاتی سەرۆك کۆمار بدرێتە ئەنجومەنی سیادە، ئەمەش وەك پەیرەو کردنی بنەمای (سەرکردایەتی کردنی بەکۆمەڵ) و رێگرتن لە هەرجۆرە تاکرەوییەك لە دەسەلاتدا، هەربۆیەش بەیاننامەی دووەم بەئیمزای سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارە نیشتمانییەکان دەرچوو کە تێیدا ئەنجومەنی سیادە پێك دەهێنێت :

بەیانی ژمارە (٢)

لەسەر بنەمای ئەوەی کە بەرژەوەندی گشتی دەیخوازێت و بەپشت بەستن بە بەیانی ژمارە (١) بە مێژووی ٢٦ی (ذی الحجة) ی ساڵی ١٣٧٧ بەرامبەر بە ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ بریار درا بە پێك هێنانی ئەنجومەنی سیادە بەم شێوەیەی لای خوارەوە :

١- فەریق روکن نەجیب روبەیعی (سەرۆك)

٢- بەرێز موحەمەد مەهدی کوببە (ئەندام)

٣-بەرێز خالید نەقشبەندی (ئەندام)

**بەغداد لە بیست و شەشی مانگی (ذی الحجة)ی ساڵی ١٣٧٧ بەرامبەر بە ڕۆژی چواردەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨.**[1]

---

[1] *موحەممەد نەجیب روبەیعی لە ساڵی ١٩٠٤ لەبەغداد لە دایك بووە، ساڵی ١٩٢٧ كۆلیژی سەربازی تەواو كردووە، ساڵی ١٩٥٧ پلەی سەربازی (فەریق) ی وەرگرتووە، كاتێك شۆڕشی ١٤ی تەمموز رویدا باڵیوزی عێراق بوو لە شانشینی عەرەبی سعودیە، كاتێك لەسەرەتای ١٩٥٨دا رەوانەی سعودیە كرا بەهۆی ئەوەی گومانی لێ دەكرا چالاكی دژ بەرژێمی پاشایەتی هەبێت سەرەرای ئەوەی ناكۆكی هەبوو لەگەڵ نوری سەعید و عەبدولئیلا لەسەر دانانی سەرۆكی ئەركانی سوپای عێراق، كە(ئەم) پاڵێوراوی ئەم پۆستە بوو بەڵام (ئەوان) رەتیان كردەوە و لەبری ئەم براكەیان دانا واتە (حسیب الربیعی) .. شایانی باسە رۆژی ١٦ی تەمموز نەجیب روبەیعی گەڕایەوە بەغداد و پێشوازی گەرمی لێكرا لە فرۆكە خانەی بەغداد..

*موحەممەد مەهدی كوببە ساڵی ١٩٠٠ لە سامەڕا لەدایك بووە، كەسێكی نەتەوەیی بووە و ساڵی ١٩٢٤ پەیوەندی كردووە بە پارتی نیشتمانی عێراقیەوە، پاشان بووەتە جێگری سەرۆكی (یانەی موسەننای كوڕی حارسەی شەیبانی) كەیانەیەكی نەتەوەیی بووە ،لە دوایشدا بووەتە سەرۆكی یانەكە، لەسەروبەندی بزوتنەوەكەی مایسی(١٩٤١)دا دەست گیر كراوە، بەشداری دامەزراندنی پارتی (الاستقلال) ی كردووەو بووەتە سەرۆكی، بەوە ناسراوە كە دژایەتی سەردەمی پاشایەتی كردووە.

* خالید عەبدولباست نەقشبەندی لەبنە ماڵەیەكی كوردی لە گوندی بامەڕنی سەر بە قەزای (العمادیە) ی موصلی ئەو كاتە لەدایك بووە، ساڵی ١٩٣٧ كۆلیژی سەربازی تەواو كردووە، ساڵی ١٩٤٥ یش كۆلیژی ئەركانی تەواو كردووە، ساڵی ١٩٥٠یش كۆلیژی مافی تەواو كردووە، پاشان وازی هێناوە لە خزمەتی سەربازی كەپلەی (مقدم ركن) ی هەبووە، ماوەیەك وەك (موتەسەریف)ی لیوای (هەولێر) كاری كردووە. سەرچاوە: تاریخ الوزارات العراقیة فی العهد الجمهوری، الجزء الاول، ١٤/٧/١٩٥٨-٧شباط ١٩٥٩ ص٣١,٣٢.

## یەکەم وەزارەتی عەبدولکەریم قاسم
## لە سەردەمی کۆماریدا

پێش ئەوەی ئەنجومەنی سیادە دەست بەکاربێت ، مەرسومی یەکەم بەناوی ئەو ئەنجومەنەوە دەرچوو بوو کە مەرسومی ژمارە (١) بوو، تێیدا سەرجەمی دەسەڵاتە سەربازی و مەدەنیەکانی لە دەستی عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارف دا کۆکردبووە، بەم جۆرەی لای خوارەوە:

مەرسومی کۆماری ژمارە(١)

لەسەر بنەمای بەرژەوندی گشتی بڕیارماندا :-

١-دانانی زەعیم روکن عەبدولکەریم قاسم لە پۆستی سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکان.

٢-دانانی عەقید روکن عەبدولسەلام موحەمەد عارف لە پۆستی یاریدەدەری سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکان.

٣-پێویستە لەسەر وەزیری بەرگری ئەم مەرسومە جیٚ بەجیٚ بکات.

لەبەغداد نوسرا لە رۆژی بیست و شەشی مانگی (ذی الحجة)ساڵی ١٣٧٧ بەرامبەر بە رۆژی چواردەی مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨.

ئەنجومەنی سیادە

<u>ئەنجومەنی وەزیران</u>

بەم جۆرەش بەیان و مەراسیم لەلایەن (عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارف)ەوە دەردەچوون، بەو پێودانگەی کەلە ئەنجومەنی سیادە دەرچوون، پاش دەرچوونی ئەم بەیانە ئەوکات خەڵکی عێراق زانییان کە عەبدولکەریم قاسم سەرکردەی شۆڕشە، هەروەها وشەی

(نیشتمانی) کەلەگەڵ سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکاندا دەهات لەبەیانەکاندا، لابرا..

پاش ئەوە مەرسومی کۆماری ژمارە(٢) دەرچوو، کەتایبەت بوو بە پێك هێنانی یەکەمین وەزارەت لەسەردەمی کۆماریدا، کەلە دوانزە وەزیر پێك دەهات بە سەرۆکایەتی عەبدولکەریم قاسم ، مەرسومەکە بەناوی ئەنجومەنی سیادەوە دەرچوو.

مەرسومی کۆماری ژمارە(٢)

لەسەربنەمای ئەوەی کە سەرۆك وەزیران خستوویەتی‌یە بەردەست بڕیار ماندا بە :-

١- دانانی زەعیم روکن عەبدولکەریم قاسم بەسەرۆك وەزیران و بریکاری وەزیری بەرگری.

٢- دانانی عەقید روکن عەبدولسەلام موحەمەد عارف جێگری سەرۆك وەزیران و بریکاری وەزیری ناوخۆ.

٣- دانانی بەڕێز موحەمەد حەدید بە وەزیری دارایی.

٤- دانانی دوکتۆر عەبدولجەبار جومەردبە وەزیری دەرەوە.

٥- دانانی بەڕێز مستەفا عەلی بە وەزیری داد.

٦-دانانی بەڕێز ئیبراهیم کوببە بە وەزیری ئابووری.

٧-دانانی دوکتۆر جابر عومەر بە وەزیری مەعاریف.

٨-دانانی بەڕێزناجی تالب بە وەزیری کارو باری کۆمەڵایەتی.

٩- دانانی بەڕێز بابا عەلی بە وەزیری گواستنەوە و ئیشغال.

١٠-دانانی بەڕێز فواد رکابی بە وەزیری ئاوەدان کردنەوە.

١١-دانانی دوکتۆر موحەمەد سالح مەحمود بە وەزیری تەندروستی.

١٢-دانانی بەرێز هەدیب حاج محمود بە وەزیری کشتو کاڵ

١٣-دانانی بەرێز سدیق شەنشەل بە وەزیری ئیرشاد.

پێویستە لەسەر سەرۆك وەزیران ئەم مەرسومە جێبەجێ بكات.

لەبەغداد نوسرا لە رۆژی بیست و شەشی مانگی (ذی الحجة) ی ساڵی ١٣٧٧ بەرامبەر بە رۆژی چواردەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨.

ئەنجومەنی سیادە

## پەیوەندی نێوان ئە نجومەنی وەزیران و ئە نجومەنی سیادە

بڕیار وابوو کە ئەنجومەنی سیادە دەسەڵاتەکانی سەرۆك کۆماری هەبێت، و ئەنجومەنی وەزیرانیش مومارەسەی دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێ کردن بکات، بەڵام ئەنجومەنی سیادە دەسەڵاتەکانی لە موصادەقەکردن لەسەر ئەو یاسایانەی کە ئەنجومەنی وەزیران دای دەڕشت، کورت کرایەوە، بۆنمونە دیوانی ئەنجومەنی وەزیران بڕیارە دەرکراوەکانی دەنارد بۆ دیوانی ئەنجومەنی سیادە تا رەزامەندی لەسەر بنوێنێ، هەروەها ئەندامانی ئەنجومەنی سیادە لە کۆبونەوەکانی ئەنجومەنی وەزیراندا ئامادە دەبوون بەڵام بەزۆری بێ دەنگ دەبوون و گفتوگۆی مەسەلەکانیان نەدەکرد، بەڵام ئامادەبوونیان بەواتای موصادەقەکردن بوو لەسەر ئەو یاسایانەی کە ئەنجومەنی وەزیران بڕیاری لەسەر دەدا، بەواتایەکی تر زیاتر رۆڵی ئەنجومەنی سیادە رۆڵێکی پاشکۆیەتی بوو ، کارەکانیان کورت دەکرایەوە لەچالاکیپرۆتۆکۆڵیدا، وەك پەسەند کردنی باڵیۆز و پێدانی پلە و نیشانە.

لەلایەن خۆشیەوە نەجیب ئەلروبەیعی سەرۆکی ئەنجومەنی سیادە لەبری هەردوو ئەندامەکەی تر ئیمزای مەرسومە کۆمارییەکانی دەکرد چونکە هەردوو ئەندامەکەی تر لە بەغدا دانەدەنیشتن، پێویستە بووترێت مەرسومە حەساس و گرنگەکان لە رۆژە سەرەتایەیەکانی شۆرشدا لە رادیۆوە پەخش دەکران و پاشان دەخرایە بەردەم ئەنجومەنی سیادە تا رەزامەندی لەسەر دەربڕن، بەم جۆرە دەتوانین بڵێین رۆڵی ئەنجومەنی سیادە زیاتر رۆڵێکی شکڵی بوو و هیچ جۆرە هەژمونێکی سیاسی نەبوو بەسەر دەوڵەتدا، هیچ جۆرە رەت کردنەوەیەکیش روی نەدا لەو مەرسوم و بڕیارانەداکەلە ئەنجومەنی وەزیران یان سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکانەوە دەردەچوو دەخرایە بەردەم ئەنجومەنی سیادە، لەبەر ئەوەی ئەندامانی ئەنجومەن خۆیان بە منەتباری قاسم و عارف و عەبدولەتیف دەراجی دەزانی..[1]

---

[1] تاريخ الوزارات العراقية فى العهد الجمهورى، الجزء الاول، ١٤/٧/١٩٥٨-٧شباط ١٩٥٩، تأليف مجموعة من الاساتذة سنة٢٠٠٠ص٣٠,٣١,٣٢,٣٣,٣٤,٣٩.

# مەسەلەی یەکێتی عەرەبی

لەـ١٤ی شوباتی ١٩٥٨ (الاتحاد الهاشمی) نێوان عێراق و ئوردون ڕاگەیەنرا، ئەمەش وەك وەڵامدانەوەیەك وابوو بۆدروست بوونی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو کەلەنێوان میسر و سوریاداو لەشوباتی هەمانساڵدا هاتبوویە ئاراوە، یەکێتی نێوان هەردوو وڵاتی عێراق و ئوردون لەوەزارەتێکی یەکگرتوو پێك دەهات، و نوری سەعید بووە سەرۆك وەزیرانی، [1] سەبارەت بەڕۆڵی ئەم یەکێتییە لەبەردەم هەژمونی نەتەوەیی لەو سەردەمەداو وەستانەوە لەبەرامبەر یەکێتی نێوان میسرو سوریا کە خۆی لە کۆماری عەرەبی یەکگرتوودا دەبینییەوە، وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا لە یاداشتنامەیەکیدا کە لە ١٩٥٨/١/٢ ئامادەکرابوو لەم بارەیەوە دەنوسێت" تاکە ئەڵتەرناتیڤی کاریگەر لەم کاتەدا کەلە بەردەم یەکێتی ناسریدابوەستێتەوە بریتییە لە یەکێتی هاشمی نێوان عێراق و ئوردون، و دەبێت لەم بوارەدا تەواوی هەوڵەکان بخەینە گەڕ بەمەبەستی سەرخستنی ئەم یەکێتییە.." لەهەمان کاتدا مەبەستێکی تری دروست بوونی ئەم یەکێتییە دەگەڕایەوە بۆ پارێزگاری کردن لە حوکمی بنەماڵەی هاشمی لە

[1] لەـ١٤/٥/١٩٥٨ نوری سەعید دەست لەکارکێشانەوەی خۆی ڕاگەیاند، پاش ئەوەی کەکۆتایی هێنا بەهەڵبژاردنی نوێنەران و ئەنجومەنی نوێ کردەوە، لە١٩/٥/١٩٥٨ دەست لەکارکێشانەوەکەی پەسەند کراو، نوری سەعید وەزارەتی یەکێتی عەرەبی هاشمی دامەزراند، ئەحمەد موختار بابان وەزارەتی لەعێراق تەشکیل کرد ،لەژێرسایەی یەکێتی عەرەبی هاشمیدا تاشۆڕشی ١٤ی تەموزی١٩٥٨.. شایانی باسە مەبەستی نوری لەم دەست لەکارکێشانەوەیەی لەسەرۆکایەتی وەزارەتە عێراقییەکەی بریتی بوو لەوەی ببێتە سەرۆك وەزیرانی یەکێتی عەرەبی.. (سەرچاوە: العراق فی التاریخ، دانراوی کۆمەڵێك نوسەر، دار الحریة للطباعة ،١٩٨٣)

هـەردوو دەوڵـەتی عێـراق و ئوردونـدا، ئەمـەش بـە پاڵپشـتی ڕۆژئـاوا،[2] پـاش شۆڕشـی ١٤ی تـەموزی عێـراق شاحسـین بـووە سـەرۆکی ئـەم یەکێتی‌یـە تائەوەی عێراق بەڕەسمی لەم یەکێتی‌یەکشایەوەو بەم جۆرەش یەکێتی‌یەکە هەڵوەشایەوە.. [3] ڕۆژی ١٩٥٨/٧/١٥ سەرۆك وەزیران عەبدولکەریم قاسم لـە بەیانێکدا کشانەوەی عێراقی لەم یەکێتی‌یە ڕاگەیاندو لە بەیانێکدا دەڵێت:" یـەکێتی نێـوان عێـراق و ئـوردون لەسـەر ئـەو شـێوەی کەلـە سـەردەمی دەسـەڵاتی پێشـودا ئـەنجام دراوە، یەکێتی‌یـەکی ڕاسـتەقینە نـەبووە کـە لـە بەرژوەندی گەلی هـەردوو لا بێـت، بـەڵکو لـە پێنـاو پشـتگیری کردنـی ڕژێمـی گەندەڵی پاشایەتی‌و دابەش کردنـی یـەکێتی ڕیزەکـانی عـەرەب بـووە، لەبەر ئـەوە حکومـەتی عێراقـی کشـانەوەی خـۆی لـەم یەکێتی‌یـە ڕادەگەیـەنێت، و هــەموو ئــەو ئیجرائــات و یاســایانەش لــەم بــارەوە دەرچــوون هــەمووی هەڵدەوەشێتەوە..

پاش ئەوە سەرۆك وەزیران بەیانێکی دیکەی دەرکردو تێدا هاتووە:

" بەپێی بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران سەبارەت بە کشـانەوەی عێـراق لـە یەکێتی عەرەبی(هاشمی) بڕیارماندا بە بەبەرزکردنەوەی ئالای عێراق لەسەر گشت بەرێوەبەرایەتی‌یە ڕەسمی و شێوە ڕەسمی‌یەکان"

سەرۆك وەزیران

[2] تاريخ الوزارات العراقية، فى العهد الجمهورى، الجزء الاول، ١٤/٧/١٩٥٨-٧/٢/١٩٥٩ ، تأليف مجموعة من الاساتذة، سنة ٢٠٠٠ ، ص٥٢.

[3] المسيرى، عبدالوهاب (الموسوعة السياسية) الطبعة الاولى، مارس ١٩٧٤، بيروت، لبنان،ص١٩)

هەرپاش ئەو وەزارەتی دەرەوە هەستا بە ئاگادارکردنەوەی سەرجەم دەستە دیبلۆماسی‌یەکان و نوێنەرایەتی‌یەکانی عێراق لە ناوەوە و دەرەوە لە بریارەکە..هەر لەو کاتەدا کە حکومەتی ئوردون سەرقاڵی داواکاری سەربازی بوو لەبەریتانیا لەپێناو رێگرتن لە دروست بوونی هەر بارێکی هاو شێوەی ١٤ی تەمموز لە عێراق، لەو کاتەدا حکومەتی‌کۆماری عەرەبی یەکگرتوو خۆشحاڵی خۆی دەردەبڕی بەم هەنگاوەی حکومەتی تازەی عێراق.[١]

شایانی باسە پاش جەنگی جیهانی دووەم ، عێراق رکابەری سەرەکی میسر بوو بۆبەدەستەوە گرتنی فەرمانڕەوایەتی عەرەبی، ئەم ڕکابەرییەش کاتێك توندتربوو کە میسر دەستی دایە دەستێوەردان لەکاروباری (هلال الخصیب) کەلەعێراقەوە درێژ دەبووە بۆڕۆژئاوا، ئەم بەشەلەجیهانی عەرەبیدا ناوچەیەك بوو عێراق گرنگی پێدەدا تاشێوازێك لەیەکێتی تێدا بهێنێتە ئاراوە، بەڵام هەرهێندەی عبدالناصر بانگەشەی پێشڕەوایەتی عەربی کردو کۆماری عەرەبی یەکگرتووی دامەزراند لەنێوان میسر و سوریادا،[٢] عێراقیش هەربەخێرایی بەرامبەری وەستایەوە لەو ساڵەداو

---

[١] تاریخ الوزارات العراقیة، فی العهد الجمهوری، الجزء الاول، ١٤/٧/١٩٥٨-٧/٢/١٩٥٩ ، تألیف مجموعة من الاساتذة، سنة ٢٠٠٠ ، ص٥٣.

[٢] کۆماری عەربی یەکگرتووساڵی ١٩٦١ بەهۆی کودەتایەکەوە کەلەسوریا ڕویدا، هەڵوەشایەوە، پاش ئەوە لە٨/٣/١٩٦٣ بەعسی‌یەکان کودەتایەکیان ئەنجام دا و هاتنە سەرحوکم لە عێراقدا، بەڵام چیدی جارێکی تر نەگەڕانەوە بۆکۆماری عەرەبی یەکگرتوو، لەگەڵ ئەوەی جەمال عەبدولناصر ئەو کودەتایەی بەسەرکەوتنی یەکێتی خوازەکان وەسف کرد، هەرلەو کاتەشدا کەپارتی بەعس لەساڵی ١٩٦٣ هاتنە سەردەسەڵاتی عێراقی و لەهەمان کاتدا لەسوریاش حوکمیان بەدەست بوو، بەڵام نەتوانرا یەکێتی‌یەك لەنێوان هەردوولادا (سوریا،عێراق) دروست بکەن، وەك ئەوەی بەردەوام بانگەشەیان بۆدەکرد ،هەرچەند لەدوایدا ویسترا لەنێوان میسروسوریاو عێراق شێوەیەك لەیەکێتی پێك بهێنرێ و لە١٧/٤/١٩٦٣ ئیمزاکرا، بەڵام بەهۆی ناکۆکی دەستەڵات گرتن لەنێوان ناصرییەکان و دژەکانیان لەسوریا، هەوڵی کودەتایەکی شکست خواردوو دراو بووبەهۆی‌هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی‌یەکە لە١٨/٧/١٩٦٣ پاش ئەوە لەیادی ٢٢ی تەمموزدا ،عەبدولناصر بەتوندی هێرشی کردە

ڕێوشوێنی دامەزراندنی یەکێتی نێوان عێراق و ئوردونی گرتەبەر، پێویستە بووترێ ئەم ڕکابەرییەی نێوان شارستانیەتی (نیل) و (دیجلە و فورات) ڕەهەندێکی مێژینەی تەقلیدی هەبووە، بەڵام لەم دواییانەدا گۆڕا بۆجۆرێك لەململانێی گرتنە دەستی پێشەوایەتی عەرەبی..[٣] یەکێتی نێوان عێراق و ئوردون یەکێتی‌یەکی فیدراڵی‌بوو، کەهەردوو دەوڵەت پارێزگاری سیستمی فەرمانڕەوایەتی خۆیان دەکرد، لەهەمان کاتیشدا وەك دوو دەوڵەتی سەربەخۆی نێو دەوڵەتی مامەڵە و هەڵسوکەوتیان دەکرد...

لەوسەردەمەدا کوێت (کۆڵۆنیالی‌یەکی) بەریتانی بوو، نوری سەعیدی سەرۆکی یەکێتی هاشمی هەوڵیدا تاقەناعەت بەبەریتانیا بکات کەسەربەخۆی بداتە کوێت، ئەمەش وەك پێشەکی‌یەك تا کوێت پەیوەست بکات بە یەکێتی عەرەبی نێوان (ئوردون و عێراق)ەوە، ئامانجی سەرەکیشی لەم کارە دابین کردنی خەرجی‌یە داراییەکانی ئوردون بوو، لەسەربنەمای داهاتی کوێت.. شایانی باسە دانوستانی نێوان عێراق و بەریتانیا درێژەی هەبووبەڵام شۆڕشی ١٤ی تەموز ڕویدا، یەکەم کاری حکومەتی تازە، دەرچونی عێراق بوو لەو یەکێتی‌یەو بەم جۆرەش یەکێتی‌یەکە لەبنەڕەتەوە هەرەسی هێنا.. شێخی کوێت نەیاری فیکرەی پەیوەست بوونی کوێت بوو بەم یەکێتی‌یەوە و زۆر دڵخۆش بوو بەهەڵایسانی شۆڕش و لەباربردنی پێشنیارو سیاسەتەکەی نوری سەعید سەبارەت بەکوێت..

---

سەرسەرکردەکانی پارتی بەعس و بەوەشی وەسف کردن کەکشاونەتەوە لەپرۆژەی یەکێتی نێوان وڵاتانی عەرەبی..( سەرچاوە: العراق الجمهوری، د. مجید خدوری، ص ٢٧٨,٢٧٧ )

[٣] خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير -- قم ١٩٩٧ ، ص ٢٩٩.

لەراستیدا کەم و کورتی مەترسیدار لەم یەکێتییەدا، نەبوونی ڕای گشتی گەلیعێراق بوو لەگەڵیدا، لەگەڵ ئەوەی ئەم یەکێتییەبەربەستێکیش بوو لەبەردەم فراوان کردنی یەکێتی نێوان میسر و سوریادا ڕووەو ناوچەکانی کەنداو.. [1] ئەمە یەکەم پرۆسەی یەکێتی عەرەبی بوو لەنێوان عێراق و وڵاتێکی تردا، کەلەکاتێکدا ئەنجام درا عێراق ئەندام بوو لەپەیمانێکی تردا بەناوی پەیمانی بەغداد، بەسەرکەوتنی شۆڕشە ئازادیخوازییەکانیش لەسەردەستی تازە پێگەیشتوانی وڵاتانی عەرەبی و دژایەتی کردنی ئیستعمارو دروست کردنی یەکێتییەکی عەرەبی، ئەم بارەش تەوژمێکی نوێی هێنایە ئاراوە، کاتێکیش شۆڕشی یۆلیۆی ١٩٥٢ لەمیسر ڕوویدا، کاریگەری زۆری هەبوو لەسەرعێراق، ئەمەش بەپێودانگی پێگەی مێژووی و جیۆسیاسیو ئابووری عێراق و وای کرد تاچیدی شۆڕش لای عێراقی یەکانیش ببێتە خولیاو، لەم نێوەشداو لەچوارچێوەی ئەو ڕکابەرییە نهێنییەی نێوان هەردوولا، عێراق بگەڕێتەوە ئاستی میسر و تەنانەت چاویشی لێبکرێت... مەسەلەی یەکێتی نێوان میسرو عێراق، تەوەرێکی سەرەکی ئەم باسەبوو لای عێراقییەکان، بەتایبەت ناسیونالیستەکان، هەرئەمەش وای کرد ببێتە خاڵێکی ناکۆك لەنێوان دەسەڵاتدارانی تازەی شۆڕشداو لەوبەرەنجامەشەوە چەندان کارەساتی ناهەمواری لێبکەوێتەوە، دیارە ململانێکەش بەڕووکەش ئەم خواستەی هەڵگرتبوو وەگەرنا لەحەقیقەتدا شەڕی دەسەڵاتی تیادا شارابوویەوە..

[1] کەناڵی ئاسمانی ئاسمان ئەبو زەبی بەرنامەی (بین الزمنین) ئامادەو پێشکەش کردنی احمد مهنا، ٢٠٠٢

لەساڵی ١٩٢١ کاتێك دەوڵەتی عێراق دامەزرا، پێکهاتە سیاسی‌یەکەی دابەش بوو بوو، بەسەرلایەنگرانی ،عێراقێکی سەربەخۆ،کەپەیوەست بوو بەهاوکاری پتەو لەگەڵ سەرجەم وڵاتانی عەرەبیداو، لەگەڵ هەندێکی تر کەپێیان وابوو دەبێت یەکێتی‌یەکی عەرەبی کشتگیربێتە ئاراوە و سەرجەمی وولاتانی عەربی بەعێراقیشەوە تێیدا بتوێتەوە، چونکە پێیان وابوو ئەو وڵاتانەکەدروست بوون کیانی سیاسی دروست کراون، بەدەر لەم حاڵەتەش زۆربەی پێکهاتەکە لەگەڵ مانەوەی عێراقێکی سەربەخۆدابوو،[٢]هەرچەند ئەم زۆرینە نەیتوانی وەك پێویست پارێزگاری لەپێکهاتەی عێراقێکی یەکگرتوو بکات، بارەکە بەهێواشی دەڕۆیشت تائەوەی لەسەرەتای ١٩٥٨ دا یەکێتی نێوان میسرو سوریا ڕاگەیەنرا، ئیتر لێرەوە نەتەوە پەرستەکان حەماسەتیان کڵپەی سەندو داوای کیانێکی عەرەبی یەکگرتوویان دەکرد، ئەم مەسەلەیەش بەجدی خۆی پێشنیازکردبوو لە گفتوگۆکانی لیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخوازدا پێش سەرکەوتنی شۆڕش، بەڵام لیژنەکە بڕیاری پەیوەستی خێرای نەدا بەو یەکێتی‌یەی لەنێوان میسرو سوریادا هەبوولەحاڵەتی سەرکەوتنی شۆڕشدا، تەنها بەوە کۆتاییان بەمەسەلەکە هێنابوو کەیەکگرتنی عەرەبی ئامانجێکی چارەنوسسازەو پێویست دەکات بەپێی قۆناغ هەنگاوی بۆهەڵبگیرێت، مەگەر تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێت کەشۆڕش سەربکەوێت و لەو ئەنجامەشەوە مەترسی ئەوە هەبێت لەلایەن وڵاتێکەوە هێرش بکرێتە سەرعێراق وهەوڵی گەڕانەوەی دەسەڵاتی پاشایەتی بدرێت، ئەوکات دەکرێت لەوەها حاڵەتێکدا

---

[٢] بۆدرێژەی ئەم بابەتە خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ کتێبی (التاثیرات الترکیة في مشروع العربي في العراق) نوسینی حسن العلوی..

داوای یەکگرتنی خێرا بکرێت لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوودا،[1] ئەوە کۆتاخاڵ بوو کەئەفسەرانی ئازادیخواز پێی گەیشتبوون و دیارییان کردبوو، چاوەڕوانیش نەدەکرا مەسەلەکە دوای شۆڕش ببێتە یەکەم گورزی کوشندەو لە دەسەلاتی‌تازەی سیاسی و سەربازی عێراق بدرێت و هەوڵی‌کودەتا بدرێت بەسەرشۆڕشدا...

پاش شۆڕش بە چەند ڕۆژێك پارتی بەعس پێشنیازی یەکگرتنی خێرای کرد لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوودا، ئەمەش وەك مەسەلەیەکی هەنووکەیی زۆر گرنگ،[2] بەم جۆرەش دەرکەوت کەهێشتا پێکهاتەی عێراق لەبارنیە بۆ لەئامێز گرتنی گۆڕانکارییەکی لەم جۆرە کەشۆڕشی ١٤ی تەموزبوو، بەڵام لەوکاتەدا پارتی بەعس ئەم مەسەلەی لەوەدا قۆستبویەوە کەحکومەتی کۆماری تازەدروست بووی عێراق، لەبەرمەترسی دەرەکی دەیویست بەزویی پشتگیری کۆماری عەرەبی یەکگرتوو دەستی خۆی بخات، و لەبری ئەوەش بەعسی‌یەکان دەیان ویست ئەم پشتگیرییە ببێتە یەکگرتن و کاریان بۆئەم مەسەلەیەش زۆرکرد، لەم نێوەشدا لەسەردوو بنەما کاریان دەکرد، لەلایەك ڕاکێشانی عبدالسلام عارف بەلای خۆیاندا و

---

[1] کەناڵی‌ئەبو زەبی بەرنامەی (بين الزمنين) کۆتایی ٢٠٠١.

[2] هەرلەو ساتانەدا واتە لەهەفتەی یەکەم و دووەمی پاش شۆڕش (مێشێل عەفلەق) لەئوتێل بەغداد ،کۆبونەوەی لەگەڵ پارتی بەعس کردبوو، داوای لێکردبوون دروشمی یەکگرتنی خێرا بەرزبکەنەوە،ئەم جۆرە دروشمانەیان خستە سەرشەقامەکان و لایەنگرییان لێ‌دەکرد ،لەبەرامبەریشدا شیوعی‌یەکان دروشمی یەکێتی‌یەکی فیدرالیان هەڵگرتبوو، بەڵام لەڕاستیدا هیچ یەك لەم دروشمانە نەلەبەرنامەی ئەفسەرانی ئازادیخوازدا هاتبوو، نەلەبەرنامەی بەرەی یەکێتی نیشتمانیدا هاتبوو، بەڵکو ئەم دروشمە بووبووە ڕەمزێك بۆ ململانێ‌کردن لەسەر دەسەڵات، لێرەدا ڕۆڵی پارتە سیاسیەکان بەدەردەکەوێت لەقوڵ کردنەوەی ناکۆکی نێوان سەرکردەسەربازییەکان و شکانەوەی بەقازانجی خۆیان.

جیاکردنەوەی لەقاسم [٣] و لەلایەکی تریشەوە سازدانی پێگەی جەماوەری بۆئەم مەبەستە و بڵاوکردنەوەی دروشم و داواکاری لەسەر ئەم خواستە. [٤]

عبدالسلام وەك کەسایەتی دووەمی شۆڕش پاش قاسم، یەکگرتنی‌خێرای لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوو کردە دروشمی بانگەشەکانی و ئەمەش بەمەبەستی گەیشتن بوو بەدەسەڵاتی یەکەمی عێراق و دروست کردنی پێگەی جەماوەری بوو بۆخۆی، [٥] هەربۆیەش خێرا وەڵامی ناسیۆنالیست و بەعسی یەکانی دایەوە و بڕوای وابوو کەهاوڕێکانی لەلیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخواز کۆکن لەسەر ئەم مەسەلەیە و تەنانەت بەو جۆرە دەیڕوانییە مەسەلەکە کەکۆتایی هاتوە و پێویست ناکات

---

[٣] بەعسی‌یەکان زۆرکاریشیان لەسەر ئەوە کرد کەعەبدولسەلام خاوەنی شۆڕشەو ئەو شۆڕشی کردووە، و هاتۆتە ناوبەغداد و دەستی گرتووە بەسەر سەرجەم شوێنەکاندا، ئەمەش هاندەرێکی باش بوو کە عارف هەست بەوە بکات مافی خوراوەو لەو پێناوەشدا لەهەوڵی ئەوەدایێت ببێتە دەسەڵاتی یەکەم لەعێراق،دیارە ئەمەش بەپاڵپشتی ئەو جەماوەرەی کەبەعسی و نەتەوەپەرستەکان بۆیان کۆکردبوویەوە..

[٤] لە گفتۆیەکی تایبەتی شەش ئەڵقەییدا، لە ژێر ناوی( قمة الهاوية) کە کەناڵی ئاسمانی(LBC) لەگەڵیدا سازی کردبوو لە مانگی نیسان و مایسی ٢٠٠٣دا، (صلاح عمر العلي) ئەندامی پێشووی سەرکردایەتی شۆڕش و سەرکردەی بەعسی عێراقی دەڵێت: ناکۆکی نێوان قاسم و عارف بە پلەی یەکەم سەرەتا لە پارتە سیاسی‌یەکانەوە سەرچاوەی گرت، چونکە ئەم پارتانە کەخۆیان لەبەرەی یەکێتی نیشتمانی‌دا دەبینییەوە پێش شۆڕشی ١٤ی تەموز، لەبەیانی دامەزراندنیدا زیاتر داواکاریان هەبوو نەك روخانی رژێمی پاشایەتی و هەوڵدان بۆی، هەربۆیەش کاتێك شۆڕش رویدا، ئەم پارتانە کۆبونەوەیەکیان ئەنجام نەدا بۆ دیاری کردنی زەرورەتی قۆناغەکەو بەرنامەی کاریان، بەڵکو هەریەکەیان هەوڵیان دا زیاتر لە دەسەڵات نزیك ببنەوە و لە پرۆژەی حزبی بەرامبەر بدەن، لەم بەرەنجامەشەوە کاتێك ناکۆکی سەری هەڵدا لە نێوان ئەفسەراندا، ئەم پارتانە باشترین زەمینە بوون بۆ قوڵ کردنەوەی کێشەکان و راکێشانی باڵە ناکۆکەکان بەلای خۆیاندا..

[٥] عەبدولسەلام عارف باوەڕی بەیەکێتی نێوان کۆماری عەرەبی یەکگرتوو عێراق نەبوو، بەڵکو ئەم دروشمەی بەکارهێناوە بۆروخانی دەسەڵاتی قاسم، تەنانەت بۆڕاستی ئەم مەسەلەیە دەتوانین ئاماژە بدەینە ئەو حەقیقەتەی کەلەساڵی ١٩٦٣ هەتا١٩٦٦ کەسەرۆك کۆماری عێراق بووە، هیچ جۆرە یەکێتی‌یەکی ئەنجام نەدا لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوودا.. (ثورة ١٤تموزفي ١٩٥٨ في العراق) تاليف ليث عبدالحسن الزبيدي سنة ١٩٨١ ص٣٥٢.

سەرلەنویٚ گفتوگۆی لەسەر بکریٚت، پیٚی وابوو گەرتوانیبیٚتی رای گشتی بۆخۆی دەستەبەر بکات، ئەوکات نەیاری لەنیٚو ژەنراڵەکاندا نابیٚت، بەڵام لەڕاستیدا هەڵەیەکی گەورەی کرد، کاتیٚك ویستی تیٚڕوانینی خۆی بسەپیٚنیٚ بەسەردەورو بەریدا بیٚڕاویٚژکردن..[1]

رۆژی ١٧ی تەموز هەڵسوڕیٚنەری کاروباری باڵیٚوزخانەی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو، سەردانی عبدالسلام عارف دەکات لەبارەگاکەیدا و باس لەپیٚداویستی و داواکاری‌یەکانی ئەو وەفدە دەکریٚت کەبڕیارە بەسەرپەرشتی عارف رۆژی ١٨ی تەموز سەردانی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو بکات و چاوی بکەویٚت بەجمال عبدالناصر، لەوکاتەدا عارف ئەو هەلەدەقۆزیٚتەوە و باس لەهیواو ئاواتەکانی دەکات کەلەدیدارەکەی عبدالناصردا بڕیارە باسی لیٚوە بکات و هەوڵی هیٚنانەدی بدات..

رۆژی ١٨ی مانگ وەفدەکە بەڕیٚکەوت و دەزگاکانی ڕاگەیاندن زۆر بەگرنگی‌یەوە باسیان لە سەردانەکە کرد، لەرۆژی ١٩ی تەموز راگەیەنرا کە وەفدی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو و وەفدی عیٚراقی لەسەر ئەم خاڵانە ڕیٚکەوتوون:

١-داکۆکی کردن لەسەر ئەو بەڵیٚننامە و پرۆتۆکۆلانەی هەردوو لا پیٚکەوە دەبەستیٚتەوە، لەپیٚش هەمووشیانەوە جامعەی وڵاتانی عەرەبی و پرۆتۆکۆلی بەرگری هاوبەشی نیٚوان وڵاتانی عەرەبی.

٢-دوپات کردنەوەی ئەوەی کەهەردوو حکومەت رایان گەیاندووە لەپەیوەندی پتەوی نیٚوانیان سەبارەت بەهەڵویٚستی‌نیٚودەوڵەتی و سوربوونیان لەسەرئەوەی وەك یەك وڵات بوەستن بۆپاریٚزگاری کردن دژ

[1] خدوري، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير - قم ١٩٩٧ ، ص ١٢٥,١٢٤.

بەهەرهێرشێك كە دەكرێتە سەریان، یان هەریەكێكیان بێت و لەهەمان كاتدا گرتنە بەری ڕێوشوێنی خێراو كرداری لەو حاڵەتانەدا كەپێویست دەكات.

٣- هاوكاری تەواو لەنێوان هەردوو وڵات وكاركردن لەسەر پشتگیری پرۆتۆكۆلی نەتەوەیەكگرتووەكان و پشتگیری ئاشتی لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهاندا، ئەمەش وەك هاوكارییەكی نێودەوڵەتی نێوان هەردوولا.

٤- گرتنەبەری هەنگاوی خێرا بۆگەشەی هاوكاری و ڕۆشنبیری نێوان هەردوو لایەنی كۆماری عەرەبی یەكگرتوو و عێراق.

٥- هاوكاری و ڕاوێژكردنی بەردەوام لەنێوان هەردوولا لەسەرجەم ئەو كاروبارانەی جێیگرنگی هەردوو لایە.[٢]

هەرچەند لایەنگرانی عارف و نەتەوەپەرستەكان ئەم ڕێكەوتنەیان بەپشتگیرییەكی مەزنی عەبدولناصر دەدایە قەڵەم لەكۆمارێكی تازە دروست بوو كەنەدەزانرا داهاتووی چۆن دەبێت و زۆر وڵات دانیان پێدانەنابوو، بەڵام وادەردەكەوێت كەعارف سەركردایەتی وەفدەكەی كردبوو، زۆر موعجەب بووبوو بەكەسایەتی عەبدولناصر، و بەڵێنی پێدابوو عێراق گرێبدات بەكۆماری عەرەبی یەكگرتووە، كاتێكیش جمال عبدالناصر

---

[٢] لەوكاتەدا لەنوسینگەكەیدا، عارف پەلاماری دەمانچە دەدات لەقاسم تابیكوژێت و لەو هەوڵەیدا شكست دێنیٚ، قاسم پیٚیدەڵێت:- عبدالمجید فەرید مولحەقی سەربازی جمال عەبدولناصر لێرە بووە بروسكەیەك دەكات بۆ عەبدولناصر وسەبارەت بەتۆ پیٚی دەڵێت: چاوم كەوت بەعەبدولسەلام عارف وپیٚی ڕاگەیاندم كەیەكگرتنێكی خێرای دەوێت و بۆئەم مەبستەش قسە لەگەڵ عەبدولكەریم قاسم دەكەم تاڕازی بكەم، خۆگەر ڕازی نەبوو ئەواخۆمانی لێدەرباز دەكەین!! دیارە دەكرێت هاتوچۆی مولحەقی سەربازی عەبدولناصر بۆلای عارف بەتەواوی ئەو گومانەی لای قاسمدا روست كردبێت لەو ڕۆڵەی جەمال عەبدولناصر دەیگێڕیٚ سەبارەت بەدەسەڵاتەكەی، كەلەدوایشدا ئەم كەسایەتییە ڕۆڵی گەورەی گێڕا لەسازدانی جوڵانەوەكەی شەواف و ئاراستەكردنی بەو ئاقارەی كەعەبدولناصر دەیویست.. هەروەها هەواڵی ئەوەش بەقاسم گەیشتبوو كەلەكاتی سەردانەكەی بۆ قاهرە عارف و عەبدولناصر بۆماوەیەك دوور بەدوور كۆبوونەتەوە بیٚ ئامادەبوونی هیچ یەك لەئەندامانی وەفدی هەردوو لا.. سەرچاوە: ( ثورة الشواف في الموصل)تألیف العمید المتقاعد خلیل ابراهیم حسین الجزء الاول ، الطبعة الاولى ١٩٨٧، ص ٧٦,٧٤.

پرسیاری ئەوەی لێکردبوو ئایا چارەنووسی قاسم چی دەبێت گەریەکگرتن رووبدات؟ عبدالسلامیش لەوەلامدا زۆربەخێرایی ووتبووی چارەنوسی هەرهەمان چارەنوسی (لیوا محمد نجیب) دەبێت![1] ئەم ووتو ێژە نهێنییەی نێوان عارف و عبدالناصر پێش گەڕانەوەی عارف بۆبەغداد گەیشتبووە قاسم، هەربەم جۆرەش قاسم بڕیاری دا دەسەلاتەکانی عارف کەم بکاتەوە و هەندێك لەبەرپرسیارێتییەکانی لێ وەربگرێتەوە..[2]

هەرهێندەی عارف گەڕایەوە بەغداد، قاسم بەوە تاوانباری کرد کە لەئاستی بەرپرسیارێتی خۆی دەرچووە و هەستاوە بەدانوستان سەبارەت بەمەسەلەی یەکگرتن لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوو، هەرچەند عەبدولسەلام عارف ئەم قسەی عەبدولکەریم قاسمیی ڕەت کردەوە، بەلام لەدوایداو لەئەنجامی هەڵسوکەوتەکانی عەبدولسەلام عارفەوە، بەتەواوی مەسەلەکە ئاشکرابوو، بۆنمونە لەجەولەکانیدا ڕەخنەی لەسیاسەتەکانی قاسم دەگرت لەڕووی خزمەتگوزارییەوە سەبارەت بەگرنگی دانی بەهەندێ ناوچەو پشتگوێ خستنی هەندێك شوێنی تر، ، هەروەها لەووتارەکانیدا کە زۆر حەماسی بوون سلاوی عەبدولناصری بە خەڵکیدەگەیاند و دەکەوتە وەسف کردنی عەبدلناصر، بەلام زۆر بەدەگمەن گەرجارجارە ناوی قاسمی بهێنایە، لەهەمان کاتدا لەو جەولانەدا، وەزیری گەشەپێدان (فوئاد الرکابی)کەپێشەوای بەعسییەکان بوو هەمیشە لەگەڵیدابوو، ئەرکەکەشی بریتیبوو لەوەی عارف هان بدات تالە وتارەکانیدا باس لەیەکێتی عەرەبی

---

[1] لیوا محمد نەجیب سەرکردەی شۆڕشی میسری ٢٢ی یۆلیۆی ١٩٥٢، عەبدولناصر لای خست و خۆی جێگەی گرتەوە و بوویە سەرۆکی شۆڕش، پێدەچێت عارف هەمان پلانی بۆقاسم دارشتبێ دوای شۆڕش..

[2] خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص ١٢٥.

بکات و ڕای جەماوەری بۆکۆبکاتەوە».[٣] تائەوەی مەسەلەکە هێند تەشەنەی سەند، کە عارف لە٤/١١/١٩٥٨ دەستگیربکرێت.

لەگەڵ دەستگیرکردنیدا (نەتەوەپەرستەکان و بەعسی یەکان) تارادەیەک پاشەکشەیان پێکرا و شیوعییەکانیش دەستیان دایە چالاکیو دژایەتی کردنی نەتەوەپەرستەکان و بەعسی یەکان[٤] بەو پێودانگەی کە ڕەمزەکەیان واتە عارف دەستگیرکراوەو چیدیگوتاری ئەمانیش شکستی هێناوە. لێرەوە عێراق چووە قۆناغێکی نوێوە، لەسەرئاستی دەرەکیو لەوتارەکانیداو لەدەزگاکانی ڕاگەیاندنەو عەبدولناصر بەتوندی هێرشی دەکردە سەرقاسم و بەدژایەتی کردنی یەکێتی عەرەبی وەسفی دەکرد، لەهەمان کاتیشدا لەسەرئاستی ناوخۆیی لایەنگرانی عارف دەستیان دایە دارشتنی پلانی خۆدەربازکردن لەقاسم و حوکمەکەی و لەم نێوەشدا پارتی بەعس خۆیان کردە خاوەنی بەرەی ئۆپۆزیسیۆن و خەڵکیان لەدژی قاسم هان دەدا، لەهەمان کاتدا شیوعییەکانیش لەبەرامبەر نەتەوەیی و بەعسی یەکاندا وەستانەوە لەکاتێکدا قاسم خۆی بەشیوعی نەدەزانی و تەنها مەسەلەکە ڕاگرتنی هاوسەنگی باری ململانێکە بوو. بەڵام لەئاکامدا

---

[٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل(١٢٥)

[٤] مەبەستم لەبەکار هێنانی هەردوو وشەی بەعسی و نەتەوەپەرستەکان ئەوەیە کە پێش ئەوەی بەعس وەك حزبێك جموجوڵ و چالاکی بنوێنێت، ژمارەیەکی زۆر لەئەفسەران بەهەستێکی نەتەوەییەوە و تەنانەت هەندێك جار توندڕەوانەش کاریان دەکرد، کاتێکیش کە بەعس وەك حزب کاری کرد ئەوان ئەبونە بەعسی و درێژەیان بەکاری خۆیان دا، باشترین بەڵگەش لەم نێوەدا مەسەلەی دورخستنەوەی بەعسی یەکان بوو لە دەسەڵاتی عێراقی لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٣ کە بەشداری گەرم و گوڕی کودەتای ٨ی شوباتی ئەو ساڵەیان کرد، بەکورتی لە عێراقدا بەعس نوێنەرایەتی تەییاری نەتەوەیی نەکردووە بەتەواوی، بەتایبەت لەناوڕیزی سوپادا، لەبەرئەوە دەبێت حساب بۆ هەردولا بکرێت لە ناو هێنانیاندا.

شیوعی‌یەکان سنوری خۆیان تێپەڕاند و تاوانبار کران بەقەسابخانەکانی موصل و کەرکوك، تاگەیشتنە ئاستێك مەترسیش بۆسەر خودی قاسم دروست بکەن، ناچار پاش سەرکوت کردنی نەتەوەپەرستەکان و بەعسی‌یەکان و ڕوداوەکانی موصل و کەرکوك، وسود وەرگرتن لەشیوعییەکان، لەسەرەتای ساڵی دووەمی شۆڕش، قاسم سنورێکی دانا بۆشیوعی‌یەکانیش.. چونکە هۆکاری توندتر بوونی مەسەلەکان بەپێی ڕای زۆرێك لەلێکۆڵەرەوەکان بریتی بوون لەشیوعی‌یەکان و هێزەکانی( بەرگری میللی )کەشیوعی‌یەکان زاڵ بوون بەسەریاندا،.[1]

بەم جۆرەش عێراق لەکاتێکدا بەقۆناغێکی زۆر ناسکدا تێدەپەڕی، قۆناغێك کە پێویستی بەوە هەبووسەرلەنوێ نێومالّی عێراقی ڕێك بخرێتەوە، هەوڵی ئەوە بدرێت ئەو زوڵم و ستەمەی لەخەڵکی کراوە بەزوویی ڕابماڵرێت و پەرە بەپرۆژەی گەشەپێدان و ئاوەدانکردنەوە بدرێت، نمونەیەکی جوان پێشکەش بکرێت؟ بەڵام بەداخەوە مەسەلەکەسەرجەمی پێچەوانە بووە، ئەوانەی خەونیان بەعێراقێکی کۆماری دیموکراسیەوە دەبینی، هەربەخێرایی خەونەکەیان زیندەبەچاڵ بوو، بارەکە بەئاقارێکدا گوزەرا، تاخەڵکی خۆزگەی بەحوکمی پاشایەتی دەخواست و لەهەندێ ڕووەوە حوکمی پاشایەتی بەباش بزانن [2] لەبەرەنجامی ئەو جۆرە مەسەلانەی

---

[1] بۆنمونە دروشمی (خمس بالشهر مات والبعثیة) یان بەرزدەکردەوە، لەکاتی دەستگیرکرانی نەیارانی قاسم لەنەتەوەیی وبەعسی‌یەکان دروشمی ( اعدم ! اعدم! جیش والشعب ویاك، لاتقول ماكو وقت، اعدمهم اللیله)یان بەرز دەکردەوە..

[2] لەدیدارێکی تەلەفزیۆنیدا مامۆستا بەهادین نوری کەسکرتێری حزبی شیوعی بووە لەنێوان ساڵانی۱۹۵۰ ,۱۹۵۳ و سیاسی‌یەکی سەردەمی دەستەڵاتی قاسم ، ئاماژەی بەوەدا، هەندێك لەمەسەلەکانی‌دیموکراسی و مومارەسەی کاری حزبی و دەرکردنی ڕۆژنامە، لەسەردەمی دەسەڵاتی پاشایەتیدا باشتربووە، دیارە ئەمەش بەو پێودانگەی کەمومارەسەی سیاسی دەسەڵاتی تازە لەئاستی پێویستدا نەبووە، وەك

کەزەرورەتی هەل و مەرجی سیاسی و ئابوری عێراق نەبوون، سەرکردەسیاسی‌یەکان دەستیان دایە ململانێ و نەیاری کردنی یەکترو سەرکردەسەربازییەکانیش دەستیان دایە دارشتنی پلانی کودەتاو بەسەرکودەتادا، تائەوەی زۆر بەتەواوی ئەو پێشبینی‌یەی نوری سەعید بێتە دی، کاتێك لەگەرمەی گفتوگۆدا دەبێت لەگەڵ (رفعت الحاج سری) پێش خانەنشین کردنی، وپێی دەڵێت ((وام پێ‌گەیشتووە کەتێوەگلاوی لەپیلانێك دژ بە دەسەڵاتی پاشایەتی، ئایا ئەمە راستە؟ لەبەرامبەریشدا (سری) هەربەخێرایی ئەم قسەیە رەت دەکاتەوە و نوریش دەڵێت:- گوێم لێبگرە، گەربێتو پلانەکەتان سەربگرێ، ئەوا ململانێ‌یەکی توند لەنێوانتاندا دروست دەبێت، ململانێ‌یەك کۆتایی نایەت هەتا هەندێکتان هەندێکتان لەسێدارە نەدەن)) بەراستی پێش بینی‌یەکەی راست دەرچوو، هەرهێندەی شۆرش سەرکەوت و ناکۆکی‌یەکان سەریان هەڵدا، ئەوەی یەکەم کەس لەسێدارە درا خودی (رفعت الحاج سری) بوو.[3]

لەکۆتایی ئەم باسەدا دەمەوێت ئاماژە بدەمە ئەوەی کەمەسەلەی یەکێتی عەرەبی و یەکگرتنی خێرای نێوان عێراق و کۆماری عەرەبی یەکگرتوو، کاتێك لەلایەن بەعسی و نەتەوەپەرستەکانەوە وروژێنرا،زۆرلا لەم مەسەلە کەڵکیان لێوەرگرت:

١-قاسم بەکاری دەهێنا بۆسەرکوت کردنی نەیارەکانی و ئەوانەی کە هەرەشەی جدی‌بوون بۆسەردەسەڵاتەکەی.

---

ئەوەی چاوەروانی لێدەکرا، (بەرنامەی رووبینا، تەلەفزیۆنی یەکگرتوو، کەناڵی سلێمانی، مانگی مارسی ٢٠٠٢.

[3] خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر -- قم ١٩٩٧ ، ص١٢٣.

٢-لەڕێگـەی ئـەم مەسـەلەوە عەبدولناصـر دەیویسـت عێـراق بخاتـە ژێـر دەسەلاّتی خۆیەوە و ئەویش بخاتە پالّ سوریاوە..

٣-ئـەمریکا بەپشـتگیری و هانـدانی ناڕاسـتەوخۆی عەبدولناصـر دەیویست تـەك بەهـەژمونی بەریتانیا لەناوچەکە هەڵچنیّ و عێراق بخاتـە چوارچێوەی هەژمونی بەرژەوەندییەکانی خۆیەوە..[1]

٤-شیوعی‌یەکان دەیانویست نەیارەکانیان سەرکوت بکەن و ڕێگە خۆش بکەن بۆگەیشتن بەدەستەلاّتی عێراق.

٥-ژەنراڵـە نەتەوەییـەکان دەیـان ویسـت تۆڵـەی خۆیـان لەقاسـم بکەنەوەولەدەسەلاّت لایبەرن، لەبەرئەوەی لەدەسەلاّتدا پەراوێزی خستوون.

٦-عەبدولسەلام عارف دەیویست لـەکۆماری چاوەڕوان کراوی عێـراق و عەرەبی یەکگرتوودا ببێتە جێگری عەبدولناصر.

٧-بەعسـی‌یەکانیش دەیانویسـت ببیکەنـە یەکـەم هـەنگاوی دروسـتکرنی ناسیۆنالیزمێکی نیونەتەوەیی عەرەبی و ولاّتانی تری لەژێریدا کۆبکەنەوە..

بەلاّم لەڕاستیدا ئەو پـرۆژەی لـەو کاتـەدا بەعسـی و ناسیۆنالیسـتەکان هـەڵیان گرتبـوو( یـەکگرتنی خێـرای نێـوان عێـراق و کۆمـاری عـەرەبی یـەکگرتوو) نـەك خزمـەتی بـەم ئامانجـە نـەکرد بۆداهـاتوو، بـەڵکو بویـە سـەرەتایەکی شکسـت خـواردوو بـۆزۆر هـەوڵی تـری لـەم چەشـنە و دەیـان جۆری تریش..

[1] بۆدرێژەی ئەم باسە خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆکتێبی (المقایضة: برلین-بغداد ، الخلفیـة التاریخیـة لحـرب لم تنته بعد) نوسینی نجم محمود ، منشورات الغد. سنة ١٩٩١.

# گەڕانەوەی گەیلانی و
# هەوڵی کودەتایەکی سەرنەکەوتوو

بزوتنەوەی مایسی ١٩٤١ بزاوتنێکی بوێرانە بوو لەبەرامبەر سیاسەتە کۆلۆنیالیستەکانی بەریتانیا و دەستێوەردانەکانیدا وەستایەوە، [٢] کەبەردەوام ئەم ڕۆڵە لەعێراقدا ڕوو لەزیاد بوون بوو، هەروەها هەوڵێکیش بوو بۆبنەبڕکردنی ڕەگ و ڕیشەی کۆلۆنیالیزم کەجڵەوی حوکمی لەدەستا بوو.. بەم جۆرەش دەبینین بزوتنەوەی مایسی ١٩٤١ بەرهەڵستیی گەورەترین هێزی زەبەلاحی جیهانی دەکرد لەو سەردەمەدا. [٣]

دیارە بوونی پێشینەیەکی لەو جۆرە لەبیری خەڵکی عێراقدا لەسەر ئەم بزوتنەوەیە، واتای گەورەیی سەرکردەکەی واتە ڕەشید عالی گەیلانی بوو، هەرچەند چوار سەرکردەی دیکەی بزوتنەوەکەش لەسێدارە دران، بەڵام هەڵگری نازناوی پێشەوای بزوتنەوەکەبوو.

گەیلانی پاش شکستی بزوتنەوەکەی عێراقی بەجێ هێشت و توانی لە چنگی بەریتانی‌یەکان دەرباز ببێت، ئەوانیش فەرمانی سێدارەیان لە دژی دەرکرد بە شێوەیەکی غیابی، گەیلانی دوای ئەوەی لە ئەڵمانیاو چەند

---

[٢] گرۆبا) سیخورێکی بەتوانا و لێهاتووی ئەڵمانی بوو، لەسەردەمی جەنگی جیهانی دووەمدا، توانی قەناعەت بکات بەگەیلانی تاجولانەوەیەك لەدژی بەریتانیا بەرپا بکات، چونکە لەو کاتەدا بەریتانیا زۆر پێویستی بە نەوتی عێراق هەبووە بۆپەرەپێدانی ماشێنی جەنگی خۆی، ئەڵمانیاش دەیویست لەم ڕێگەوە گورزی خۆی لەبەریتانیا بووەشێنێ، بەڵام هەربەخێرایی ئەم بزوتنەوەیە لەلایەن بەریتانیاوە سەرکوت کرا و دامرکایەوە، لەدوایدا گەیلانیش هەڵهات بۆ ئەلمانیا..( کەناڵی ئاسمانی (الجزیرە) بەرنامەی الجاسوسیە، دەکرێت بەتەنها گرۆبا پاڵنەری بزاوتەکە نەبووبێت، بەڵکو یەکێك بووبێت لەپاڵنەرەکان..

[٣] عارف، فؤاد، مذکرات، الجزء الاول، الطبعة الاولی، ١٩٩٩ مطبعة خبات، تقدیم وتعلیق د. کمال مظهر احمد ص١٤١.

ولاتێکـی تـر مایـەوە لـە کۆتایـدا گەیشـتە ولاتـی سـعودیە و لـەویّ وەك پەنابەرێك ژیا، بەڵام لەگەڵ شانشینی ئەو ولاتە ناکۆکی بۆ دروست دەبێت و روو دەکـات میسـر، کـاتێکیش شۆڕشـی ١٤ی تـەمموز لـە عێـراق رویـدا، گەیلانی لە ئەسکەندەرییە بوو لە کاتی گەرانەوەشی بۆ قاهیرە زۆر بەگەرمی پێشـوازی لیّ کـرا، ئەمـەش لـەو روانگـەی گـەیلانی کەسایەتی‌یەکی نـاوداری عێراقە و حکومەتی تازەی کۆماری عێراقیش بێگومان رۆڵی گرنگی دەداتیّ، بەڵام قاسم زۆر لەم هەڵوێستە نیگەران بوو..

هەریەك لـە قاسـم و عـارف مەسـەلەی گەرانـەوەی گـەیلانی‌یان بۆ عێـراق تـاوتویّ کردبـوو، هەرچـەند لەلایـەن خۆیـەوە قاسـم نیگـەرانی ئـەوە بـوو کـە گـــەیلانی بگەرێتـــەوە ئـــەوا بـــاڵی نەتەوەیی‌یـــەکان بـــە هێـــز دەبێـــت و لەبەرامبەریشدا عارف زۆر پشتیوانی لە گەرانەوەی ناوبراو دەکرد. گەیلانی رۆژی ١٧ی تـەمموز بـەرەو دیمـەش کەوتـە ریّ بەمەبەسـتی گەرانـەوەی بـۆ عێراق ، بەڵام بە هـۆی دواکـەوتنی بڕیـاری لیّ خۆشبونەکەی جارێکی تـر لـە ٣٠ی تەمموز گەرایەوە بۆ قاهیرە.

رۆژی ٢٥ی ئـــابی ١٩٥٨ رەزامەنـــدی گەڕانـــەوەی گـــەیلانی لەلایـــەن قاسمەوە گەیەنرایە میسـر و گـەیلانیش پـێش گەڕانـەوەی چـاوی کـەوت بـە جەمال عەبدولناصر و رۆژی ١ی ئەیلولی ١٩٥٨ گەڕایـەوە عێـراق .. لە رۆژی ٤ی ئـــەیلولی ١٩٥٨دا بڕیـــاری ٢٣ی ســـاڵی ١٩٥٨ دەرچـــوو کـــە تێیـــدا لێخۆشبونی گشتی دەرکرا بوو بۆ سەرجەم ئەو روداوانەی لـە ١٩٣٩/٩/١ وە هەتا پێش شۆرشی ١٤ی تـەمموز رویانـدا بـوو، تەنانـەت ئەوانەشـی گرتـەوە کـە لەگـەڵ مـەرحومی مـەلا (موسـتەفا بـارزانی)دا بەشـداری جوڵانەوەکـەیان

کردبوو له ئەفسەران..لەگەڵ ئەمانەشدا ئەو مافانەی گەڕاندوە بۆیان کەلیان زەوت کرابوو..

پاش گەرانەوەی بۆ عێراق وەفدی پارت و لایەنە سەربازی و نەتەوەیی‌یەکان دەستیان دایە سەردان کردن بۆ ماڵی گەیلانی بەمەبەستی بە خێرهێنانەوەی، رۆژی ۳ی ئەیلول (سید فهمی) باڵیۆزی کۆماری عەرەبی یەکگرتوولەگەڵ وەفدێکی باڵوزخانەکەیدا سەردانی یان کردو لەوکاتەشدا لەدەرەوەی ماڵەکەی گەیلانی کۆمەڵێك لە نەتەوەیی‌یەکان دروشمی‌یان بە جەمال عەبدولناصردا هەڵدەدا و هەر هەمان رۆژ گەیلانی سەردانی باڵیۆزخانەی کۆماری عەرەبی یەکگرتووی کردەوە.. رۆژی ٥ی ئەیلولیش قاسم سەردانی گەیلانی کرد لە ماڵەکەی خۆیدا و لەو کاتەشدا شیوعییەکان لە سەر رێگەی ماڵی گەیلانی راوەستا بوون و دروشمیان بە عەبدولکەریم قاسمدا هەڵدەدا.

لەرۆژی ٢٣ی ئەیلول ئەنجومەنی وەزیران بریاری دا سەرجەمی کوژراوان و لە سێدارەدراوان و بریندارانی ئەفسەرانی پۆل و جێگرەکانیان و ئەفسەران و کارگوزارانی مەدەنی لە سوپادا کە لە بزوتنەوەی مایسدا بوون مافی تایبەتیان بۆ دابین بکرێت و خانەنشینی پێویستیان بۆ ببڕدرێتەوە..[1]

گەیلانی بەهۆی ئەوچالاکی‌یە سیاسی‌یەی کەلەسەردەمی دەسەلاتی پاشایەتی‌دا هەیبووەو نەیارێتی توندی بۆدەسەلاتی پاشایەتی، پی‌ی وابوو لەم دەسەلاتە نوێیەدا دەبێت گرنگی پی‌بدرێت و ئیعتبار بۆ بزوتنەوەکەی

---

[1] تاريخ الوزارات العراقية فى العهد الجمهورى، الجزء الاول، ١٩٥٨/٧/١٤ - ١٩٥٩/٢/٧ ، تأليف مجموعة من الاساتذة، سنة ٢٠٠٠ ص٢٠٢,٢٠٣,٢٠٤,٢٠٥,٢٠٦.

بگەڕێتەوە، چونکەلەسەردەمێکدا توانیویەتی بەرهەڵستی بەریتانیا بکات، ، بەدەر لەمەش چاوەڕوانی ئەوەشی دەکرد کەدەسەلاتی تازە پلەو پایەی شایستە بەخۆی بدەنێ. بەلام بەپێچەوانەوە دەسەلاتی تازە هیچ جۆرە پێشنیارێکیان نەخستە بەردەستی، زۆرێکیش لەسەرکردەکانی شۆڕش پیٚیان وابوو تەمەنی بەرەو پیری ڕۆیشتوەو[1] تێڕوانینەکانی زۆر دوور نیە لە تێڕوانینی سەردەمی پاشایەتی. هەروەها پیٚیان وابوو کە بەرپرسیارێتی شۆڕش دەبێت لەدەستی نەوەی نوێدا بێت. بەدەر لەم حاڵەتانە پیٚیان وابوو کەبە ڕێزلێنانی و گەڕانەوەی بۆ عێراق و گەڕانەوەی ئیعتباری ماددی و مەعنەوی بۆی و قەرەبوو کردنەوەی ئەو زیانە ماددیانەی کە لەسەردەمی دەسەلاتی پاشایەتی لێی کەوتبوو، هەموو ئەمانە پێگەی تەواویان پیٚیداوە و کەم و کورتیان لەبەرامبەریدا نەنواندووە..[2]

بەلام لەگەڵ ئەمەدا گەیلانی رازی نەبوو لەسەر ئەم مەسەلەیە و پیٚی وابوو کەمافی پیٚنەدراوە و وەك شۆڕشگێڕێکی نیشتمانی حسابی بۆنەکراوە.. پێش گەڕانەوەی لە گەرمەی کێشەی نێوان قاسم و عارفدا ،گەیلانی چاوی بەعەبدولناصر کەتبوو، وادەردەکەوێت کەعەبدولناصر داوای ئەوەی لێ کردبێ کەببێتە نێو بژیوانیان و کێشەکە چارەسەر بکات، بەلام بەتەواوی ئەو باس و خواسە ڕوون نەبووە کەلەنێوانیاندا ڕوویدابوو، لەگەڵ ئەوەی کەگەیلانی بەوە تاوانبار کراوە پەیمانی بەعەبدولناصر داوە کاربکات بۆ پێکەوە گرێدانی عێراق بەکۆماری عەرەبی یەکگرتووە. گەیلانی

---

[1] دکتۆر مجید خدوری لەکتێبی( العراق الجمهوری)دا دەنوسێت: چەندان جار قسەم لەگەڵ گەیلانی کردووە لەپێش شۆڕش و دوای شۆڕشیش، هەستم دەکرد کەحەزی دەست پێکردنەوەی چالاکی سیاسی بەلاوە زۆر بەهێزبووە)

[2] خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر – قم ١٩٩٧ ، ص١٤٠.

وەك کەسایەتی‌یەکی سیاسی و سەربازی بەهۆی ئەو ڕابردووەی کەهەیبوو، جێگەی ترس و نیگەرانی دەسەلاتی تازەش بوو، چونکە خەڵکی عێراق چاوەڕوانیان دەکرد گەیلانی پێگەیەکی باشی پێبدرێت. ئەمەش وەك وەفایەك بۆ ئەو ڕابردووەی کەهەیبووە، چونکە ئەوەی گەیلانی لەساڵی ١٩٤١ ئەنجامی دابوو، هیچی کەمتر نەبوو لەوەی کەلە تەموزی ١٩٥٨دا ڕویدا، تەنها هێندە نەبێت کەنەیتوانی درێژە بەخۆی بدات، وگەرنا وەك پرۆسەکە شتێکی گەورە بوو. ئەمە لەلایەك و لەلایەکی ترەوە کۆبونەوەشی لەگەڵ عەبدولناصرو مانەوەی ناوەڕۆکی گفتوگۆکەی بەشێوەیەکی تەم و مژ ئامێز، مایەی نیگەرانی قاسم بوو. بەو شێوەی کەبواری پێ نەدات وەك کاراکتەرێکی سیاسی ڕۆڵ بگێڕێ و بەردەوام لێی بەگومان بوو.. لەگەڵ ئەمەشدا گەیلانی وەك کەسایەتی‌یەکی سیاسی چالاك بەو ڕابردووەی کەهەیبوو گونجاو نەبوو کەواز لەچالاکی سیاسی بهێنێ و دابنیشێت..

هەرهێندەی عارف خرایە زیندانەوە، هەندێك لەئەفسەرەکان لەنێویشیاندا (تاهیر یەحیا، عەبدولەتیف دەراجی، ئەحمەد حەسەن بەکر، رفعت حاج سری) کەوتنە سەردان کردن و هاتوچۆی کردنی و گەیلانیش دەرگایماڵەکەی خستبووی سەرپشت بۆ میوانەکانی، لەنێو ئەوانەشدا سەردانیان کردبوو، سەرۆك هۆزەکانی ناوچەی فوراتی ناوەڕاست بوو، کەپەیوەندی سیاسی کۆن پێکەوەی دەبەستنەوە، شتێکی ئاسایی بووکە باس لەسەر هەندێك مەسەلەی هەنوکەیی بکرێت، بەتایبەت چاکسازی کشتوکاڵی، هەروەها ئەو ململانێی هەبوو لەنێوان شیوعی و نەتەوەپەرستەکاندا، هەر لێرەشەوە گەیلانی دەستی دایە لێدوان لەسەر ئەو جۆرە مەسەلانەو ڕەخنەگرتن لەدەسەلاتی قاسم، ئەمەسەرەڕای

ئاگاداركرنەوەی لەلایەن (تاهیر یەحیا) بۆچەند جارێك، تاخۆی لەو جۆرە لێدوان و قسانە بپارێزێ كەلەگەڵ میوانەكانیدا دەیكات، دیارە شتێكی ئاسایشە كە ئەم جۆرە رەخنەو لێدوانانە بگاتەوە قاسم [1] و ئەمەش واتای ئەوەبوو كەگەیلانی لەبارەكە ڕازی نیەو بووەتە نەیارێكی سیاسی، بەتایبەت دەبێت ئەوە ڕوون بوبێتەوە بۆ قاسم هەندێك ئەفسەری پلەبەرزیش كەلەقاسم نیگەرانن، وسەردانی دەكەن و دەكرێت تاڕادەیەكی باشیش سەردان وهاتوچۆی ئەم ئەفسەرانە وایلێكردبێت تاگەیلانی پەلە لەهەنگاوەكانی بكات و هەوڵی داگیر كردنی پێگەیەك بدات بۆخۆی لەو زەمینە گونجاوەی كەدەستی كەوتبوو..

بەم جۆرەش مەسەلەكە هێندە گەورەبوو كەهەواڵ گەیشتە قاسم ڕۆژی ۱۹۵۸/۱۲/۹ گەیلانی لەناوچەكانی فوراتی ناوەڕاست یاخی بوون و كودەتا ڕادەگەیەنێت! بۆیە پێش جێبەجێكردنی ئەم پلانە ، دەزگای هەواڵگری سەربازی داوای لەسێ ئەفسەری سەربازی و دووهاولاتیكرد، تاچاودێری جموجوڵ و چالاكی گەیلانی بكەن. ئەوانیش لەلایەن خۆیانەوە هەستان بەپێك هێنانی كۆمەڵەیەكی وەهمی كەداوای یەكێتی عەرەبی كشتگیری دەكرد و [2] پلانەكەشیان لەوەدا خۆی دەبینیەوە كەپەیوەندی بكەن بەو دووكەسەی متمانە پێكراوی تەواویگەیلانی بوون، كەبریتی بوون لە: عبدالرحیم الراوی( پارێزەر) و مبدر گەیلانی(برازای رەشید عالی گەیلانی)و ئەوەیان پێڕابگەیەنن كە هەندێك ئەفسەری نەیاری قاسم داوایان لێكردوون

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل(۱٤۱)

[2] ئەو پێنج كەسە پێك دەهاتن لە( الرئيس حسون الزهري، ملازم الاول احمد محمد العلي، المحامي عبدالرسول الصراف، ملازم احتياط محمد محسن سميسم، جاكوب بلاكن) كۆمەڵكەشیان ناوی (برایەتی عەرەبی ) بوو، ئامانجیشی گۆڕانی هەل ومەرجەكە بوو بەهێز..( ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق، الزبيدي، ص ٣٦١)

تاپەیوەندی بکەن بەگەیلانییەوە لەپێناو پێش خستنی روخانی دەسەڵاتی قاسمدا.. (الراوی) یەکێك لەوسێ ئەفسەرەی کە هاتبوونەلایان بەباشی دەیناسی و هەرزوو کەوتە ژێر کاریگەرییەوەو ڕازی بوو هاوکارییان بکات، کاتێکیش هەرسێ ئەفسەرەکە پرسیاری چۆنیەتی چەك و داراییان کردبوو بۆسەرخستنی کارەکە، مبدر گەیلانی دڵنیاییان دەکاتەوە کەدەتوانێت لەڕێگەی مامییەوە( گەیلانی) چەك و دارایی لەمیسر وەربگرێت، جگەلەمەش (الراوی) ئامادەیی هۆزەکانی فوراتی ناوەڕاستی نیشان دابوو بۆبەشداری شۆڕش، کەدیارە ئەم خۆسازدانەش لەڕێگەی گەیلانییەوە دەبوو کەپەیوەندی پێیانەوە هەبوو.. لەبەرامبەر هەموو ئەمانەدا ئەفسەرەکانیش ئامادەیی تەواوی ئەو ئەفسەرانەیان بۆ دەربڕیبوون کە ئەمانیان ناردووە بۆلایان، لەوکاتەشدا الراوی وادەی جێبەجێ کردنی پیلانەکەیان پێڕادەگەیەنێت کەشەوی ١٩٥٨/١٢/٩ دەبێت...

سەرجەمی ئەم زانیارییانە گوازرانەوە بۆقاسم بەهۆی کاسێتی ڕیکۆردەرەوە، کەئەو سێ ئەفسەرە لەکاتی ووتو وێژەکانیاندا بەنهێنی پێیان بووە و دەنگی هەمولایەکیان تۆمار کردووە. هەربۆیەش لە١٩٥٨/١٢/٩ هەریەك لە (الراوی) و( مبدر)و( گەیلانی) دەستگیر دەکرێن، و ڕەوانەی دادگای مەهداوی دەکرێن بۆ دادگایی کردن.[٣]

لەکورتەی کێشەکەدا هاتبوو کە( لایەنە بەرپرسەکان زانیویانە پلانێك لەئارادایە دژبەکۆمارەکەمان، و مەترسییەك دروست بووە لەسەر قاسم بەهاوکاری کۆماری عەرەبی یەکگرتوو)[٤] لەکۆبونەوەی یەکەمی دادگادا هیچ

---

[٣] خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر - قم ١٩٩٧ ، ص١٤٢.

[٤] ألزبیدي، لیث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانیة ، بغداد ١٩٨١ ص٢٦١.

یەك لە(مبدر و الراوی) لەسەر کێشەکە قسەیان نەکرد، تەنها هێندە نەبێت ئەوەیان رەت کردەوە کەدەستیان هەبووبێت لەم پیلانەدا، گەیلانیش لەوەلامی پرسیاری دادگادا وتبووی کەناوی تێکەڵ کراوە لەگەڵ پیلانەکەدا و وەگەرنا هیچ زانیارییەکی لەسەری نیە! بەلام بەڵگەکان لەکێشەکەدا یەکلاکەرەوەبوون لەسەر ئەوەی کە(مبدر و الراوی) تێوەگلاون لەچالاکی نهێنی دژ بەدەوڵەت[1] و الراوی بەپیێ بەڵگەکان دەرکەوتبوو کەگەیشتۆتە ئەوەی هێز بەکاربهێنرێت دژ بەدەسەلاتی قاسم بۆ روخاندنی، دیارە ئەمەش بەپیێ زانیارییە تۆمارکراوەکانی ناو کاسێتەکە، هەروەها مبدریش بەوە تاوانبار کرابوو کەبەشداری پلانەکەی کردووە بە پێدانی چەك و دارایی، بەم جۆرەش هەردوکیان حوکم دران بە مادەی (٨٠) لە یاسای سزادانی عێراقی و لە ١٩٥٨/١٢/١٠ حوکمی سێدارەدان لەدژیان دەرچوو، و گەیلانیش تەبرییە کرا..[2]

هەرهێندەی گەیلانی گوێ بیستی حوکمەکەی دادگابوو، دەستی دایە سوپاس گوزاری و باس کردن لەپاك و بێگەردی دادگا، لەکاتی دادگاییەکەشدا کەبەرگری لەخۆی کردبوو ووتبووی کە( الراوی و مبدر) هەرلەخۆیانەوە پلانیان دارشتووە و خۆیان سەرچاوەی کارەکەن... بەم جۆرەش کاتێك کەدەرکەوت بۆ هەریەك لە مبدر و الراوی کەلەسێدارە دەدرێن و پێشەوای پلانەکەشیان بەو جۆرە خۆی دەرباز دەکات وبۆیان دەرکەوت کە گەیلانی فرۆشتوونی بەشەیتان بۆ ڕزگاربوونی خۆی، بۆیە داوایەکیان ئاراستەی دادگاکرد کە بواریان بداتیێ، تاهەندێك بەڵگەی تر

[1] خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر – قم ١٩٩٧ ، ص١٤٢
[2] الزبیدي، لیث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانیة ، بغداد ١٩٨١ ص٢٦٢.

بخەنە ڕوو لەسەر گەیلانی، بەم جۆرەش قۆناغی دووەمی دادگا دەستی پێکردەوە و جارێکی تر گەیلانی هێنرایەوە بەردەمی دادگا لە١٩٥٨/١٢/١٥ و هەریەك لە الراوی و مبدر ئەم خاڵانەیان لەسەر باس کرد:

١-گەیلانی پەیوەندی بەهەندێك ئەفسەری وەك ( تاهیر یەحیا، عەبدولەتیف دەڕاجی، تەها دوری..)ەوە هەبووە و رەخنەیلە قاسم گرتووە و دژایەتی کردووە.

٢-باس کردن لەهەواڵی پەیوەندی نێوان گەیلانی و سەرۆك هۆزەکانی فوراتی ناوەڕاست تاشۆڕش لەدژی قاسم ڕابگەیەنن.

٣-(مبدر) لەڕێگەی گەیلانییەوە چەك و دارایی لە کۆماری عەرەبی یەکگرتوو وەردەگرێت.[3]

٤-هاندانی هەریەك لە گەیلانی و الراوی بۆ پیلان گێڕی دژ بە قاسم و بۆ ئەم مەبەستەش مبدر پەیوەندی دەکات بە گەورە کاربەدەستانی کۆماری عەرەبی یەکگرتووەوە.[4]

ئەم تۆمەتانە هەریەك لە( مبدر و الراوی) دوپاتیان کردەوەو لەبەرەنجامیشدا دادگا بەپشت بەستن بەم بەڵگانە فەرمانی لەسێدارەدانی سەپاند بەسەر گەیلانیدا لە١٩٥٨/١٢/١٧.. لەم بەرەنجامەشەوە شەپۆلێك نارەزایەتی و هێرشی توندکرایە سەر دادگاکەی مەهداوی لەلایەن ڕۆژنامەکانی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو و ئەو تۆمەتانەی مەهداوی داوییەتییە پاڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوو لەم کیشەیەدا بەدرۆ لەقەڵەم دا.[5]

---

[3] خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر -- قم ١٩٩٧ ، ص١٤٣.

[4] الزبیدي، لیث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانیة ، بغداد ١٩٨١ ص٣٦٣.

[5] خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر - قم ١٩٩٧ ، ص١٤٣.

بـەڵام وەك حـوكمی لـە سـێدارەدانەكەی عەبدولسـەلام ، ئەمجارەشیان قاسـم تەصـدیقی نـەكرد و وەك شمشـێرێك بەسـەر گەردنیگەیلانیـەوە هێشتیەوە بۆئەوەی لەكاتی پێویستدا بەكاری بهێنێ.

لەكۆتایدا دەكرێت بپرسین ئایا گەیلانی بەڕاستی دەستی هـەبوو لـەم پیلانـەدا[1]یاخودهـەروەك هەنـدێك نوسـەر دەڵـێن پێـوەی ئـاڵێنراو پلانـی شیوعییەكان بوو بۆی سازكرابوو؟

لەڕاستی دا گـەیلانی لەبەر دوو هۆكـار مایـەی گومـانی كاربەدەسـتانی دەوڵەتی عێراقی بوو لەوكاتەدا:

١-ئـەو ڕابـردووەی كەهـەیبوو لەچـالاكی سیاسـی كەلەسـەردەمی پاشایەتیدا مومارەسەی كردبوو وەك وەزیرو بەڕێوەبردنی پۆستی دەوڵەتی[2]

---

[1] جرجیس فتح الله لەكتێبی رجال و وقائع فی المیزان پرسیارێكی لێكراوە سەبارەت بەم مەسەلەیەلەل. ٢٣٧دا و ئەویش لەوەڵامدا دەڵێت: بەو سیفەتەی كە مومارەسەی یاسایم هەبووە دەتوانم بڵێم ئەو كێشەی كەگەیلانی پـێ تۆمەتبار كرا ، بەخاسیەتی فرە بەڵگەیی ناسراوبوو لەمێژووی ئەم دادگایەدا ، كـەهیچ گومـانێكی نەدەهێشـتەوە لەبوونی پیلانێك بۆ خستنی دەسەلاتی عەبدولكەریم قاسم بەسەرجەم ئەو ڕەهەند وپەیوەندیانەشی كەبـەكۆماری عەرەبی یەكگرتووەوە هەیبوو، بەتایبەتیش خودی جەمسـەرەكەی واتەگـەیلانی، هۆكـاری دەسـتەبەر بـوونی ئـەم بەڵگانەش دەگەڕێتەوە بۆ دزەكردنی بەكرێگیراوانی حكـومی هەرلەسـەرەتاكەیەوە تاكۆتاییەكـەی، دادگاییەكـە بەشێوەیەكی نهێنی ئەنجام درا ، وپاشان لەزنجیرە كۆباسێكی دادگایی ئەم دادگادا كەناسراوە بەدادگای مەهـداوی ، هەڵگیرا ، دەگونجێت درەنگ كەوتنی بلاوكردنەوەی بـۆ شـێوازی پەیوەنـدی نێـوان عێـراق و كۆمـاری عـەرەبی بگەڕێتەوە كەلەو كاتەدا بەتەواوی پەیوەندییەكان تێك نەچووبوون، هەروەها لەبەر ئەوەی یەكەمین پیلانیش بـووە دژ بە ڕژێمی تازەو تاكە پێشەوا ، نەیان ویستبێت لەو سەرەتای دەستەلاتەیدا لـەم جـۆرە پیلانانـە بـەو ئاشـكرایە باس بكرێت، و بەتایبەتی تریش ناو هێنانی هەندێك سەركردەی سوپایی لەوپیلانەدا كە ئەمەش ئەو بانگەشـەی پوچەڵ دەكردەوە كەهەموو سوپای لەگەڵدایە..

[2] ڕەشید عالی گەیلانی لەسەردەمی دەسەلاتی پاشایەتیدا ئەم پۆستە حكومییانەی گرتۆتە ئەستۆ:

١-لەحكومەتەكەی عبدالمحسن السعدون دا (٢٦/٦/١٩٢٥ تا ١/١١/١٩٢٦ ) وەزیری ناوخۆ بووە.

٢-لەحكومەتەكەی جعفر العسكری دا (٢١/١٢/١٩٢٦ تا ٨/١/١٩٢٨ ) وەزیری ناوخۆ بووە.

٣-بووەتە سەرۆك وەزیران لەحكومەتی عێراقی نێوان ٢٠/٣/١٩٣٣ تا ٢٨/١٠/١٩٣٣ .

٤-لەحكومەتەكـەی یاسـین الهـاشمی دا (١٧/٣/١٩٣٥ تـا ٢٩/١٠/١٩٣٦ وەزیـری نـاو خـۆ بـووە و لـە ٩/٨/١٩٣٥ یش بە وەكالەت لەگەڵ پۆستی ناوخۆ دەبێتە وەزیری (داد)یش.

٥-بووەتە سەرۆك وەزیران لەحكومـەتی عێراقـی نێـوان ٣١/٣/١٩٤٠ تـا ٣١/١/١٩٤١ و لەهـەمان كاتـدا وەزیری( ناوخۆ)ش بەوەكالەت.

وچالاكی سەربازیش وەك بزوتنەوەیمایسی ١٩٤١، كەئەمەش وای كردبوو، جێگەی ئارامی متمانە و كاربەدەستانی تازەی وولات نەبێت و مەترسیان لێی هەبوو كەهەڵوێست لەبەرامبەر دەسەڵاتی تازەدا بگرێت بەر، چونكە ئەوەی لەسەر گەیلانی زیاتر بەدەركەوتبوو بریتی بوو لەحەزی دەسەڵات، تەنانەت هەتاكۆتایی تەمەنیشی ئەم حەزەی تێدا مابوو.

٢-شێوازی پەیوەندی لەگەڵ لەكۆماری عەرەبی یەكگرتوو خودی جەمال عەبدولناصرداو، بوونیتەمو مژ لەسەر ئەو جۆرە پەیوەندییانە، لەهەمان كاتیشدا بیروڕای عەبدولناصر لەبەرامبەر قاسم و دژایەتی كردنی دەسەڵاتەكەی، ئەمانە پاڵنەربوون تا دەسەڵاتی تازە بەگومانەوە لە جمو جوڵی گەیلانەی بڕوانێت..

بەم پێودانگانە مەترسی قاسم لەسەرجەم ئەو كەسایەتییە سیاسییە نەیارانەی هەیبون لەسەردەمی حوكمڕانیدا كەهەبوون، شتێكی راست بوو تا قاسم لە جموجوڵیان بكەوێتە گومانەوەو، لەهەمان كاتیشدا ئەم جۆرە هەوڵانەی گەیلانیدا زەمینەی سازبوو لە عێراقدا...!

---

٦-بووەتە سەرۆك وەزیران لەحكومەتی عێراقی نێران ٢١/٤/١٩٤١ تا ١/٦/١٩٤١ و لەهەمان كاتدا وەزیری( ناوخۆ)ش بەوەكالەت.

سەرچاوە : الصراع على السلطة في العراق الملكي) دراسة التحليلية في الادارة والسياسة، تأليف د. نزار توفيق سلطان الحسو، بغداد، ١٩٨٤، ص(١٦٢,١٦٣,١٧٠,١٧٣,١٧٧,١٧٩)

# دادگای مەهداوی

پاش مانگێک لەشۆڕشی ١٤ی تەمموز، کەتەختی پاشاییەتی لە عێراقدا روخاند،حکومەتی شۆڕش، (فازیل عەباس مەهداوی) کردە سەرۆکی دادگای باڵای سەربازی لەعێراقدا،مەهداوی کوڕی خاڵی قاسم و پێشتر بەپوتبەی سەرهەنگ (عقید) ، فەرماندەی حامیەی (موسەیب) بووە، [1]ئەندامانی ئەم دادگایە پێك دەهاتن لە (موقەدەم عەبدولهادی ئەلڕاوی) و(موقەدەم عەبدولفەتاح شاڵی) و( موقەدەم خزر ئەلدوری)..

---

[1] عەقید فازڵ عەباس مەهداوی کەسایەتی یەکی میللیگاڵتە جاڕی بوو، ئیدارەی کۆبونەوەکانی دادگای دەکرد بەدوور لەهەموو جۆرە ڕێساو یاسایەکی دادوەری، مەهداوی شارەزایی باشی هەبوو لەمێژووی ئەدەبیداو ئارەزووی بەلای شیعرو زمانەوانیدا دەچوو، تەنانەت ئەم حاڵەتە زاڵ بوو بەسەرباره سەربازییەکەشیدا، لێدوانەکانی ڕوون و بێگرێ و تەم و مژ بوون ، بەلێهاتووی دادگایی تۆمەتبارانی دەکرد و دەیویست بیکاتە سەنتەرێکی ڕاگەیاندنی شۆڕش، لەم نێوەشدا شیوعییەکان کۆك بوون لەگەڵیدا.. مەهداوی پەیوەندی تونەو تۆڵی لەگەڵ قاسمدا هەبووەو لەیەکێك لەدانیشتنەکانی دادگادا دەڵێت(( کێ کاریگەری دەنوێنێ لەسەر بیروڕاکانی زەعیم عەبدولکەریم قاسم ! ئایا کەسێك هەیە کاریگەری بنوێنێ لەسەر بیرو ڕاکانی؟ ئەم عەبقەرییە گەورەیە هەمولایەکمان لێوەی فیکرەمان وەردەگرین! تەنانەت تاوانبارەکانیش!!)) سەرچاوە: عبدالكريم قاسم وساعاته الاخيرە، احمد فوزي، چاپییەکەم ل(٥٦)

(فواد عارف) سەبارەت بەشێوازی پەیوەندی نێوان قاسم و مەهداوی دەڵێت:- دادگایی کردنی سەعید قەزاز بەتەواوی هەستی جوڵاندم، بەتایبەت ئەوەی کەهەندێ لەوانەی ئامادەبوون، حەبلیان هێنابوویە هۆڵی دادگاو سوکایەتییان پێدەکرد، بەیانی دوای ئەوە، چاوم کەوت بەقاسم وبەیەك ووشە پێم ووت( بەڕاستی دادوەریت لەدەست داوە لەم دادگایەدا و دادگای مەهداوی جگە لەکۆمیدیایەك هیچی ترنیە!) هەرلەو کاتەدا مەهداوی هاتە ژوورەوە و پرسیارم لێکرد: ئەو کۆبونەوەی دوێنێ دادگایی کردن بوو یان کۆمیدیا؟ لەوەڵامدا هیچی نەووت، تەنها هێندە نەبێت ئاماژەی دا بە قاسم کەئەو ئاراستەسازی ئەم مەسەلەیە، پاشان عەبدولکەریم پێی ووت: بڕۆ بەردەوام بە لەسەر ڤیستیڤاڵەکەت! (سەرچاوە : مذكرات فؤاد عارف، تقديم وتعليق د.كمال مظهر ، مطبعة خبات، ١٩٩٩، ص٢٠٧.)

(احمد فوزي)یش لەکتێبی (عبدالكريم قاسم وساعاته الاخيرە)، لەلاپەڕە ١٦٨ دا دەنوسێت: کاتێك لەدوای کودەتای ٨یشوباتی ١٩٦٣ هەریەك لەقاسم و مەهداوی و تەها شێخ احمد و ... لەبینایەی رادیۆی دادگایی سەربازی دەکران، عەبدولسەلام عارف ڕوودەکاتە مەهداوی و پێی دەڵێت: ها! ئەبو عەباس! دادگاکەت وەزعی چۆنە؟ ئەویش لەوەڵامدا دەڵێت: من هیچ پەیوەندیم پێوەی نەبووە، پرسیار لەوە بکەن، هەموو سوچیئەوەبوو(مەبەستی عەبدولکەریم قاسم بوو) .. لەسەرزاری محمود شیت خەتابەوە، احمد فوزي لەهەمان سەرچاوە و لاپەرەدا دەنوسێت کەمەهداوی ئامادەبوو دادگایی قاسم بکات بەهەمان ئەو حەماسەتەوە کەدادگایی

لەهەمان کاتدا کوتلەیەکی هاوبیرو ڕاو لێك گەیشتوو دروست بووبوو لەم دادگایەدا لەنێوان هەریەك لە(فازیل عەباس مەهداوی) سەرۆکی گشتی و (عقید ماجد محمد امین)[2]ی داواکاری گشتی و (عقید وەسفی تاهیر).

بەهۆی ڕاوەستانی چەندان کەسایەتی سیاسی و سەربازی لەبەردەم ئەم دادگایەدا، وای کردبوو کەمەهداوی شێوازێك لەمتمانە بەخۆبوونی بۆدروست ببێ، وەك ئەوەی کەچۆن سوکایەتی بەعەبدولسەلام کردبوو، مەهداوی زیاتر پاڵنەربوو بۆسزادانی تاوانباران وەك لەداواکاری گشتی، کەئەمەش پێچەوانەی سروشتی کارەکەی بوو وەك سەرۆکی دادگا کەدەبێت بێلایەن بێت. تەنانەت هەندێ جار نەك هێندەی بێلایەن بێت، بەڵکوبەهۆی توانا ئەدەبییەکەیەوە بواری قسەکردنی نەدەدا بە تۆمەتبار تا پارێزگاری لەخۆی بکات [3]تاگەیشتبوویە ئاستێك پێش دەرچوونی حوکمی دادگا ئەو لەلایەن خۆیەوە تۆمەتبارەکەی حوکم دەدا! بەم جۆرەش ئەم ناوەو دادگاکەشی بوونە خاڵێکی جیاکەرەوەی سەردەمی دەسەڵاتی زەعیم قاسم ، لەبەرئەوەشی کەمەهداوی ڕۆڵی سەرەکی لەم دادگایەدا دەبینی لەناو خەڵکیدا بەناوی خۆیەوە ناوبانگی دەرکردبوو، مێژوویەکیشی بۆخۆی تۆمارکردبوو لەعێراقدا ئەویش بەچاپ کردنی وردەکاری سەرجەم دادگایی کردنەکانی و مانەوە بۆنەوەکانی داهاتوو، لەم دادگایەدا بەردەوام ژمارەیەك

---

دوژمنەکانی قاسمی کردبوو، تەنانەت فەرمانی سێدارە دانیشی بۆدەربکات!.. مەهداوی ساڵی ١٩١٥ لەخێزانێکی شێوە هەژار لەدایك بووە، هیچ جۆرە جیاوازییەك بەدی نەکراوە لەنێوان سەردەمی قوتابێتی و ژیانی سەربازیدا، هەروەها پاش دەرچوونی لەکۆلیژی سەربازی سەرکەوتوو نەبووە لەهیچ شتێکدا، بەشداری جەنگی فەلەستینی ساڵانی ١٩٤٨-١٩٤٩ ی کردووە، پەیوەندی کردووە بەئەفسەرانی ئازادیخوازەوە پێش ساڵی ١٩٥٨، بەڵام ئەندام نەبووە لەمەرکەزی لیژنەدا( سەرچاوە: العراق الجمهوری، نوسینی د.مجید خدوری، ل١٢١)

[2] موقەدەم روکن ماجد محمد امین لە شاری نوعمانیە لە دایك بووە و کۆلیژی سەربازی لە ساڵی ١٩٤١ تەواو کردووە، پاشان ساڵی ١٩٥١ بروانامەی (حقوق) بەدەست دێنێت.

[3] العلوی، حسن (عبدالکریم قاسم رؤیة بعد العشرین) منشورات دار الزوراء، لندن ١٩٨٣، ص٤٤.

لەجەماوەر و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەنوسان ئامادەی دادگاییکردنەکان دەبوون و ڕاستەوخۆ لەسەرتەلەفزیۆنەوە تەفاصیلەکانی پەخش دەکرا، وخەڵکی ئاگاداری ڕەوتی دادگاییەکە دەبوون، هەربۆیەش پیێ دەوترا (دادگای گەل).

بێگومان هەرچەند گواستنەوەی ڕاستەوخۆی دانیشتنەکانی دادگا بۆسەرشاشەی تەلەفزیۆن، هەنگاوێکی بوێرانە و عادیلانەبوو،کەزۆر کێشە و گرفتی بۆشۆڕشی ١٤ی تەموز هێنایە ئاراوە، و تەنانەت بۆخودی قاسمیش.. خێزانی تۆمەتبارەکە چاودێری ڕەوشی دادگایان دەکرد، کەئایا ڕۆڵەکەیان چی کردووە و چی نەکردووە.. بێگومان دادوەر لەم جۆرە حاڵەتانەدا ناتوانێت کەبەوجۆرە دوورە لەچاوی کامێرا بەهەمان شێوەش لەبەردەم کامێرادا هەمان حاڵەت دووپات بکاتەوە، لەبەرئەوە دادگایی کردنی لەم چەشنە شتێکی تازە بوو، بەدەر لەهەندێك هەڵوێست و بڕیاری نەشیاو، چ لەلایەن خودی دادگا، یاخود مەهداوی، یان ئەو جەماوەرەی ئامادەی دادگایییەکە دەبوون و گاڵتەیان بەتۆمەتبارەکە دەکردوو تەنانەت حەبلیان بۆ هەڵدەدا تارایبکێشن، لەگەڵ ئەمانەشدا دادگایی مەهداوی جورئەتێکی نویێ بوو کەبەو جۆرە و بیێباکانە دادگایی تۆمەتبار دەکرا، لەبەرچاوی خەڵکی و ڕۆژنامەنووسان و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن.[1] لەگەڵ ئەوەی ئەم پەخش کردن و ئاشکراکردنەش لەلایەکی دیکەوە جێگەی ڕەخنەی هەندێك لەخەڵکی و هەندێك ناوەندی نێودەوڵەتی بوو، بەتایبەت ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ و لێبوردنی نێودەوڵەتی.[2]

---

[1] حسن العلوی لە کەناڵی ئاسمانی ئەبو زەبی بەرنامەی (بین الزمنین ) دا دەڵێت : ئێستاش گەربێتوو لەم کاتەدا دادگایەکی وەك ئەوەی مەهداوی لەعێراق تەشکیل بکرێت من ئامادەم بچمەوە عێراق تائەو دادگایە دادگایم بکات .

[2] العلوی، حسن (عبدالکریم قاسم رؤیة بعد العشرین) منشورات دار الزوراء، لندن ١٩٨٣، ص٤٥.

## پێکهێنانی دادگای باڵای سەربازی تایبەت

### ( دادگای مەهداوی )

ئەنجومەنی وەزیران لە یاسایەکی ڕۆژی ٧ی ئابی ١٩٥٨دا کەیاسای ژمارە ٧ی ساڵی ١٩٥٨ بوو، دەستەیەکی لێکۆڵینەوەی پێك هێنا، کە هەروەك لە ماددەی هەشتەمی یاساکەدا هاتووە هەڵدەستێ بە لێکۆڵینەوەی ئەو تاوانانەی یاسای سەرەوە ئاماژەیان پێدەکات، هەروەها دەستەیەکی راوێژکاری پێك هات بەپێی ماددەی نۆ لە هەمان یاسا کە راستەوخۆ پەیوەست بوو بە سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکانەوە و هەڵدەستا بە توێژینەوەی ئەو داوایانەی بۆی بەرز دەکرایەوە لەلایەن دەستەی لێکۆڵینەوەوە، هەروەها بەپێی (ماددەی یانزە) داواکاری گشتی پێك هات و ئەرکەکەشی بریتیبوو لە جولاندنی داواکان دژ بە تاوانباران و بەدواداچونیان..

**دەستەی داداگا**

مەرسومی کۆماری ژمارە (١٨) لە مێژووی ١٩٥٨/٧/٢٠ چاککراو بە مەرسومی کۆماری ژمارە ١٦٤ لە بەرواری ١٩٥٨/٨/١٥ بڕیار درا بە دانانی دەستەی دادگا بەم جۆرەی لای خوارەوە : –

بەپشت بەستن بەوەی ئەنجومەنی وەزیران بڕیاری لەسەر داوە لە بەرواری ١٩٥٨/٧/٢٠ و لەسەر ئەوەی کە وەزیری بەرگری خستویەتی یە پێش دەست ، بڕیارمان دا بەمانەی لای خوارەوە:–

١–دانانی عەقید فازل عەباس ئەلمەهداوی بەسەرۆکی دادگای باڵای سەربازی تایبەت.

٢-دانانی موقەدەم عەبدولهادی راوی (ئەندام)

٣-دانانی موقەدەم فەتاح شالّی (ئەندام)

٤-دانانی موقەدەم شاکر مەحمود سەلام (ئەندام)

٥-دانانی (رئیس الاول) ئیبراهیم عەباس ئەللامی (ئەندام)

٦-دانانی (رئیس الاول) کامل حسین شەماع (ئەندامی یەدەك)

پێویستە لەسەر وەزیری بەرگری ئەم مەرسومە جێبەجێ بکات

لەبەغداد نوسرا لە رۆژی سێی موحەرەمی سالّی ١٣٧٨ بەرامبەر بە رۆژی بیستی مانگی تەمموزی سالّی ١٩٥٨.

## دەستەی داواکاری گشتی

دەستەی داواکاری گشتی لە بنەما سەرەکییەکانی دادگابوو، ئەرکەکانی بریتی بوو لە جولاندنی داواکان و ئاراستەکردنی تۆمەت و بەشداری چالاکانە لە گفتو گۆکانی تاوانبارو شاهیدەکان..

بەپێی مەرسومی کۆماری ژمارە ١٣٧ی ١٩٥٨/٨/٩ وچاککراو بە مەرسومی کۆماری ژمارە ١٦٤ لە ١٩٥٨/٨/١٥ و فەرمانی وەزاری ژمارە د/٥٠/٢٧٤٩ لە بەرواری ١٩٥٨/٨/٢١ بڕیار درا بە دانانی دەستەی داواکاری گشتی بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

١-عەقید روکن ماجد محمد ئەمین.

٢-دادوەر بەڕێز غازی عەبدولهادی.

تێبینی: هەریەك لە دادوەر (بەرێز عەبدولجەلیل حەبیب) و جێگری داواکاری گشتی (بەڕێز مستەفا حسین ئەلدوری) وەك ئەندامی دەستەی داواکاری گشتی بەشداری کۆبونەوەکانی ١١بۆ ٧ دەکەن، پاشان راگەیاندنی دەستەکە هەروەك رون کراوەتەوە.

دەستەی راوێژکاری

## مەرسومی کۆماری ژمارە ١٣٧

بە پشت بە ستن بە ماددەی نۆ و یانزە لە یاسای سزادانی خراپەکاران و پیلان گێڕان دژ بە ئاسایشی دەوڵەت و لەسەر بنەمای ئەوەی کە وەزیری بەرگری وداد خستویانەتە بەردەست، بڕیار مان دا بە:

دستەی راوێژکاری سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکان پێك دێت لە :

- بەڕێز حسین محی الدین ( جێگری سەرۆکیتێهەڵچونەوەی بەغداد)
- بەڕێز عەبدولئەمیر عەکیلی ( جێگری داواکاری گشتی)
- رئیس الاول روکن عەبدولستار عەبدولەتیف.

## دەستەی لێکۆڵینەوەی تایبەت

یەکەم/ پێکهێنان

بەپشت بەستن بە ماددەی هەشتەم لەیاسای ژمارە (٧) ی ساڵی ١٩٥٨ و بەپێی هەردوو فەرمانی وەزاری ژمارە (٢٢٧٥) و (٢٢٨٣) لەبەرواری ٢١و ١٩٥٨/٧/٢٩ دەستەی لێکۆڵینەوە پێکهات، و پاشان بەپێی فەرمانی وەزاری ژمارە (٢٧٥٦) ئەندامانی بۆ دانرا و بەم شێوەی خوارەوە پێکهات:

- عەقید محمود عبدالرزاق (سەرۆکی دەستە)
- موقەدەم داود سەلمان غولامی (ئەندام)
- موقدم حقوقی عبدالوهاب مودرس (ئەندام)
- رەئیس سعید کازم مەتەر (ئەندام)
- رەئیس عبدالحمید شوکری (ئەندام)
- رەئیس حازم عبدالفتاح صەباغ (ئەندام)
- دادوەر سەید حافز خالد (ئەندام)

-دادوەر سەیدصادق حەیدر (ئەندام)
-دادوەر سەید شامل رەشید شێخلی (ئەندام)
-دادوەر تالب نائب (ئەندام)

**دووەم / ئەرکەکانی**

بەپشت بەستن بە فەرمانی سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکان بە ژمارە ق.ق.م /١٩/١٧ لە ١٩٥٨/٨/١٧ تێدا ئاماژە دەداتە ئەرکەکانی دەستەکە و لە پێناو زەمانەت کردنی رەوتی کارەکان و بەپێی یاساکان ، دەبوایە پاش رەزامەندی سەرکردەی گشتی هەستانایە بەم ئەرکانە:

١-بڕیاری وەستانی هەر کەسێك کە پێویست بکات لێکۆڵینەوەی لەگەڵا ئەنجام بدرێت بەو سیفەتەی کە تۆمەتبارە بە تاوانێك یان زیاتر.

٢-دەستگیرکردنی هەرکەسێك کەپێویست بکات لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکرێت هەروەها مافی دەرکردنی فەرمانیش بە گرتنی بۆ ماوەی دیاری کراو.

٣-فەرمانی گرتن لەلایەن دەستەی لێکۆڵینەوەوە لە کۆنوسی هەموو کێشەیەکدا تۆمار دەکرێت.

٤-دەستەلاتی درێژ کردنەوەی ماوەی گرتنی هەیە بەپشت بەستن بە یاداشتەکانی گرتنەکە کەلە پێشدا دەرچووە، یاخود ئەوەی دەدرێت بەدەسەلاتە تایبەتەکان بۆ درێژ کردنەوەی ماوەکە.

٥-داواکردنی بەڵگە یان نیشانە یان پەراو کە پەیوەندی بە لێکۆڵینەوەکەوە هەبێت لە هەر لایەك ئیتر ئایا رەسمی بێت یان نارەسمی و لە هەر کەسێك تاوانبار بێت یاخود بێ تاوان.

٦-دەتوانێت ئامۆژگاری پێشکەش بکات (دەربارەی ئازادکردن وبەردان بەکەفالەت ) بە سەرکردایەتی گشتی هێزە چەکدارەکان، بەو مەرجە کەجێبەجێ نەکرێت تا پاش موصادەقە لەسەرکردنی.

سێیەم / شێوازی داواکردنی ئەنجام دانی لێکۆڵینەوە

پێش وەخت لەلایەن دەستەی لێکۆڵینەوە داوا پێشکەش دەکرێت بۆ بەردەستی سەرکردایەتی گشتی بەمەبەستی لێکۆڵینەوە و پاشان کێشەکە لەلایەن سەرکردایەتی گشتی هێزە چەکدارەکانەوە دەخرێتەوە بەردەست دەستەی لێکۆڵینەوە بۆ کارکردن لەسەری.

بەم جۆرەش دەستەکە بەردەوام لە کاردا بوو شەو رۆژ لە پێناو بەرهەم هێنانی کاری زۆر لەماوەیەکی کورتدا.

## دەستەی هەماهەنگی و کۆنترۆڵ کردن

بـەپێ نوسـراوی بەڕێوەبـەرێتی کـارگێڕی ژمـارە م.أ/ش١/٥٩٢١٨ لەبەرواری ١٩٥٨/٧/٣١ بڕیاردرا بە دانانی ئەم ئەفسەرانەی لای خوارەوە بە ئەفسەری هەماهەنگی و کۆنترۆڵ کردن:

١-(رئیس الاول) ی حقوقی فازڵ عبدالهادی موصلح بۆ ئەرکی ئەفسەری هەماهەنگی.

٢-رئیس کەمال نوعمان سابت بۆ ئەرکی ئەفسەری هەماهەنگی.

٣-رئیس تاریق عەباس حلمی بۆ ئەرکی ئەفسەری پەیوەندی.

٤-مولازمی یەکەم سامی حاجی مەجید بۆ ئەرکی ئەفسەری کۆنترۆڵ کردن.

٥- مولازمی یەکەم کامل محمود خەتتاب بۆ ئەرکی ئەفسەری کۆنترۆڵ کردن.

## قەڵەمی دادگا

قەڵەمی دادگا لەمانە پێك دەهاتن:

١-النائب الضابط الکاتب حسین علی الجبوری

٢-النائب الضابط الکاتب سعدی رشید

٣-النائب الضابط الکاتب خلیل عباس اللامی .

٤-العریف الکاتب جابر محمد

٥-العریف الکاتب حسن کاظم

٦-النائب العریف داود سلمان.

شایانی باسه دادگا له رۆژی ١٦ی ئابی ١٩٥٨ دەست بەکاربوو، لەباڵە خانەی ئەنجومەنی نوێنەرانی پێشووی عێراقی لەسەر روباری دیجلە لەبەری رەصافه.[1]

دادگای باڵای سەربازی لەبڕیاری دامەزراندنیدا هاتبوو: کە ئەرکەکانی بــریتین لــەدادگایی کردنـــی کەســایەتییە کاربەدەســـتەکانی ســـەردەمی پاشایەتی و لێپرسینەوەیان لەسەر ئەو کارانەی کردبوویان و کاریگـەری هەبوو لەسەر ئاسایشـی دەوڵـەتی عێـراق، یاخود ئەو کارانەی کەهاندەری خراپەکاری بوون لەسەردەمی پاشایەتیدا، لەم نێوەشداو لەسکێچی تاوانی یەکەمدا هەموو ئەو کارانەی دەگرتەوە کەلەڕووی سیاسی و سەربازییەوە بەدەستێوەردان دەژمێـردرا لەووڵاتانی دراوسێدا (عەرەبیەکان)، لەسکێچی تـاوانی دووەمیشـدا هــەموو ئــەو بڕیارانــە دەهــاتن کەکەسـێك بەسـیفەتی وەزیری یان کارمەندی پلەیەك دەری کردبوو و بووبێتە مایەی زیان گەیاندن بەبەرژەوەندی گشتی،یاخود حورمەتی یاساکانی وڵات پێشێل بکات.

شـایانی باسە ئەودەسەڵاتە فراوانەی درابوو بەم دادگایە، توانیبووی سەرجەمی ئەو یاسایانە جێبەجێبکات کەدژی شۆڕش بوون، ئیتر ئایا کـاری پیلانگێـڕی بـووبێ دژ بەدەوڵــەت، یـاخود بەشـداری کـردن بـووبێ لەوکارانەی دەبوویە مایەی خراپەکاری..

لەسەر ئەم دادگایە پێویست بوو سێجۆر تاوان چارەسەربکات:

**یەکەم/** دادگایی کردنی کاربەدەستە پێشووەکانی سەردەمی پاشایەتی، کەلەناوەڕاستی مـانگی ئابی ١٩٥٨ وە دەستی پێکرد هەتا مـانگی مارسی

---

[1] الجعفری، محمد حمدی ، محکمة المهداوی اغرب المحاکمات السیاسیة فی تأریخ العراق الحدیث، سنة ١٩٩٠ ط١ ص٣١,٣٢,٣٣,٣٤,٣٥,٣٦.

١٩٥٩، کەبەشی هەرە گەورەی ئەو دادگایی کردن و مورافەعاتانەی پێك دەهێنا ومایەی ووروژاندنی حەماسەتی جەماوەر بوو، تەنانەت جێگەی ڕابواردن و گاڵتەجاڕیش بوو لەلایەن ئامادەبووانی هۆڵی دادگاوە کەبەزۆری لەشیوعی‌یەکان پێك دەهاتن. چونکە ئامانجی سەرەکی ئەم دادگایە نەك تەنها حوکم دان بوو بەسەر تۆمەتبارەکاندا، بەڵکو ناوزڕاندن و گاڵتەپێکردن و سوکایەتی پێکردنیان بوو، سەرەرای ئەوەی هەندێکیان لەسێدارە دران، لەژێر فشاری ڕای گشتی دا. بەڵام بەشێکی زۆریان ئازاد کران، پاش بەسەربردنی ماوەی زیندانی کورت خایەن و درێژخایەن و ئەوانەشی بڕیاری لەسێدارەدانیان بەسەردا سەپێنرا بریتی بوون لە (سەعید قەزازی وەزیری ناوخۆ، عەبدولجەبار فەهمی موتەسەڕیفی بەغداد، بەهجەت عەتییە بەڕێوەبەری ئەمنی گشتی) لەم دادگاییانەدا مەهداوی ناوبانگی بڵاوبوویەوە نەك تەنها لەسەرئاستی عێراق، بەڵکو لەسەر دەرەوەی عێراقیش.[١]

## دادگایی کردنی سەعید قەزاز

لەقۆناغی یەکەمی دادگایی کردندا، شەش بڕیاری لەسێدارەدان دەرکرا، چوارکەسیان کەسایەتی سەردەمی پاشایەتی بوون، کەدادگایی کردنەکەیان بەئاشکرا ئەنجام درا، دوو کەسەکەی تریش کەبریتی بوون لە( عەبدولسەلام عارف و ڕەشید عالی گەیلانی) بەنهێنی دادگایی کران، بەڵام بڕیاری لەسێدارەدانەکان تەنها بەسەرچوارکەسەکەی سەردەمی پاشایەتی‌دا جێبەجێکرا، لەنێویشیاندا (سەعید قەزان)..

---

[١]خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر – قم ١٩٩٧ ، ص ١٠٩،١١٠،١١١،١١٢.

قـەزاز یـەكێك بـوو لـەناودارەكانی سـەردەمی پاشـایەتی و كـورد بوو،بەشێوەیەك لەبەردەم دادگادا دائۆكی لەخۆی كردبوو كە هەموو جۆرە ئازایەتی و لێوەشاییەكی تێدا بەرجەستەبوو بوو، تەنانەت لـەكاتی بەرگری كـردن لەخۆیـدا [2]وتەیـەكی زۆرجوان و بـەهێزی ووتبـوو، كـاتێكیش بڕیـاری لەسـێدارە دانـی بۆدەرچـوو بـوو لەوتەیـەكی بەناوبانگیـدا وتبـووی( **دەچـمە سەركورسی سێدارە، بەلام لـەژێر پێمـدا كەسـانێك دەبیـنم كەشایسـتەی ئـەوە نـین بژین** )[3] قەزاز كەسێك بوو یاسای بەتـەواوی دەچەسپاند، خـاوەن جورئـەت و ڕاست و ڕەوان بـوو، لەڕاستیدا مایـەی گاڵتـە جاڕی بـوو كەكەسـایەتی‌یەكی خاوەن سومعەو لێهاتوو، ببێتە یەكەم كەس كە لەسێدارە بدرێت![4]

دەربـارەی سـەعید قـەزاز، لەیاداشـتەكانیدا فوئـاد عـارف دەنوسـێت (سـەبارەت بەكێشـەی لەسـێدارە دانـی سـەعید قـەزاز، كەیەكـەم كێشـە بـوو ڕوبـەڕوی كۆمـاری تـازە دروست بـووی عێـراق دەبـووە، ویسـتم بچمە نێـو كێشەكە و لـەلای قاسـمەوە هـەوڵ بدەم بۆڕزگـاركردنی قـەزاز، ئەمـەش نـەك لەبەرئەوەی كەكوردو هاوزمان و نەژادی خۆمە، بەڵكو ئەم پیاوە بەڕای مـن و زۆربەی خەڵكی شایانی لەسێدارە دان نـەبوو، بـەڵكو شـایانی لێبـوردن بـوو، لەبەرئـەوەی كەسـاڵی ١٩٥٤ شـاری بەغـدادی لـەخنكان ڕزگـار كردبـوو... لێـرەدا دەڵـێم كەقاسـم نەزعـەی ڕاسـتەقینە و حـەزی لەسـێدارەدانی

---

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٢١.

[3] عارف، فؤاد ، مذكرات، الجزء الاول، الطبعة الاولى، ١٩٩٩ مطبعة خبات، تقديم وتعليق د. كمال مظهر احمد ص٢٠٦.

[4] خدوری، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص١٢١.

هەڵنەگرتبوو، بەڵكو كەوتبووە ژێركاریگەرییەوە، بەو جۆرەش قەزازی لەسێدارە دا.

لەبەرەنجامی ڕەوتی دادگاییكردنی سەعید قەزاز و زمانی دادگاو دەركەوتنی لۆژیكی نێوان تۆمەتبارو و دادوەر، بەراستی قەزاز لەئاستی ئەم دادگایەی زۆر بەرزكردەوە كەحوكمی دا؟ ئەمە ڕاستی‌یەكە بۆمێژوو، دەكرێت هەركەس وەقایعەكانی ئەم دادگایە بخوێنێتەوە بگاتە ئەوەی ئێمە پی‌ی‌گەیشتووین)[1] بەم جۆرەش كاتێك قەزاز لەسێدارە درا زۆرێك لەناوەندە سیاسی و ئیعلامییەكان بە نیگەرانیەوە دەیان ڕوانییە ئەم كارە و بەزیانێكی گەورەیان وەسف كرد.

## دەقی دادگایی كردنی سەعید قەزاز

+ **دادگا** : تاوانبار سەعید قەزاز! ڕەوانەی ئەم دادگایە كراوی تا دادگایی بكرێیت لەسەر ئەو تۆمەتانەی ئاراستەت كراوە.

- **سەعید قەزاز**: چەندان جار دووپاتم كردەوە كەمافی بەرگری لەخۆكردن ، پیرۆزە و بەناوی ئەم پیرۆزییەوە داواكارم ڕێگەم پی‌بدەن بەرگری كردنەكەم بخوێنمەوە، بی‌ئەوەی كەس پێم ببڕی‌ تا تەواودەبم

+ **دادگا** : فەرموو !

- **قەزاز** : سوپاس.. پاش شۆڕش بەئارەزووی خۆم، خۆم تەسلیمی دەسەڵاتی سەربازی كرد، مەبەستیشم لەم پێشەكی‌یە،( بەدرۆخستنەوە) ی بانگەشەی (داواكاری گشتی)یە كەمن لە ترسا جل و بەرگی ژنانەم لەبەركربێت، كەهیچ جۆرە ڕاستی‌یەك لەم قسەیەدا نیە.

---

[1] عارف، فؤاد، مذكرات، الجزء الاول، الطبعة الاولى، ١٩٩٩ مطبعة خبات، تقديم وتعليق د. كمال مظهر احمد ص٢٠٥,٢٠٦.

+ دادگــــا : بـــەدەر لەدەســـتەواژەی( بەدرۆخســـتنەوە) راســـتەکەی ( راستکردنەوەیە)

- قەزاز : من بەڵێنم لەبەڕێزتان وەرگرت کەقسەکانم پێ نەبڕن.

+ دادگا: پێویستە راست بکرێتەوە و ببێتە (راستکردنەوە).

- قـــەزاز : بـەرگری کـردن ، بـەرگری‌کردنی خۆمـە و خـۆم بەرپرسـیارم لەهەموو ووشەیەك کەتێیدا هاتووە..

+ دادگــا : بەڕاسـتی سـەردەمی درۆ بەسەرچـوو، بەفـەرمانی گـەل ڕاسـتی بکەرەوە... بەرگرییەکەت تەواوبکە..!

- قـــەزاز : هەرلەســـەرەتاوە دادگـا بێ‌لایـەن نـەبووە، بـەجۆرێك توشـی چەندەها سوکایەتی پێ‌کردن بوومەتەوە ، نەك تەنها لەلایەن سەرۆکی دادگا و داواکاری گشتی یەوە، بەڵکو تەنانـەت لەلایـەن کەسانێکەوە کـەهیچ جـۆرە سـیفەتێکی ڕەسمی‌یـان نـەبووە، سـەبارەت بـەو تۆمەتانـەی کەڕووبـەڕووم کراوەتەوە لەلایەن داواکاری گشتی‌یەوە، ئەوە بەڵگەی ڕقێکـی شـاراوە یـە و پشت بەهیچ جۆرە ماددەیەکی یاسایی نابەستێت،

+ دادگـــا: ئایـا تۆزانیـاری پـێش وەختـت هەیـە، ( ڕق) واتـای ئاکـامی دوژمنایـەتی نێـوان دووکەسـە، ئەمـەش حـوکمی گەلـە دژبـە تـۆ، ئەمـە دەگونجێت، ئایا ئەمەش لێکدانەوەیەکی باوە؟.

- قـەزاز : بەڕاستی مـن دەتـوانم بەڵگـەی شـاهیدەکان پوچـەڵ بکەمـەوە، تەنانەت یەك ڕووداوی دیـاری کـراو لەسەرم نەچەسپاوە، کـە مـن سەرپێچـی یاسایم تیاکردبێت، من ئێستا وەستاوم و مردنم لەئان وساتدایە، بەهیچ جۆرێـك لەسێدارە ناترسم، کاتێکیش دەچمە سەرکورسـی سـێدارە، زۆرکـەس دەبیـنم لـەژێر پێمدا، کەشایستەی ژیـان نـین، وەك عێراقی‌یـەك رادەوەسـتم ، کـەماوەی ٣٣ سـاڵ خزمەتم پێشکەش کردووە، بۆبەرز راگرتنی یەکێتی عێراقی پیرۆز، شانازی دەکـەم

**بەوەی وەزیرێکی کاراو چالاك بووم، بەئیلهامی خوایی و ژیری و دڵگەرمیم کارم کردووە.**

**+ دادگا:** مافی بەرگری کردن پیرۆزە، چۆن بەرگری دەکات بابیکات، ئێمەش لەبۆسەداین بۆی.

**- قەزاز: بەرگری کردنەکەم بەوە کۆتایی دێنم، کە داوای بەزەیی و لێخۆشبوون لەهیچ کەس ناکەم، بەڵکو سەرجەم کارەکانم دەدەمە دەست خوا( واصبر حتى يحكم الله ، وهو خير الحاكمين )**[1]

**دووەم/** جۆری دووەمی ئەو تاوانانەی دادگا تێیدەڕوانی، دادگاییکردنی دوژمنانی شۆڕش بوو ، لەمەدەنی و سەربازییەکان، لەوانەی کەلەئەفسەرانی ئازادیخوازدا هاوکاری قاسمیان کردبوو، پاشان هەڵگەڕابوونەوە لێی بەتایبەت ئەوانەی بەشداری جوڵانەوەکەی شەوافیان کردبوو، زۆربەی ئەمانە دادگایی کردنێکی کورت و خێرا کران و پاشان لەسێدارە دران ، بەڵام ناو وناوبانگی مەهداوی لەم قۆناغەیاندا تادەهات بچوك و قێزەون دەبوویەوە، بەپێچەوانەی قۆناغی یەکەم و دادگایی کردنی پیاوانی سەردەمی پاشایەتی، چونکە زۆربەی ئەوانەی کەلەسێدارە دران ئەفسەری سوپا بوون، مەهداویان لەکۆلیژی سەربازیدا یان لەیەکەکانی سوپادا ناسیبوو، لەهەردوو بارەکەشدا ڕێزیان نەدەگرت، بەجورئەتەوە وەڵامی قسە و سوکایەتییەکانیان دەدایەوە، بەدەر لەم حاڵەتەش ئەو( ڕا ) گشتییەی کەهەبوو لەسەر دادگایی کردنی پیاوانی سەردەمی پاشایەتی لەم کاتەدا وەك پێویست نەبوو،[2] جگە لەشیوعییەکان نەبێت، کەتەسفیەی حساباتی خۆیان لەگەڵ باڵی نەتەوەپەرستەکان لەو بوارەدا دەکردەوە..

---

[1] کەناڵی ئاسمانی ئەبووزەبی، بەرنامەی (بين الزمنين) ساڵی ٢٠٠٢ ئامادەو پێشکەش کردنی (احمد مهنا).
[2] خدوري، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص١١٢.

**سێیەم** / کۆمەڵەی سێیەم کەدرانە دادگا بریتی بوون لەوانەی کەهەوڵی تیرۆر کردنی قاسمیان دابوو، بەڵام ئەم دادگایی کردنانە پەلەی کرد لەئاوابوونی خۆری دادگاییەکەی مەهداویدا چونکە ئەو حوکمانەی لەدژیان دەرچوو بوو، قاسم خۆی دەری کردبوو، بێهیچ ئیعتبارێك بۆدادگاییەکەی مەهداوی، پێدەچێت کاروبارەکانی ئەم دادگایە پاش ئەم کارە وەستابێت، بەبەڵگەی ئەوەی کەدوای ئەم حاڵەتە چیدی کەس لەبەردەم ئەم دادگایەدا ڕانەگیرا، بەڵام بەدەر لەوەی بەرپرسیارێتی ئەو تۆی لەگەردندا نەما، بەڵام وەك پێگەیەکی سەرەکی دەستەڵاتی قاسم دەهاتە ژماردن و چارەنوسی بەسترابوو بەچارەنوسی قاسمەوە.[٣]

بەسەرجەمی ئەو بڕیارانەی کەدەردەچوون بەلەسێدارەدان، قاسم ئیمزای نەدەکردن، تاوەك کارتێکی فشار بەسەرنەیارەکانییەوە بمێنێتەوە، بۆنمونە بڕیاری لەسێدارەدانی هەریەك لە عەبدولسەلام عارف و ڕەشید عالی گەیلانی ئیمزا نەکرد، تەنانەت لەدوایشدا بڕیاری لێخۆشبوونی دەرکرد بۆعارف و سەرجەمی ئەوموچە فەوتاوانەی کە لەزینداندا بوو هەمووی بۆگەڕاندەوە و ڕەوانەی ماڵەوەشی کردەوە، سەبارەت بەو (١٧) تۆمەتبارەی کەلە٢٥ی شوباتی ١٩٦٠ دا، دادگا بڕیاری سێدارەی دابوو بەسەریاندا و (١١) کەسیان هەڵاتبون بۆ دەرەوەی عێراق، قاسم ڕازی بوو تاحوکمەکە بەسەر ئەو شەش کەسە گیراوەدا جێ بەجێ بکرێ، وادەکەشی ١٩٦٠/٣/٣١ دانرابوو بۆجێبەجێکردنی حوکمەکە،[٤] بەڵام پێش جێبەجێکردنی

---

[٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١١٣.

[٤] حسن العلوی دەگێڕێتەوە کەکەس وکاری ئەوانەی کەحوکمەکەیان لەدژ دەرچوو بوو، گۆڕیان ئامادەکردبوو بۆکوڕەکانیان، وادەی حوکمەکەیان پێ ڕاگەیەنرابوو بڕوابەرێ بوون. (کەناڵی ئەبو زەبی ، _ بەرنامەی بین الزمنین)

حوكمەكە بە(٤) سەعات ، قاسم لەسەر تەلەفزیۆن دەركەوت و حوكمەكەی هەڵوەشاندەوە لەهەموویان خۆش بوو، ئەمەش موفاجەئەیەكی تری سیاسی قاسم بوو، قاسم ڕایگەیاندبوو كە من لەمافی خۆم خۆش دەبم سەبارەت بەم چەكدارانەی كەتەقەیان لێكردووم، داواكاریشم لەكەس و كاری شۆفیرەكەم تا لەمانە خۆش بن!!

لێرەدا ئاماژە دەدەینە ئەو حوكمی لەسێدارانانەی كەلەسەردەمی قاسمدا جێبەجێكران:

١-بەرواری ١٩٥٩/٤/٥ حوكمی سێدارە دان جێبەجێكرا بەسەر چوار ئەفسەری فڕۆكەواندا.[1]

٢-بەرواری ١٩٥٩/٨/٢٥ حوكمی سێدارەدان جێبەجێكرا بەسەر چوار ئەفسەرو هاولاتی‌یەكدا، لەوانەی بەشداری جولانەوەكەی شەوافیان كردبوو، ئەم كارەش شەپۆلێك توڕەیی بەدوای خۆیدا هێنا.[2]

٣-سپێدەی ١٩٥٩/٩/٢٠ حوكمی سێدارە جێبەجێكرا بەسەر چواركەسایەتی سەردەمی پاشایەتی و، ئەمەش جگە لەئیستنكارێكی سنوردار لەئوردون، هیچ شتێكی ئەوتۆی لێنەكەوتەوە.

٤- ١٩٥٩/٩/٢٠ پاش دوو سەعات لەجێبەجێ كردنی حوكمی سێدارەی وەجبەی یەكەم ، دواین وەجبە لەسێدارەدران بەتەقە لێكردنیان كەژمارەیان (١٢) ئەفسەربوو، لەنێویشیاندا (رفعت الحاج سرِی) و (نازم تەبەقچەلی)

---

[1] ئەو ئەفسەرانەی بەشداری جولانەوەكەیان كردو هەولیاندا بۆردومانی وەزارەتی بەرگری و ئەنتێنی رادیۆ بكەن لەئەبوو غرێب كەبریتی بوون لە(١- عقيد الجو عبدالله ناجي. ٢- الرئيس الطيار قاسم العزاوي. ٣-ملازم الطيار احمد مهدي عاشور. ٤-ملازم الطيار فاضل ناصر. (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق، تاليف ليث عبدالحسن الزبيدى، الطبعة الثانية ١٩٨١، ص ٣٧٤.

[2] ئەو شەش كەسەش بریتی بوون لە (١- الرئيس الركن نافع داود. ٢-الرئيس محمد امين عبدالقادر. ٣-الملازم الاول سالم حسين. ٤- ملازم محسن اسماعيل عموري. ٥-ملازم مقفر صالح. ٦-فاچل حمادى شكره. دادگا رۆژی ١٩٥٩/٨/٩ بڕیارەكەی دەركردبوو، (ثورة١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الزبيدى ص ٣٧٤.

کەتاوانبار کرابوون لەتێوەگلانی جوڵانەوەکەی شەوافداو بەشەهیدانی (اُم الطبول)ناسران.

بەم جۆرەش قاسم چوار کەسایەتی سەردەمی پاشایەتی و (٢٧) کەسی بەشدار بووی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی جوڵانەوەکەی شەوافی لەسێدارەدا، واتە کۆی ئەوانەی قاسم بڕیاریلەسێدارە دانی تەصدیق کردن (٣١) کەس بوون.. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێك ناوەند باس لەوە دەکەن کەبەرپرس بووە لەقەسابخانەکانی موصل و کەرکوك، گەر بەهیچ شتێك تاوانبار نەبوبێت، بەوە تاوانبار بووە کەسەرۆکی وڵات بووە..

پاش (٣٣) مانگیش لەتەمەنی دادگاییەکەی مەهداوی ، چیدی مەهداوی هیچ کارێکی بەدەستەوە، نەما تابیکات جگە لە سەرپەرشتی کردنی چاپی وەقایعی دادگایی کردنەکانی..[٣]

لەکۆتایی ئەم باسەدا دەکرێت ئەو پرسیارە بوروژێنین گەر قاسم کەسێکی لێبوردەو دڵ فراوان بووە، بۆچی تەصدیقی ئەو حوکمی لە سێدارەدانانەی کردووە کەجێبەجێکراون؟

پاش ئەوەی کەقاسم (عارفی) دورخستەوە لەدەسەڵات و تاڕادەیەك نەتەوەپەرستەکان پاشەکشەیان کرد، گۆڕەپانەکە چۆڵ بوو بۆ شیوعییەکان تا بەتەواوی دەسەڵاتی خۆیان بەسەر گۆڕەپانەکەدا بسەپێنن، ئەمەش بەدژایەتی کردنی هەموو ئەوانەی کەدژی قاسم بوون، عەبدولکەریم قاسم بڕوای وابوو کە حزبی شیوعی لەپێناوی ئەودا کاردەکەن، ئەوەی لە بیرچووبویەوە کەلەپێناو خودی خۆیان و جێگیر کردنی دەسەڵات و دەست خستنی دەسکەوتی حزبیدا کاردەکەن، لەو پێودانگەشەوە حزبی شیوعی دەستی دایە تاوانبار کردنی ئەم و ئەو

---

[٣] کەناڵی ئاسمانی ئەبو زەبی بەرنامەی (بین الزمنین) سەرەتای ٢٠٠٢ ئامادەو پێشکەش کردنی (احمد مهنا).

بەپیلانگێڕی دژ بەکۆماری تازەدروست بووی عێراق، تاوانباری دەکردن و داوایان دەکرد ئەمانە بدرێنە دادگاکەی مەهداوی، لەو بەرەنجامەشەوە دادگا دادگایی دەکردن و حوکمی توندی لەبەرامبەر دەردەکردن.[1] لەم بارەشەوە( فوئاد عارف )لەیاداشتەکانیدا دەنوسێت: زۆر زیادەڕەویش نیە گەربڵێم قاسم – هەروەك بڕوام وایە– ڕەزامەندی نەدەنواند لەسەر حوکمیسێدارەی هیچ کەسێك لەبەرهۆکاری سیاسی، ئەمەش خوێندنەوەی منە بۆئەم پیاوە پێش شۆڕش و دوای شۆڕش، قاسم کەسێك بوو بڕوای بەدیموکراسی هەبوو، بەڵام لەو ڕۆژانەدا حوکمی سێدارەدانمان دەبینی بەسەر هەندێکدا جێبەجێ کرا کەشۆڕشیان کردبوو و هاوڕێی قاسم بوون، لەڕاستیدا ئەوەندەی من شارەزا بووبووم، قاسم حەزی بەلەسێدارەدانی هیچ کەسێك نەبوو، بەڵام فشاری لەسەر بوو، لەم نێوەشدا حزبی شیوعی ڕۆڵی گەورەیان گێڕا.[2] هەرلەو کاتەشدا بوو کەشیوعییەکان دروشمی (اعدم ! اعدم! جیش والشعب ویاك، لاتقول ماكو وقت، اعدمهم الليله)یان بەرز دەکردەوە.[3]

زۆرێك لەبیرو ڕاکان ئاماژە بەوە دەدەن کەقاسم بێدەنگ ترین کەس بووە کە وەڵامدانەوەی ئەم جۆرە داوایانەی داوەتەوە، بەڵام بمانەوێت یاخود نا، هەرکاریگەری هەبووە لەسەری، چونکە لەو بەرەنجامەوە گەیشتبووە ئەو بڕوایەی گەربێتو هەندێك لەسێدارە نەدات ، ئەوا دەسەڵاتەکەی وەلا دەخرێ، جارێك کە ووتاری دابوو لەسینەما خیامدا، تووڕە دەبێت و سووردەبێتەوەو دەڵێت(( بۆچی داوام لێ دەکەن کە

[1] عارف، فؤاد، مذكرات، الجزء الاول، الطبعة الاولى، ١٩٩٩ مطبعة خبات، تقديم وتعليق د. كمال مظهر احمد ص٢٠٤,٢٠٥.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو هەمان لاپەرە.

[3] عبدالرزاق الصافی کەسەرکردەیەکی شیوعی بووە دەڵێت راستە ئێمە دروشمی ئەوەمان بەرز دەکردەوە کەقاسم با نەیارانی لەسێدارە بدات، بەڵام ئەمە وەبەرهاتووی ئەو کەش و هەوایە بوو کەتێیدا دەژیاین، ئەگینا لەگەڵ حوکمی سێدارەدا نەبووین.( کەناڵی ئاسمانی ئەبوو زەبی) هەمان بەرنامەی ناوبراو.

هەرلەسێدارە بدەم! لەسێدارە ! بۆچی داوای دروست کردنی کارگەیەك ناکەن))[٤]

هۆکارێکی تر کەپێویستە لەیادمان نەچێت، ئەو ململانێی ڕاگەیاندنەبوو کەلەنێوان قاسم و جەمال عەبدولناصرداهەبوو، بەردەوام ڕاگەیاندنەکانی جمال عەبدولناصر تەحەدای قاسمی دەکرد، لەو کاتەدا ڕادێوی (صوت العرب) بەقاسمی دەووت((گەر ترسنۆك نیت لەسێدارەیان بدە! هانی قاسمیان دەدا لەسەر لەسێدارە دان، دیارە ئەمەش عەقڵێکی خێڵەکی بوو، وەگەرنا قاسم دەیتوانی لەسێدارەیان نەدا.))[٥] تەنانەت بارەکە هێندە ئاڵۆز بووبوو کەمەهداوی لەدادگاییەکانیدا هێرش بکاتە سەر جەمال عەبدولناصرو تۆمەتبارەکە بەلایەنگری ناصر تاوانبار بکات، هەرلێرەشەوە هێرشی دەکردە سەرعەبدولناصر و رەخنەی توندی لێدەگرت، دیارە لەبەرامبەر ئەو رەخنەو هێرشانەشدا، ڕۆژنامەو دەزگا راگەیاندنەکانی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو وولاتانی عەرەبی هێرشیان دەکردە سەر ئەم دادگایەو بەساختەو ناشەرعییان لەقەڵەم دەدا.[٦]

---

[٤] عارف، فؤاد، مذكرات، الجزء الاول، الطبعة الاولى، ١٩٩٩ مطبعة خبات، تقديم وتعليق د. كمال مظهر احمد ص٢٠٦.

[٥] حسن العلوی کەناڵی ئاسمانی ئەبو زەبی بەرنامەی (بين الزمنين) سەرەتای ٢٠٠٢ ئامادەو پێشکەش کردنی (احمد مهنا).

[٦] خدوري، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص١١٢.

# جولانەوەکەی شەواف

هەرجۆرە قسەکردنێك لەسەر جولانەوەکەی سەرهەنگ عەبدلوەهاب شەواف لەموصل، ناتوانێت واتای تەواو بدات بەدەستەوە گەر چەند خاڵێك شی نەکەینەوە، بەر لەهەر شتێك سروشت و بیرو بۆچوونی شەواف وپاشان شێوازی پەیوەندی لەگەڵ ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخواز و بەتایبەتیش پەیوەندی لەگەڵ عەبدولکەریم قاسمدا..

عەبدولوەهاب شەواف لەماوەی ژیانی ئەفسەریدا، کەسایەتی‌یەك بووە هەمیشە چاوەڕوانی پلەو پایەی بەرزی کردووە و زۆریش هەوڵی داوە شۆڕشێك بەناوی خۆیەوە لەمێژوودا تۆمار بکات، کەسێك بووە تاڕادەیەکی زۆر پەلەی کردووە لەجێبەجێ‌کردنی بڕیارەکانیدا. کەمتر لێکدانەوەی ووردی کردووە بۆئەوکارانەی ئەنجامی دەدا، کەسایەتی‌یەکی نەتەوەیی تاڕادەیەك سەربەخۆو مەیلی بەلای فیکرەی سیاسی چەپدا بووە، لەکاتی جولانەوەکەشیدا تاڕادەیەکی باش کەوتبووە ژێر کاریگەری بەعسی‌یەکانەوە...

شەواف یەکێك بووە لە ئەندامانی لیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخواز کەژمارەیان ( ١٥) ئەفسەر بووە، هەرچەند ئەم لیژنەیە لەناوخۆیاندا نەیان توانیبوو وەك پێویست ڕێك بکەون لەسەر زۆر مەسەلەی گرنگ و حەساس، تەنانەت لەسەر کاتی شۆڕش و مەسەلەی پێشەوایەتی کردنی .. لەم بوارەشدا شەواف یەکێك بووە لەجەمسەرە ناکۆکەکان و تەنانەت هەوڵیدا لەدەرەوەی کاری ئەفسەرانی ئازادیخواز شۆرش بەرپا بکات، بۆنمونە لەکۆی حەوت هەوڵی کودەتا و شۆڕش دژبەدەستەلاتی پاشایەتی، شەواف لەسێ هەوڵیاندا کاراکتەری‌سەرەکی یان بزوێنەری بووە، بۆنمونە لەگەڵ هەندێك

ئەفسەرداهەوڵیاندابوو لە١٩٥٨/٥/١١شۆڕش بەرپابکەن، بەوپێودانگەی کەلیژنەی بالا چیدی ئومێدی شۆڕش کردنی نەماوە بەهۆی نەبوونی تەنسیق لەنێو ئەندامەکانیدا [1] لەم هەوڵەدا شەواف لەو حەوت بەیانەی کەبڕیار وابووە، پاش سەرکەتنی شۆڕش بڵاوبکرێتەوە ئاماژە بەوە دەدات کەئەنجومەنی وەزیران پێك دێت لەپارتەکانی بەرەی یەکێتی نیشتمانی و خودی شەوافیش دەبێتە سەرۆکی ئەو ئەنجومەنە. [2]

بەدەر لەم هەوڵەی کەسەرکەوتوو نەبوو، لەهەوڵەکانی مانگی ١٩٥٦/١١ و هەوڵی مانگی ١٩٥٦/١٢ دەست پێشخەر بووە و هەوڵی شۆڕشی داوە [3] بەتایبەت ئەو کاتەی کەئەندامی لیژنەی ناوەندی ئەفسەرانی ئازادیخواز بووە، و وەك لاوێکی خوێن گەرم و حەماسی هەوڵی خۆی داوە..

دەتوانم بڵێم هەر لەبەر ئەمەش بووە واتە هەوڵی شۆڕش و کودەتا کەخۆی ئەنجامی بدات و بەناوی خۆیەوە بێت، وای کردبێت کەئاگادار نەکراوەتەوە لەوادەی شۆشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨، لەوە ترساون شەواف ئەو هەلە بقۆزێتەوەو لە بەرژوەندی خۆی سوودی لێ وەربگرێت، کاتێکیش

---

[1] -دیارە لەوکاتەداشەواف ئەندام نەبووە لەلیژنەی بالآدا، بۆیە لیژنەی بالآ لەو هەوڵەی ئاگادار دەکاتەوە کەلە

١١/٥/١٩٥٨ شۆڕش بەرپا دەکات، بەڵام پلانەکە جێ بەجێ نەکرا بەهۆی دواکەوتنی ئەو یەکە سەربازیانەی کەتەکلیف کرابوون بەکارەکەو نەهاتبوونە بەغداد، بەلکو لە نێوان ڕومادییە و فەلوجەدا بڵاوبوونەوە..(

سەرچاوە : ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق، تأليف ليث عبدالحسن الزبيدي، ط٢، بغداد ، ١٩٨١ ص ١٢٦.

[2] - الزبيدي، ليث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانية ، بغداد ١٩٨١ ص١٦٧.

[3] - بۆدرێژەی ئەو هەولانەی شەواف ڕۆڵی سەرەکی تێدا گێڕاوە و ئەوانەی تریش کەپێش شۆڕش ئەنجام دراون و

سەرکەوتوونەبوون سەیری ( هەوڵە سەرنەکەوتووکانی پێش ١٤ی تەموز بکە..)

شۆڕش ڕوویدا شەواف لەڕێگەی رادیۆە هەواڵی بیست و ئەمەش بەتەواوی نیگەران و تووڕەی کرد[1] و تەنانەت یەکێکیش بوو لەهۆکارە پاڵنەرکانی نەیارێتی و هەڵگەڕانەوەی لە دەسەڵاتی قاسم.. بەدەر لەم حاڵەتەش ئاگادار نەکردنەوەی زۆربەی ئەفسەرانی ئازادیخواز لەوادەی شۆڕش، واتای نەبوونی متمانە بووە بەیەکترو دەست کەوتنی هەندێك پۆست پاش شۆڕش کەویستوویانە بۆخۆیانی دەستەبەری بکەن و شەریکە بەشیان نەبێت و تەنها لەنێوان چەند کەسێکی دیاری کراودا بێت، بەم جۆرەش دەبینین گەرشۆڕشێك لەهەناوی ئەم واقیعەدا لەدایك بووبێت، بێگومان ئەگەری تەقینەوە و دەرهاویشتەی سلبی زۆری لێ دەکەوێتەوە، کەجوڵانەوەکەی شەواف لەموصل یەکێکە لەهەرە دەرکەوتووترین دەرهاویشتە سلبیەکانی...

پێویستە بووترێت کەڕوودانی لێك ترازان و دابەش بوون لەناو ڕیزەکانی سوپادا پاش شۆڕش، لەهەرە گەورەترین ئەو مەترسیانە بوو کەقاسم لێی دەترساو لەبەرچاوی گرتبوو،[2] چونکە لەبەرەنجامی چۆنیەتی ئەنجام دانی شۆڕشی ١٤ی تەموزەوە قاسم چاوەڕوانی ئەم جۆرە حاڵەتانەی دەکرد، هەربۆیەش دەبینین بەردەوام لەهەوڵی سەرکوت کردندا بووە، جوڵانەوەکەی شەوافیش دژ بەدەسەڵاتی قاسم لوتکەی ئەو دەرهاویشتە سلبیانە بوو، هەم بۆسەر دەسەڵاتی خودی قاسم و هەم بۆ چارەنوسی

---

[1] -الزبیدی، لیپ عبدالحسن، (پوره ١٤تموز ١٩٥٨ فی العراق) الگبعه الپانیه ، بغداد ١٩٨١ ص١٨١.

[2] - چونکە ڕێژەی ئەو ئەفسەرانەی لەڕیزەکانی ڕێکخستنی ئەفسەرانی ئازادیخوازدا لە(٥%) زیاتر نەبوون ، کەژمارەیان
دەگەیشتە (٢٠٣) ئەفسەر، بۆزانینی ناوی ئەو ئەفسەرانە خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ
کتێبی: ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق، تألیف لیث عبدالحسن الزبیدي، ط٢، بغداد ، ١٩٨١ ص ١١٢ تا ١١٧.

شۆڕشی ١٤ی تەموز [٣] کەلەو کاتەدا بەتەواوی نەکەوتبوویە سەرپێی خۆی و جێگیر نەبووبوو...

لێرەدا هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ئەم جوڵانەوەیە بەسەر چەند تەوەرەیەکدا دابەش دەکەین:

**یەکەم /ئەو هۆکارانەی پەیوەندییان بەقاسم و عارف و ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخوازەوە هەبوو:**

١-ئاگادار نەکردنەوەی لەوادەی شۆڕش، هەرئەم خاڵەش وای کرد لە ڕۆژی دووەمی شۆڕشدا، شەواف پەیوەندی بکات بەهەندێك ئەفسەرەوە بۆ ئەوەی کودەتا بەسەر قاسم و عارفدابکەن.

٢- سەرهەڵدانی نیگەرانی لەسەر دروست نەبوونی ئەنجومەنی سەرکردایەتیشۆڕش، کەدیارە لەم حاڵەتەدا ئەفسەرانی لیژنەی باڵا، پەراوێز دەخران لەدەسەلاتدا.

٣- ئەوەی زیاتر تووڕەو نیگەرانی کردبوو، دانانی بوو وەك فەرماندەی حامییەی

موصل، و لەپۆستی حاکمی سەربازی گشتی لابرا [٤]

٤- دابەش کردنی پۆست و دەسەلاتە گرنگەکان لەنێوان قاسم و عارفدا و دانانی

---

[٣] -خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر – قم ١٩٩٧ ، ص١٤٤.

[٤] -هۆکاری دانەنانی لەپۆستی حاکمی سەربازی گشتی دا دەگەڕێتەوە بۆ عەبدولسەلام عارف کەناکۆکی هەبووە لەگەڵ شەوافدا و ویستوویەتی لەبەغدادی دووربخاتەوە و کردوویەتی یە فەرماندەی حامیەی موصل..

هەندێك كەس لە پۆستە گرنگە كاندا كە لەئاستی ئەو پۆستەدا نەبوون .[1]

٥- هەژمون و دەسەلاتی شیوعیەكان بەسەرعێراقداو دژایەتی كردنی‌نەتەوەپەرستەكان و بەعسی‌یەكان سوكایەتی پێكردنیان.

٦-ناردنی ئەندامانی ڕێكخراوی پشتیوانانی ئاشتی بۆ موصل و گرێدانی

كۆنگرەی ئاشتی لەموصل، ئەمە سەرەڕای هەوڵی زۆری شەواف تاقەناعەت بەقاسم

بكات ئەم كارە لەموصل ڕوونەدات.

**دووەم/ ئەو هۆكارنەی تایبەت بوون بەخودی شەوافەوە:**

١-شەواف كەسێك بوو كەحەزو ویستی دەسەلات دارێتی زاڵ بوو بەسەریدا.[2]

٢-حەز كردن بەدەركەوتن و ئەنجام دانی شۆڕش بەناوی خۆیەوە.

٣-پی‌ی وابوو كەدەبێت ئەو مومارەسەی دەسەلات بكات وەك لە كەسانی تر كەلەو

كاتەدا لەدەسەلاتدا بوون، بەو پێودانگەی كەپێشتر هەوڵی شۆڕشی داوەو لەم

نێوەدا خەباتی بەرچاوی هەبووە.

---

[1] -بۆنمونە احمد محمد یحی كرابوویە وەزیری ناوخۆ كەپلەی سەربازی لەشەواف نزمتر بووە و لەڕێكخراوی ئەفسەرانی

ئازادیخوازیشدا نەبووە پێش شۆڕش.

[2] - الزبيدي، ليث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق) الطبعة الثانية ، بغداد ١٩٨١ ص٣٦٣,٣٦٤.

٤ –زیاتر وەك كەسایەتیەكی بێ ئیلتیزام و هەڵچوو ناسرا بوو، لەم بوارەشدا

كوتلەیەكی سیاسی دروست كرد، پاش ئەوەی تەجمید كرا بە هۆی كارە

لاوەكی‌یەكانیەوە لەپێش شۆڕش.[٣]

٥–بەئەفسەرێكی ڕا ڕا ناسرابوو، لەگەڵ ئەوەی توانای كۆكردنەوەی خەڵكی هەبوو

لە دەوری خۆی[٤].

## چەند هۆكارێكی تر

١–بەعسی یەكان ڕۆڵی باشیان گێڕا لە هاندانی شەواف بۆ دژایەتی كردنی قاسم

كە دژایەتی پرۆژەی یەكێتی عەرەبی نێوان كۆماری عەربی یەكگرتوو وعێراقی

دەكرد.

٢–موصل شارێكی نەتەوەیی موحافیز كاربوو، چالاكانە بەشداری ڕێكخراوی ئەفسەرانی ئازادیخوازیان كردبوو، لەسەردەمی شۆڕشدا پشتیوان و هاوسۆزی شۆڕش بوون، بەڵام ئەو ئەفسەرانەی موصلی بوون و لە ڕێكخراوی ئەفسەرانی ئازادیخوازدا بوون، پێیان وابوو كەپەراوێز خراون و ڕۆڵیان پێنەدراوە، لەهەمان كاتدا خەڵكی موصل بڕوایان وابوو لە سەردەمی دەسەڵاتی پاشایەتی‌دا پەراوێز خراون و لەم كاتەشدا كەس

---

[٣]- فرحان، اللواء الركن عبدالكريم ، ثورة ١٤تموز فی العراق، الجزء الاول، ص٩١,٩٠ ، مؤسسة الكتاب العربی للدراسات والترجمة والنشر، باريس، ١٩٨٦

[٤] رشيد د.عبدالوهاب حميد، العراق المعاصر، دار المدى للثقافة والنشر، سنة ٢٠٠٢ ص١٤٥.

ئاوڕیـــان لێ ناداتـــەوە و هـــەل و مـــەرجی ژیانیـــان زۆر خراپـــە، دەکرێـــت ووتارەکـانی عەبدولسەلام عـارفیش کاریگـەری خـۆی هـەبووبێت لەسـەریان، بەتایبەت ئەوکاتانەی جەولەی شارەکانی دەکرد و هەندێك جار ڕەخنەشـی لەدەســەڵاتی قاســم دەگــرت، بۆنمونــە جارێــك لەووتارێکیــدا لەموصــل بەگاڵتەجاڕییـەوە ووتبـووی: دەسـەڵاتی مەرکـەزی جیـاوازی ناکـات لـەنێوان گـەڕەکی ( بـاب البـیض) (کەگـەڕەکێکی هەژارنشـینی موصـل بـووە،) لەگـەڵ گـەڕەکی( بـاب السـرایا)( کەگـەڕەکێکی دەوڵەمەنـدی شـاری موصـل بـووە)، دیـارە (عـارف) مەبەسـتی گـوێ نـە دانـی حکومـەت بـووە بـە شـاری موصـل لەڕووی خزمەت گوزارییەوە.. هەروەها ئەو ئەفسەرانەیخەڵکی موسڵ بوون و لـەرێکخراوی ئەفسـەرانی ئـازادیخوازدا بـوون ،هەمیشـە سـەربەخۆبوون و نەکەوتبوونە ژێر کاریگەری دەسەڵاتی مەرکەزییەوە[1]

٣-بـەهۆی هەڵکەوتـەی شـوێنی جوگرافیموصـل و نزیکـی لەسـوریاوە کەلەو کاتەدا لەچوارچێوەی کۆماری عەرەبی یـەکگرتودا بـوو، دیـارە موصـل لەبـــەر نزیکـــی لەســـوریاوە زیـــاتر ســـاز بـــوو بـــۆ ئـــەنجام دانـــی جوڵانەوکـە.سـەرەڕای ئەمـەش لێـرەدا نابێـت ڕۆڵـی عەبدولناصـر بـۆ سەرخستنی جوڵانەوەکە لەیاد بکەین.،

جگـە لـەم هۆکارانـە، بـوونی ئەمریکاش لەپشت مەسـەلەکەوە هۆکـارێکی ترە کەلەدوایدا ئاماژەی پێ دەکەین و خۆی لـە خۆیـدا کاریگـەری بەرچاوی هەبووە لەسەر جوڵانەوەکە وکات و شێوازی بەڕێوەبردنی جوڵانەوەکە..

ئەم هۆکارانە ڕۆڵیان گێڕا لـە سـازاندنی زەمینـەی لـەبار بۆ جوڵانەوەکـە کەزۆرشـتی خسـتە ژێـر پرسـیارەوە ، پێکـەوە ژیـان، فرەیـی، لێبـوردەیی،

---

[1] -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.( ١٤٤,١٤٥)

پەیوەندی نێو دەوڵەتی و دەستێوەردانی وولاتان، شەڕی بەرژوەندییەکان لەنێوان وولاتانی زلهێزدا، شەڕی بەرتەسك کردنەوەی دەسەلاتی بەرامبەرو فراوانکردنی هەژمونی خود.. بۆزیاتر هەنگاو نان لەگەڵ ڕەوتی رووداوەکاندا لەسەر سێ ڕەهەند باس لەزەمینە سازی جولانەوەکە دەکەین:

***یەکەم/لەسەر ئاستی ناوخۆ***

پاش دورخستنەوەی عارف لەدەسەلات و زیندانی کردنی لەلایەن قاسمەوە، پێشەوایەتی کردنی (یەکگرتنی خێرای نێوان عێراق و کۆماری عەرەبی یەکگرتوو)، کەوتە دەستی (رفعت الحاج سری) کەلەوکاتەدا سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگری سەربازیی بوو[2] نوسینگەکەی لەتەنیشت نوسینگەکەی قاسمدا بووە لەوەزارەتی بەرگری، بەو جۆرەش ڕێکەوتنێك دروست دەبێت لەنێوان هەریەك لە (سڕی) و (نازم تەبەقچەلی)[3] کەتەبەقچەلی هەستێت بەشۆڕشێکی سەربازی کەلەوکاتەدا سەرکردەی تیپی دوو بووە لەناوچەی کەرکوك ، (سڕی) یش بەهاوکاری ئەفسەرانی یەکێتی خواز هەستن بە ئابلۆقەدانی قاسم لەنوسینگەکەیدا... پێویستە بووترێت پاش سەرکەوتنی شۆڕش سێ ئاراستە لەنێو دەسەلاتی سەربازیدا

[2] – رفعت الحاج سڕی، کەسایەتی‌یەکی موتەدەین بووەو و خاوەنی بیروباوەڕێکی ئیسلامیی بەهێزبووە، بنەماڵەکەیان خادم و کلیلداری مزگەوتی (جامعة امام اعظم) بوون و سەرپەرشتیان کردووە، یەکێك بوون لەبنەماڵە شەریفەکانی بەغداد و ڕۆحی دینداری زاڵ بووە بەسەریدا، لەگەڵ ئەوەی خاوەنی هەستێکی نەتەوەیی عەرەبی بەرچاوبووە..

[3] – بنەماڵەی تەبەقچەلی لەبنەڕەتدا دەگەڕێنەوە بۆ(حەما) لەسوریا و پێش زیاتر لە ١٦٠ ساڵ هاتونەتە شاری بەغداد ، باوباپیرانی بەئاراستەیەکی سەلەفی ناسراون و قوتابخانەی (تەبەقچەلی) یان هەبووە لەبەغداد کەئاراستەی سەلەفی هەبووە، لەوەسێتنامەکەیدا کاتێك کەلەسێدارە دەدرێت تەبەقچەلی ئامۆژگاری منالەکانی دەکات تادەست بەقورئانەوە بگرن و کاری پێبکەن، لەگەڵ ئەمەشدا خاوەنی هەستێکی نەتەوەیی بەرچاو بووە.. شایانی باسە هەریەك لە (سڕی) و (تەبەقچەلی) لە٢٠/٩/١٩٥٩ لەسێدارە دران لەگەڵ ژمارەیەکی تری ئەفسەردا، بەتاوانی تێوەگلان لەجولانەوەکەی شەوافدا..

دروست بوو، هەندێکیان بەسەرکردەیی عەبدول کریم قاسم و هەندێکی تریان بەسەرکردەیی عەبدولسەلام عارف، لەم نێوەشدا هەریەك لەسرِی و تەبەقچەلی لەگەڵ هیچ یەك لەو باڵانەدا نەبوون وخۆیان بەخاوەنی ڕاستەقینەی فیکرەی دامەزراندنی ئەفسەرانی ئازادیخواز دەزانی (بەتایبەت سرِی)[١] و پێیان وابوو وادەی شۆڕشیان لێدزراوەو لەنێوان قاسم و عارفدا ئەمان پەراوێزخراون، هەربۆیەش دەیان ویست مافی خۆیان وەرگرنەوە و کەوتنە هەوڵی روخاندنی دەسەڵاتی قاسم .. هەرلەو سەروبەندەشدا عەقید عەبدلوەهاب شەواف پەیوەندی دەکات بەم کۆمەڵەیەوە لەبەرواری ١٩٥٩/٣/١ و لەسەرئەوەش رازی دەبێت کەئەو شۆڕش لەموصلەوە ڕابگەیەنێت، بەو پێودانگەی ئەوهێزەی لەژێردەستی تەبەقچەلیدایە کەسانی زۆری تێدایە کە دژ بە یەکێتی عەرەبی کشتگیرن.. بەم جۆرەش ئەرکی دەستگیرکردنی قاسم بەجێهێڵرا بۆ (سرِی) و هەندێك لەکەسایەتی‌یە سیاسی‌یەکانیش بەڵێنی‌یان دا کەلەبەغداد و لەکاتی ڕاگەیاندنی شۆڕشدا ڕاپەڕین ئەنجام بدەن...[٢]

---

[١] – اطراف من التاريخ السياسى العراق . بحث لم تنشر، للمفكر والمحامى العراقي محمد احمد الراشد.

[٢] – ليث عبدالحسن الزبيدى لەکتێبی (ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق ) ل٣٦٤,٣٦٥ دەنوسێت، سەرەتا بڕیار وابووە کەزعیم (نازم تەبەقچەلی) یاخی بوونی سەربازی لەناوچەکانی ژێردەستەڵاتیدا (کوردستان) ڕابگەیەنێت، و (شەواف) یش لەموصل پشتگیری لێ بکات، پاش ئەوە ئەو یەکەسەربازییانەی کەلایەنگری شۆڕش بوون دەست بدەنە جوڵەکردن، و دەست بگرن بەسەرسەربازگەی (الوشاویش) و سەربازگەی ئەندازیاریی(الرستمیە) و حامیەی وەزارەتی بەرگری، پاشان هەندێك پێکهێنەرەکانی ئەم جوڵانەوەیە هەستن بەدەستگیرکردنی قاسم و لایەنگرانی ، ئیتر ئایا لەنوسینگەکەی خۆیدا بێت لە وەزارەتی بەرگری یان لەرێگەی دەرچوونی دابێت، لەهەمان کاتدا فەوجێکی سەربەجوڵانەوەکە هەستن بەگرتنی بارەگای پەخشی ڕادیۆیی، سەرەڕای یەکەکانی جێگیر لە هەولێر و عەقرە و موسەیب، ئەوا لەسەعات (٧) سەرلەبەیانی شۆڕش، جوڵەدەکەن، پاش ئەوەی شۆڕش لەرادیۆی موصلەوە ڕاگەیەنرا ،هەوەرها ئەم ئەفسەرانە پەیوەندییان بەپێشەوای پارتە سیاسی‌یەکانەوە کردبوو، ئەوانیش بڕیاریان دابوو لەکاتی شۆڕشدا ڕاپەڕین ئەنجام بدەن.

ئەو هۆكارانەی مەسەلەكەی گەیاندە ئاستی تەقینەوە، ڕەوانەكردنی پیشتیوانانی ئاشتی بوو بۆ موصل و گرتنی كۆنگرەی پشتیوانی ئاشتی لەو شارەدا، لەم نێوەشدا شەمەندەفەرەكانی ئاشتی ژمارەیەكی زۆر لەئەندامانی ئەم ڕێكخراوەیان لەزۆربەی شارەكانی عێراقەوە گواستەوە بۆموصل تاله ١٩٥٩/٣/٦ كۆنگرەكە ببەسترێت [٣] بەلای ئەفسەرانی یەكێتی خوازەوە بەستنی ئەم كۆنگرەیە، بەسەركەوتنێك دەهاتە ژماردن، بۆیە بەردەوام چاودێری هەنگاوەكانی كۆنگرەكەیان دەكرد.. [٤] لەسەرئاستی زەمینە سازی هەنگاوەناوخۆییەكان بارەكە بەم جۆرە گوزەراو بەدەر لەپلان و نەخشەی (سری )و (تەبەقچەلی)، شەواف لەلایەن خۆیەوە پلانی دیاری كراوی خۆی هەبوو تا كاری پێبكات، بەئەنجام دانی چەندین سەردان و ناردنی نوێنەرو نامەو پەیوەندی تەلەفۆنی لەنێوان بغداد و كەركوك و موصلدا، زەمینەی تەقینەوەی بارەكە ڕەخسا..

[٣]-شەواف سەردانێكی بەغداد دەكات كەلە١٧/٢ تا٢٨/٢/١٩٥٩ درێژەی دەبێت ، لەپێناو قەناعەت كردن بەقاسم بۆهەڵوەشاندنەوەی كۆنگرەی ئاشتی موصل، وپاش چەندین كۆبونەوە لەگەڵ قاسمدا سەركەوتوو نەبوو لەم كارەیدا، هەرلەو بەرەنجامەشەوە دەكەوێتە هەوڵی دروست كردنی هاودەنگی لەگەڵ هەندێك لەئەفسەرانی بەغدادا، تاپشتیوانی لێبكەن لەكاتی هەڵایسانی شۆڕشی دا، لەنێویشیاندا (عقید الركن عبدالرحمن عبدالستار) فەرماندەی لیوای (٨) لە حەبانییە، و(عقید الركن خالد المدفعي) فەرماندەی فەوجی لیوای ١٩ (سەربازگەی ڕەشید) و موقەدەم ركن سعدون حسین فەرماندەی فەوجی (٢) ی‌لیوای (٢٠) بەرپرسی پاراستنی رادیۆ، و (مقدم الركن عارف عبدالرزاق) فەرماندەی بنكەی حەبانییە، (رائد خزعل السعدى) فەرماندەی كەتیبەی تانكەكان و ... لەبەردەم ئەمانەدا شەواف سوێندی خواردبوو گەرپێتوو كۆنگرەكە ببەسترێت، كارێك دەكات گۆمی خوێن بگاتە ئەژنۆ! (سەرچاوە: الصراعات بين عبدالكريم قاسم والشيوعيين ورفعت الحاج سرى والقوميين) نوسینی عقیدالمتقاعد خليل ابراهيم حسين، بەرگی دووەم ، ١٩٨٨ بغداد ل٢٦تا٦٠..

[٤]-خدوری، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص١٤٤.

واپێدەچێت بزوتنەوەی نەتەوایەتی بەسەرجەم دەزگا سیاسی و ئیعلامییەکانییەوە ، پێش وەخت ڕەسمی ئەو کەسایەتی‌یەی کێشابێت کەوەك سەرکردە لەعێراق دەردەکەوێت، جەمال عەبدولناصر دەیویست ئەم نەخشەیە بەپێی خواستی‌خۆی بگوزرێ، پێش شۆڕشی ١٤ی‌تەموزو تەنانەت دوای شۆڕشیش.. بۆیە سوربوو لەسەرئەوەی کەدەبێت ئەو ڕۆڵەیە یەکێك بێت لە ڕۆڵەکانی خۆی، چونکە عەبدولناصر لەدژایەتی کردنی دەسەلاتی پاشایەتی‌دا لەعێراق پشکی بەرچاوی هەبوو، بەتایبەت لەبواری فەراهەم هێنانی زهنیەتی ئامادەگی شۆڕش.. لەهەمان کاتدا عەبدولناصر سەروەتێکی زۆری میللەتی هەژاری میسری خەرج کرد لەسەرخستنی ئەم شۆڕشەدا، سەروەتێك کەدەتوانرا گەورەترین کۆمپانیای پیشەسازی پێ‌دروست بکرێت، هەرچەند لەدوایدا شۆڕش بێ زانیاری عەبدولناصر ئەنجام درا..[1]

بەدەر لەم حاڵەتە کۆمەڵێك لەفسەرانی لیژنەی باڵاو بەخودی قاسمیشەوە، دژی هەرجۆرە یارمەتی و هاوکارییەکی ڕاستەوخۆی عەبدولناصر بوون، و دەیان ویست شۆڕشێك ئەنجام بدەن بەدووربێت لەهەرجۆرە هەژمونێکی دەرەکی.. لەگەڵ ئەوەی ژمارەیەکیش لەئەفسەرە نەتەوەپەرستەکان خۆیان بەقەرزاری عەبدولناصر دەزانی لەسەرخستنی شۆڕشدا، ئەمە مایەی نیگەرانی بوو کەسەرانی شۆڕش لەعێراق و بەتایبەت دەسەلاتی یەکەم نەك هێندەی خۆی بەمنەتباری عەبدولناصر بزانێت، و لەسەر هێل ونەخشەی سیاسی ئەو بڕوات، بەڵکو کەوتە دژایەتی کردنیشی

---

[1] -العلوي، حسن (عبدالكريم قاسم رؤية بعد العشرين) منشورات دار الزوراء، لندن ١٩٨٣، ص١٠٦.

و سەرکوتی ئەوانەشی دەکرد لەسەر سیاسەتەکانی عەبدولناصر دەڕۆن، هەربۆیەش چاوەڕوانی دەکرا عەبدولناصر گورزی خۆی لەدەسەلاتی قاسم لەعێراقدا بوەشێنێ بەهەر شێوەیەك بووبێت..

پاش ئەوەی ناکۆکی کەوتەنێوان قاسم و عارف لەسەرمەسەلەی یەکێتی عەرەبی [۲] ئەم ناکۆکی یە هەربەخێرایی ناوەندی هەریەك لەقاسم و عەبدولناصریشی گرتەوە، چونکە سیاسەتەکانی قاسم مایەی ڕەزامەندی عەبدولناصر نەبوو، لێرەشەوە دژایەتی کردنی یەکتر لە ڕێی ڕاگەیاندنەوە دەستی پێ کرد، لەگەڵ گرژی زیاتری نێوان قاسم و عارفدا ئەم هێرشانەش ڕووە زیادبوون بوو، بەلام لەسەرەتاوە هیچ یەك لەکەسایەتی یەکانی یەکەمی دەسەلاتی نەگرتەوە، هێرشی میسرییەکان دژی شیوعیەکانی عێراق بوو ، (محمد حسنین هیکل) لەنامەیەکی کراوەیدا بۆقاسم سەرسوڕمانی خۆی نیشان دابوو لەسیاسەتی پشت گوێخستنی کێشەی عەرەبی و وازهێنان لەڕۆژئاوا بۆشیوعیەت کەچی یان بوێت ئەنجامی بدەن، هەڵمەتی عێراقیش دژ بەمیسر زیاتر لەسەرتەوەرەی نەبوونی دیموکراسی و ئەوەی ناوی لێنراوە بەنەتەوایەتی ساختە لەمیسردا خۆی دەبینیەوە.. لەمانگی شوباتدا هەریەك لەعێراق و میسر هێرشەکانیان دژبەیەکتر سوك کرد، بەلام ئەمە ئەو هێوربوونەوەیە بوو بەهێوربونەوەی پێش گەردەلول، چونکە هەردوو

---

[۲] - دەکرێت ناکۆکی نێوان قاسم وعارف لەم خالانەدا کورت بکەینەوە هەروەك بەرێز( عقیدالمتقاعد عباس قادر علی) لەوەلامی پرسیارێکمدا لەم بارەیەوە ئاماژەی پێداوە و دەلێت: ١-ململانێ و حەزی دەسەلات. ٢- ناکۆکی یان لەسەر لەناوبردنی بنەمالەی پاشایەتی کەئەنجام درا. قاسم نەیاری ئەو کوشتنانە بووە، ٣- ئیجراکردنی هەندێك دامەزرانی زۆر گرنگ و دورخستنەوەی عقید عبدالرحمن عارف و لیوای زرێپۆشی شەشەم و کەتیبەی زرێپۆشەکان کەئەو سەرۆکایەتی دەکردن بۆ(ئێچ پری) ٤-کۆبونەوەی عارف لەگەڵ عەبدولناصر و باس کردن لەمەسەلەی یەکگرتنی خێرای نێوان عێراق و کۆماری عەرەبی یەکگرتوو...

حکومەتی قاسم و عەبدولناصر زانیارییان لەسەر کودەتایەك هەبوو کە دەگونجێت لەعێراقدا ڕووبدات..[1]

بۆڕێکخستنی شێوازی پەیوەندی سەرکردەکانی جولانەوەکە و حکومەتی کۆماری عەربی یەکگرتوو، (عبدالمجید فرید)ی مولحەقی سەربازی کاروبارەکانی ڕێکدەخست، بۆئەم مەبەستەش پەیوەندی کردبوو بەسەرجەم لایەنەکانی جولانەوەکەوە، پاشان داواو خواستەکانی گەیاندبوونە گەورە بەرپرسانی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو، بەتایبەت (عبدالحلیم سراج) کەوەزیری ناوخۆی هەرێمی باکووری کۆماری عەرەبی یەکگرتووبوو، و ئەوەشی زیاتر پاڵنەری مەسەلەکە بوو ئاهەنگەکانی یادی یەکگرتنی میسرو سوریا بوو لەکۆماریعەرەبی یەکگرتوودا، هەربۆیەش جەمال عەبدولناصر بڕیاری مانەوە دەدات لەدیمەشق تازیاتر ئاگاداری ڕەوتی گۆڕانکارییەکان بێت، دیارە لەوکاتەدا دەبێت ئاگاداری زەمەنی جولانەوەکە بوبێت.. لەبەرەنجامی هاتوچۆی نێوان نوێنەری کۆماری عەرەبی یەکگرتوو لەنێوان بەرپرسانی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو و، سەرانی جولانەوەکە، عەبدولناصر لەسەربەخشینی ئەم یارمەتییانە ڕازی دەبێت:

١-ناردنی ئێستگەیەکی پەخش بۆڕاگەیاندنی شۆڕش.

٢-پێدانی چەك و تەقەمەنی پێویست.

٣-ناردنی کەتیبەیەك لەهێزی (مغاویر) لەگەڵ وەجبەیەك فڕۆکەی جەنگی جۆری (میگ) گەربارەکە پێویستی کرد، بۆسەرخستنی شۆڕشەکە..[2]

---

[1] کەناڵی ئاسمانی ئەبو زەبی بەرنامەی (بین الزمنین) سەرەتای ٢٠٠٢ ئامادەو پێشکەش کردنی (احمد مهنا).

دەربـارەی پەیوەنـدی نێـوان جـەمال عەبدولناصـر و سـەرکردەکانی جولانەوەکـەی شـەواف (صلاح نصر) ی بەڕێوەبەری دەزگـای موخابەراتی میسـر لەسـەردەمی جـەمال عەبدولناصـردا دەڵێـت: (عبـدالحلیم سـەراجی وەزیـری نـاوخۆی هـەرێمی بـاکووری کۆمـاری عـەرەبی یـەکگرتوو، زۆری کردبوو لە عەبدولناصر بەڕێکخستنی کودەتایەك دژ بەعەبدولکەریم قاسم و قەناعەتی پێکردبوو کە گەربێتوو ئەم کارە نەکرێت ، ئەوا عێراق دەکەوێتـە چنگی شیوعییەکانەوە و هـیچ بوارێکی تـر نامێنێتـەوە.. عەبدولناصـریش لەسـەر ئـەم پێشـنیارە ڕازی دەبێـت و پەیوەنـدی دەکـات بـە عەقیـد عەبدولوەهاب شەوافەوە کەسـەرکردەی لیوای موصلی باکوری عێراق بـوو، شـەوافیش ئامادەیی تـەواوی نیشـان دابـوو بـۆ ئـەنجام دانـی کودەتایـەکی سـەربازی بەسـەرحوکمی قاسمـدا، شـەواف پێویسـتی بـە ئێسـتگەیەکی رادیـۆیی هـەبوو کەلەمیسـرەوە بـۆی ڕەوانـە بکرێـت، لـەم بوارەشـدا سـەراج هەسـتابوو بەناردنی بەکرێگیراو لە( دێـر الـزور) کەپڕچەك کرابوون بەکـەل وپەلی سەربازی و زانیاری..)[3]

تاسـەردەمی ڕوودانـی جولانەوەکـە، ڕێکـەوتن ئـەنجام درا لـەنێوان ئەفسـەرە نەتەوەپەرسـتەکان و بەرپرسـانی کۆمـاری عـەرەبی یـەکگرتوو، بـەم جـۆرە زەمینـەی دەرەکـیش ڕەخسـا بۆجولانەوەکـە.، تائـەوەی مـابوو جولانەوەکە ڕووبدات..

---

[2] – حسین، العمید المتقاعد خلیل ابراهیم (الصراعات بین عبدالکریم قاسم والشیوعیین ورفعت الحاج سری والقومیین) الجزء الثانی، الطبعة الاولی، ١٩٨٨ بغداد، ص ٥١,٣٧,٣٥. هـەروەها کـەناڵی ئاسمانی ئـەبوزەبی بەرنامەی (بین الزمنین)

[3] -کەناڵی ئاسمانی ئەبو زەبی بەرنامەی (بین الزمنین) سەرەتای ٢٠٠٢ ئامادەو پێشکەش کردنی (احمد مهنا).

پاش کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی دووەم، و دەست پێکردنی جەنگی ساردی نێوان ئەمریکاو یەکێتی سۆڤییەت، بەردەوام حکومەتی ئەمریکا هەوڵیدەدا، سنوری قەڵەمڕەوی سیاسی و ئابووری خۆی فراوان بکات و چەندین هەوڵیشی لەم نێوەدا خست گەڕ، بێگومان هەڵایسانی شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨یش لەعێراق، مایەی نیگەرانی و ترسی ئەمریکابوو، چونکە کارەکە شتێکی چاوەڕوان نەکراوبوو لەوئان ساتەدا و بەوخێراییە شۆڕش ڕوویدات، بەدەر لەوەی ئەمریکا خەریك بوو سەرکەوتوو دەبوو لەوەی عێراق لەسەنتەری هەژمونی بەریتانی بەرەو سەنتەری هەژموونی خۆی بخاتەڕێ، بەتایبەت لەساتە نزیکەکانی پێش هەڵایسانی شۆڕش، چونکە ئەمریکا پلانی ئەوەی داڕشتبوو تالە عێراقەوە پەرە بەهەژمونی خۆی بدات و لەم نێوەشدا پەیمانی بەغداد بەشێك بوو لەو هەولانەی ئەمریکا، ئەمەش بەدەر لە خودی عێراق وەك وڵاتێکی دەوڵەمەند و خاوەن نەوتی ناوچەکە، هەربۆیەش (ئایزەنهاوەر)ی سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کاتێك هەواڵی شۆڕشی ١٤ی تەموزی پێگەیشت، وەك گوزارشتێك لەبارەکە ڕایگەیان: ئەمەئەو وڵاتەبوو کەئێمە بەتەواوی متمانەمان کردبووە سەری تاوەك قەلایەك بۆگەشەکردنمان بەکاری بهێنین لەناوچەکەدا..

هەرلەبەر مەترسی ماکەکانی شۆڕشی عێراق بوو کە کەشتیگەلی شەشەمی ئەمریکی هەستا بە پرۆسەی (دابەزاندنی سەربازی) بۆکەنارەکانی بەیروت لە١٥تەموزی ١٩٥٨و( لەکاتێکدا نوری سەعید بەڵێنی بە (کمیل شمعون) ی سەرۆکی ئەوکاتەی لوبنان دابوو کەعێراق هەستێ بەم کارە،

کەچی لەم کاتەدا بارەکە پێچەوانە بووبوویەوە )بەریتانیاش هێزێکی پەڕەشوتەوانیلەئوردون دابەزاند.[1] ئەم دابەزاندنە سەربازییەش ناسرا بەدابەزاندنی ئەنگلۆ- ئەمریکی، بەلام نەیان توانی بەر بەبەرەو پێش چوونی دامەزراندنی زیاتری هەلو مەرجی سیاسی و سەربازی عێراق بگرن، هەربۆیەش ئەمریکا هەولیدا دژە کودەتایەك ڕێك بخات، و لەژێر پەردەی (ناصریدا) بەڕێوەبچێ.. هەرچەند حوکمی ناصری ڕژێمێکی بەکرێگیراوی ئەمریکی نەبوو، باکاتێك هاتە سەردەسەلات لەیۆلیۆی ١٩٥٢ پشتگیری ئەمریکای هەبوبێت، ئەمەش بەپێی بانگەشەی هەندێك بەرپرسی موخابەراتی ئەمریکی(CIA).. ئەمریکا بەجۆرێك دەیڕوانییە پرۆژەی یەکێتی عەرەبی کەمیسر هەولی بۆدەدا، پرۆژەیەکی جدی و سەرکەوتوو نیە، چونکە پێویستی بەزۆربنەما هەبوو کەتێیدا نەبوو، بۆیە ئەمریکا ترسی جدی لەتەرحی ئەم مەسەلەو هەولەکانی میسر نەبوو بۆی، لەهەمان کاتیشدا دەکرێت لەگەڵ هەندێك پرۆژەی ئەمریکی یەکی گرتبێتەوە لەناوچەکەدا بۆلێدانی بزووتنەوە چەپ و شۆڕشگێڕییەکانی حساب بۆکراو لەسەر هەژمونی سۆڤییەتی، بەم پێودانگەش واشنتۆن خۆشحاڵ بوو بە یەکێتی نێوان میسرو سوریا.[2]

بەلام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو کەهەلویستی موحافیزکارانەی ئەمریکا بەرامبەر بزووتنەوەی ناصری وهەربەخێرایی پاش شۆڕشی ١٤ی تەموز گۆڕاو سیاسەتی هەماهەنگی بوویە کۆلەکەی سیاسەتی ئەمریکی لەڕوخاندنی دەستەلاتی قاسمدا، هەرچەند نەتەوەپەرست و ناصرییەکان

---

[1] -کەنالی ئاسمانی ئەبو زەبی بەرنامەی (بین الزمنین) سەرەتای ٢٠٠٢ ئامادەو پێشکەش کردنی (احمد مهنا).

[2] – نجم، محمود، المقایضة بین برلین وبغداد الخلفیة التأریخیة لحرب لم تنته بعد، منشورات الغد، ص٢٠٨.

نکۆڵی ئەم ڕاستی‌یە دەکەن، بەڵام (هیکل) لەم دواییانەدا، (دۆکیۆمێنتێکی نهێنی گرنگ، کەبەڕێوەبەری CIA ئامادەی کردبوو پاش چەند ڕۆژێك لە شۆڕشی ١٤ی تەموز و لە١٩٥٨/٨/٢ بڵاوکرابووەوە کەڕاستی ئەم مەسەلە دەخاتە ڕوو)بڵاوکردەوە [١]ڕاڤەی ئەوئاراستەیە دەکات کەوای کردووە سیاسەتی ئەمریکی بگاتە ئاستی لێك گەیشتن لەگەڵ قاهیرەدا.. بەمەبەستی سەرخستنی‌هەوڵەکەی شەواف و دوورخستنەوەی عێراق لەناوچەی هەژموونی سۆڤییەتی و بەریتانی، بۆیە پرۆسەکە زۆر بەخێرایی هەنگاوی نا و بەچاودێری ڕاستەو خۆی عەبدولناصر، کەبەرپرسیارێتی پەیوەندی کردنی ڕاستەوخۆی خستبووە ئەستۆی (عبدالحلیم سەراج) وعقید (عبدالمجید فرید) مولحەقی سەربازی کۆماری عەربی یەکگرتوو لەبەغداد. [٢]

هەرچەند لەوکاتەدا ئەو پەلەکردنە هەبوو، بەڵام هەندێك لە ئەفسەرە نەتەوەپەرستەکان، رازی نەبوون لەسەرپەلەکردن لە جوڵانەوە، بەوپێودانگەی کەلەو کاتەدا حزبی شیوعی هەژمونیان هەبووە و مەترسی ئەوەیان هەبووە بارەکە لەبەرژەوەندی ئەوان بشکێتەوە، بەڵام شەواف زۆر سووربوو لەسەر شۆڕش و پەلەی کردنی.. [٣]لەلایەکی دیکەشەوە دەکرێت ئەو پەلەکردنەی عەبدولناصریش بۆئەوە بگەڕێتەوە کەتیشکی سەوزی لەواشنتۆنەوە وەرگرتبێت، بەپێویستی وەڵامدانەوە بەسەردانەکەی (ماکمیلانی) سەرۆك وەزیرانی ئەوکاتەی بەریتانیا بۆ مۆسکۆ [٤] و دەربڕینی

---

١ -نجم، محمود، المقايضة بين برلين وبغداد الخلفية التأريخية لحرب لم تنته بعد، منشورات الغد، ص٢٠٨.
٢ -حسين، خليل ابراهيم، (ثورة الشواف) ج٤ ص١٥٩.
٣- حسين، خليل ابراهيم، (ثورة الشواف) ج٢ ص١٤.
٤ -نجم، محمود، المقايضة بين برلين وبغداد الخلفية التأريخية لحرب لم تنته بعد، منشورات الغد، ص٢١٢.

نیگـــەرانی لەدەســـتێوەردانی لەناوچـــەی ژێرهـــەژموونی هەردوولایانـــدا..
پێویستە بووترێت ئەم کودەتا یە نهێنییەك بوو هەتا هێندەی ڕۆژنامەی (تایمز) لەژمارەی ٨ی شوباتی ١٩٥٩ ئاماژەی پێدەکات و دەڵێت: هەندێك هەواڵ باس لەکودەتایەك دەکەن کەلەلایەن ژمارەیەك ناصرییەوە ڕێك دەخرێت لەناوسوپای عێراقیداو لە بەهاری ئەم ساڵدا..

لەگەڵ ئەوەی کەهەریەك لە (رفعت الحاج سری )و (نازم تەبەقچەلی) لەگەڵ ئەنجام دانی جولانەوەکەدا نەبوون لەوکاتەدا و بەو پەلەکردنە، بەلام لەدوایدا ئەوە بەتەواوی ڕوون بووە کەخودی عەبدولناصر لەپشتی دانانی کاتی جولانەوەکەوە بووە و سەرجەم ئەو پەیوەندی و ناردنی پێداویستییەی گەیەنرایە موصل، هەمووی لەو کاتەدا بوو کە(تیتۆ) بەسەردانێکی ڕەسمی هاتبووە کۆماری عەرەبی یەکگرتوو لە(حەلەب و لازیقیە) دابووە، هەروەك چۆن ئەوەش بەدیاردەکەوێت کەژمارەیەك لەئەفسەرەکان هەماهەنگییان نەبووە لەگەڵ پلانەکەدا[5] ودەکرێت شەواف و ئەوسەرکردانەی لێوەی نزیك بوون لەلایەن عەبدولناصرەوە لەسەرخستنی جولانەوەکە دڵنیا کرابنەوە بەهۆی لاوازی دەسەلاتی سیاسی و سەربازی قاسم و هەروەها پشتگیری کۆماری عەرەبی یەکگرتوو، بەهاوکاری ئەمریکا، تاچیدی لەدواییدا پاش سەرکەوتنی شۆڕش هێندە سەرکردەی سەربازی زۆرنەبن خۆیان بکەنە خاوەنی جولانەوەکەو لەم نێوەشدا هەم ڕۆڵی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو ئامانجەکانی وون ببێت و هەم ململانێی دەسەلاتیش سەرهەڵبدا، هەرچەند زۆرێك پێیان وایە ئەنجام دانی شۆڕشی ١٤ی تەموز

---

٥- نجم، محمود، المقایضة بین برلین وبغداد الخلفیة التأریخیة لحرب لم تنته بعد، منشورات الغد، ص٢١٤.

بەو جۆرەی کەڕوویدا زیاتر بە مەبەستی دەسەڵات گرتن بووە بەسەر حوکمدا و کورت کردنەوەی دەسەڵات بووە لەچەند کەسێکدا..

لە سەرجەم ئەوانەی باسکران بەدەر دەکەوێت کەجوڵانەوەکەی شەواف لەدەرەوە ڕێنمایی کراوەو بەڕێگەی سنوری سوریادا پێداویستی سەربازی و لۆجستی سەربازی بۆهاتووە، هەروەها وڵاتانی پەیمانی بەغدادیش ، ئەمانیش بەهەمان شێوە کەلەژێر هەژمونی ئەمریکادا بوون لە پاش ساڵی ١٩٥٧ وە، لەدوایدا لەڕێگەی تورکیاوە بەدوورنەبوون لەوەی لەموصل دا ڕوویدا، لەبەرئەوە شکستی جوڵانەوەکەی شەواف ، پێش ئەوەی شکستێکی ناوخۆی نەتەوەییەکانی عێراق بێت، بەشکستی هەژمونی ئەمریکا درایە قەڵەم..[1]

بەدەر لەوئامادەگییانەی باسکرا لەسەر ئەنجام دانی جوڵانەوەکە، هێشتا هەندێك خاڵ مابوو کەلەنێوان سەرکردەکانی جوڵانەوەکەدا جێگەی مشتو مڕ بوو، کەلەدوایدا بەسلبی بەسەر جوڵانەوەکەدا شکایەوە و ئامانجی خۆی لەدەست دا، کە من لێرەدا هەندێك لەو خاڵە ناکۆکانەی ساغ نەکرایەوە پێش جوڵانەوەکە بۆهۆکارە دەرەکییەکەی دەگەڕێنمەوە کەخۆی لە کۆماری عەرەبی یەکگرتوو ، ئەمریکادا دەبینییەوەو، لێرەدا ئاماژە دەکەمە هەندێکیان:

١-هەست دەکرێت لەجوڵانەوەکەدا زیاتر شەواف لەسەر ئاستی دەرەکی دەرکەوتوو تر بوووەك لە (سڕی) و (تەبەقچەلی) دیارە ئەمەش وایکردبوو کەشەواف بۆخۆی سود لەم پەیوەندییە وەربگرێت و نەدەچووە ژێرباری سەرنج و ڕای ئەوانی دیکەوە.

---

١-نجم، محمود، المقايضة بين برلين وبغداد الخلفية التأريخية لحرب لم تنته بعد، منشورات الغد، ص٢١٥.

٢-لەبەرەنجامی خاڵی پێشەوەش بوو کەجوڵانەوەکە ناوی شەوافی هەڵگرت و تەنانەت بەیاننامەکەش بەناوی شەوافەوە نوسرابوو.. کەدیارە ئەمەش مایەی ڕەزامەندی هەموو سەرکردەکانی جوڵانەوەکە نەبوو..

٣- کاتی ئەنجام دانی جوڵانەوەکە، زۆرێك لەویەکانەی بڕیار وابوو بەشداری جوڵانەوەکە بکەن لەڕێگەی ڕادیۆوە هەواڵی جوڵانەوەکەیان زانی هەربۆیەش نەیانتوانی بەشداری جوڵانەوەکە بکەن.[٢]

## چرکەساتی جوڵانەوەکە

پاش پەیوەندی کردنی شەواف بە(سڕی) و(تەبەقچەلی)یەوە، دەستی دایە چالاکی زۆرو بەرچاو لەگەڵ ئەوانەی هاوبیرو ڕای بوون لەکارەکەدا. شەواف (رفعت الحاج سری) لەوە ئاگادار کرابوویەوە کەجوڵانەوەکە لەسەرەتای مانگی مارسدا دەبێت،پێشی وابوو باشترین هەل بۆئەوەی کە پاڵپشتی جەماوەری دەست بکەوێت بەتایبەت لە ناوموصلدا،گرێدانی کۆنگرەی پشتیوانی ئاشتی بوو ، چونکە خەڵکی موصل لەبەستنی وەها کۆنگرەیەك تورەو نیگەران بوون، بەم جۆرەش شەواف لەسەرئاستی دەرەکی پشتیوانی مسۆگەر کردبوو، هەم لەسەرئاستی ناخۆییش لەموصلدا هەمان بیروڕای دەستەبەرکردبوو کەلەخزمەتی کارەکەدا بوو، چونکە گەرسوپا لەناوموصل ڕاپەڕێت، واتای ئەوەیە جوڵانەوەکە لەسەربنەمای خواستی جەماوەر بووەو، بەڵام کاتی جوڵانەوەکە لەلای سەرجەم ئەو سەرکردە سەربازییانەی بڕیاربووە بەشداری بکەن یەکلا نەکرابووەیەوە،

---

[٢] -دەکرێت ئەم پەلەکردنە بۆ ئەوە بووبێت کەهەڵبدرێت جوڵانەوەکە هاوکاتی یادی یەکەمین ساڵەی دروست بوونی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو بووبێت..

هەربۆیەش محمود دوڕە، کەیەکێك بوو لەئەفسەرە یەکێتی خوازەکان، بەرپرس دەکرێت بۆهاندان و هەماهەنگی سەرکردە سەربازییەکانی دەرەوەی موصل تا لەیەك کاتدا جوڵانەوەکە ئەنجام بدەن، بۆئەم مەبەستەش ڕۆژی ١٩٥٩/٣/٦ بەغداد ڕووەو کەرکوك بەجێ دەهێڵێت، بەمەبەستی گەیاندنی نامەیەکی (سرِی) بۆ (تەبەقچەلی) کەتێیدا داوای لێ دەکات بێدواکەوتن شۆڕش ڕابگەیەنێت، بەپێی پلانێك کەڕێکەوتبوون لەسەری، تێدا هاتبوو تاشەواف لەموصلەوە دەست پێبکات و (تەبەقچەلی)ش پەیمانی دابوو پاڵپشتی لێبکات، پاش ئەوە (دوڕە) هەمان ڕۆژ بەرەو موصل دەڕوات، بەڵام نەیتوانی بوو ئەو ڕۆژە شەواف ببینێت، لەڕۆژی دوایدا شەواف دەبینێ و ئاگاداری دەکاتەوە لەوەی (سرِی) و (تەبەقچەلی) لەسەری ڕێك کەوتوون، بەڵام شەواف پێی دەڵێت کەهەموو شتێکی ڕێك خستووەو ڕۆژی ١٩٥٩/٣/٨ جوڵانەوەکە دەست پێدەکات ودیارە سرِی و تەبەقچەلیش لەم پلانە ئاگادار نەبوون کەشەواف ئەنجامی دەدات.. [1] هەرلەو کاتەشدا (دوڕە) زۆر سەرسام دەبێت لەهەڵوێستی شەواف کەهیچ جۆرە هەماهەنگی و ڕێکەتنێك لەنێوانیاندا نیە، لەلایەك شەواف دەیویست شۆڕش بەناوی خۆیەوە ئەنجام بدات و لەلایەکی تریش هەندێکی تر دەیانەوێت بەناوی تەبەقچەلییەوە ئەنجام بدرێت، و شەواف جێگری بێت، بەڵام شەواف سوربوو لەسەر ئەوەی کە دەبێت خۆی سەرکردەی جوڵانەوەکە بێت و بەناوی خۆشیەوە بێت، بێڕەزامەندی تەبەقچەلی،( دەکرێت هۆکاری ئەم حاڵەتەی شەواف بۆشێوازی پەیوەندییەکانی بگەڕێتەوە لەگەڵ جەمال

---

[1] -دەکرێت شەوافیش هەوڵیدابێت بەدەردی قاسم ویستبێتی موفاجەئەیەك دروست بکات و هەم جوڵانەوەکە ناوی خۆی هەڵبگرێت وهەم کەسی یەکەمی پاش جوڵانەوەکەش بێت، ، تەنانەت بۆئەم مەبەستەش بەیاننامەی شۆڕشی بەناوی خۆیەوە نوسیبوو کەسەرکردەی شۆڕشە.

عەبدولناصردا و دڵنیای کردبێتەوە لە دابین کردنی هەموو پێداویستی یەك و ئەمەش هانی شەوافی دابێت ئەم هەلە بقۆزێتەوە و بەتەنها خۆی هەستێ بەکارەکە)هەر لەڕۆژی دواییدا واتە ١٩٥٩/٣/٨ دوڕە ئەوەشی بۆبەدەر دەکەوێت کەئەو ئێستگەی پەخشەی بڕیار بووە لەدیمەشقەوە ڕەوانەی موصل بکرێت بۆڕاگەیاندنی شۆڕش نەگەیشتووە..[٢]

کۆنگرەی ئاشتی بەسەلامەتی کۆتایی بەکارەکانی دێنێت، لەبەیانی ڕۆژی دوایدا ئەندامانی کۆنگرە موصلیان بەجێهێشت و جگە لەچەند ژمارەیەکی کەم نەبێت، کەبەهۆی قورسی دەست کەوتنی بلیتی شەمەندەفەرەوە نەیانتوانی موصل بەجێ بهێڵن، لەنیوەڕۆی هەمان ڕۆژدا خۆپیشاندان و دژە خۆپیشاندان دروست دەبێت، چایخانەیەکی شیوعییەکان سوتێنراو پەلاماری نوسینگەی چەپەکان درا، بەڵام شەواف هەربەخێرایی هێزەکانی بڵاوکردەوە بەناو موصلدا و بڕیاری قەدەغەکردنی هاتوو چۆی ڕاگەیاند، و دەستی گرت بەسەر بارەکەدا، لەسەعات (٧) ی سەرلەبەیانی ١٩٥٩/٣/٨ شەواف، لەبەیاننامەیەکداشۆڕشی ڕاگەیاند کەناوی سەرکردەی شۆڕشی هەڵگرتبوو،[٣] ئەم کارەش وای کرد تایەکە

---

[٢] -خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر – قم ١٩٩٧ ، ص١٤٩.

[٣] - بەیانەکە یەکەم جار لەموصلەوە پەخش کرا، بەڵام ئێستگەیپەخشەکە وەك پێویست نەبوو، هەربۆیەش ناوەڕۆکی بەیانەکەنێررا بۆدیمەشق ..لەم بارەیەشەوە (عبداللطیف البغدای) جێگری سەرۆکی کۆماری عەربی یەکگرتوو لەکتێبی (شهادتی للتأریخ) دا دەڵێت: لەڕۆژی ١٩٥٩/٣/٨ لەجمال عبدالناصرە وە زانیم کەشۆڕش لەنیوە شەوی شەممەوە ڕاگەیەنراوە و ئێستگەیەکی بزواو و هەندێك چەکی سوکیان بۆنێررابوو، کاتێکیش پرسیارم لێکرد سەبارەت بەکاتی شۆڕشەك ئایا هەموولا ڕێکەوتوون لەسەری؟ لەوەڵامدا ووتی کاتێکی دیاری کراو هەیە کەهێزەکانی موصل و بەغداد پێکەوە جوڵە بکەن، دەبێت کە هێزەکەی بەغدا جووڵابن.بەڵام بۆمان دەرکەوت کەئەو ئێستگەی ئێمە ناردوومانە پەخشەکەی زۆرلاوازەو تەنها لەنزیکەوە پەخشەکەی وەردەگیرێت، پاشان هەوڵی خێرای دانانی ئێستگەیەکی پەخش لەناوچەی (الغوطة) نزیك دیمەشق درا، جەمال عبدالناصر بەیانەکەی شەوافی نارد بۆ ئاژانسی هەواڵی (الشرق الاوسط) لەبەیروت و قاهرەو تاله ڕۆژنامەی ڕۆژانەدا بڵاوبکرێتەوە، هەروەها چەند بەشێکی بەیانەکە لەڕادیۆی قاهرە و دیمەشقەوە خوێنرایەوە کە عبدالناصر خۆی دیاری کردبوو،

**سەربازییەکانی دەرەوەی موصل نەیەن بەدەنگییەوە، چونکە ڕاگەیاندنەکەی کوت وپڕ بوو، جگە لەدوو فەوجی سەربازی نەبێت کەفەوجی هەولێر و عەقرە بوون ، کەس نەهات بۆیارمەتی دانی جولاندنەوەکە، لەبەرامبەریشدا ئەم هەڵوێستەی شەواف  وای کرد تاهەریەك لە (تەبەقچەلی و سڕی )ش هیچ جۆرە هەنگاوێکی عەمەلی لەهاوکاری کردنیدا هەڵنەگرن، بەهۆی توڕەییان لەشەواف و بڕیاریان دا خۆیان نەئالێنن پێوەی، کاتێکیش قاسم بەتەلەفۆن پەیوەندی بە بەتەبەقچەلیەوە دەکات کەئایا چ پەیوەندییەکی هەیە بەجولانەوەکەی شەوافەوە ، ئەویش لەوەلامدا دەڵێت هیچ پەیوەندییەکی پێوەی نیە، لەهەمان کاتیشدا لەناوبەغدا( سڕی) ش هیچ جۆرە جوڵەیەکی ئەنجام نەدابوو.[2]**

**هەرهێندەی شەواف جولانەوەکەی ڕاگەیاند، یەکێتی خوازو نەیارانی شیوعییەت پەلاماری شیوعی و لایەنگرەکانیان دابوو، هەروەها ئەو**

---

عەبدولناصر لەو کاتەدا لەبارێکی دەرونی  دژواردا بوو بەهۆی داڕوخاوی بارەکە لەموصل و پیَی وابوو ئەوەی لەموصل ڕوو دەدات جەنگی شەخصی نێوان خۆی و قاسمە ..( سەرچاوە: رجال و وقائع فی المیزان ، حوار اجراه مؤید طیب وسعید یحیی مع جرجیس فتح الله ،  الطبعة الاولی٢٠٠١ مطبعة التربیة ،ص ١٠٨)

[1] –زۆربەی لێکۆڵەرەوەکان  لەسەر ئەو بڕوایەن کەشەواف خۆی بەیانەکەی نوسیبێت، بەلام محمود دوڕە ئەوە تأکید دەکاتەوە کەئەو(دوڕە)  نوسیویەتیئەمەش پاش ئەوەی لەبەیاننامەکە ئاگادار دەبێت کەلەلایەن شەوافەوە نوسراوە، و ڕەخنەی لیَدەگرێت پیَی دەڵێت ئەمە بەیاننامە نیە بەڵکو ئەمەعەرزەو حاڵەو بۆسەرۆك بەرزکراوەتەوە داوای لیَدەکەیت تالەرێگەی گۆڕانی وەزارییەوە تەنازول لەهەندێك لەپۆستەکان بکات ..! پاش گفتو گۆ لەگەڵ شەوافدا ، داوادەکات لە محمود دوڕە تابەیانی یەکەمی شۆڕش بنوسێت، دوڕەش لەئێوارەی ٧ی مانگی ئازار واتە پێش ڕوودانی شۆڕش بەچەند سەعاتێك بەیانەکە دەنوسێت، و شەوافی لیَئاگادار دەکاتەوە، هەرلەبەیاننامەکەدا ئەو دەستەواژانەی باس لەپەیوەندی توندو تۆڵی نێوان جولانەوەکەو بزوتنەوەی نەتەوایەتیدەکرد وخۆی لەکۆماری عەرەبی یەکگرتوودا دەبینێتەوە سوك دەکات ... هەروەها دوڕە ڕەخنەشی لە شەواف  گرتبوو کە خۆی کردۆتە سەرکردەی شۆڕش و داوای لیَ کردبوو تا تەبەقچەلی سەرکردەی شۆڕش و شەواف جێگرو وتە بیژی بێت .، بەلام شەواف ڕەتی ئەم داوایەی کردبوویەوە و تبووی تەبەقچەلی دوودڵە لەڕاگەیاندنی شۆڕشدا.. (سەرچاوە: ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق، تألیف لیث عبدالحسن الزبیدی، ط٢، ١٩٨١، ص٣٦٧,٣٦٨)

[2] – خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر – قم ١٩٩٧ ، ص١٤٩,١٥٠.

ئەندامانـەی کـۆنگرەی ئاشـتیش کـەبلیتی گەڕانـەوەیان دەسـت نەکـەوتبوو کەوتنـە بـەردەم هەڕەشـەوە،لەوانـەش دوانیـان لێ کـوژرا، کـەبریتی بـوون لـە (قازنجی) و (شـاوی) زۆر دڕندانە کوژرابـوون، لەماوەیـەکی زۆر کورتـدا (٨-١٩٥٩/٣/٩) یـەکێتی خوازەکـان دەسـتیان گـرت بەسـەر موصـلدا.. لەگـەڵ ئەوەی کەشەواف توانیبوی موصل کۆنترۆل بکات، بەڵام هێزێکـی پشـتگیری نەبوو تا پارێزگاری لێ بکات، لەبەرامبەریشدا کاردانەوەی قاسم زۆر توندو بەدەسـت وبردبـوو بـۆ سـەرکوت کـردنی جوڵانەوەکـە، ئەمـەش لەڕێگـەی دبلۆماسـی و سەربازیشـەوە، لـە سـەرەتادا فـەرمانی دەرکـرد بەلـەکار راوەستانی سەرکردە سەربازییەکان لە نێویشـاندا تەبەقچەلی و شـەواف، لەڕۆژی یەکەمدا بەهۆی دابڕانی ئەو هێزانەی شەواف لەدەرەوەی موصل، قاسم توانی ئەو هێزانە دابڕێت لە فەرمانڕەوایی شەواف، لەڕۆژی دوایشدا پاش شەڕێکی سەخت لەنێوان شیوعی و یەکێتی خوازەکاندا، فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی کەلەبەغدادەوە هەڵدەستان، بارەگای سەرکردایەتی شەواف و بنکە سەرەکییەکانی بۆردومان کرد، پێدەچێت ئەم بۆردومانە بەتـەواوی بزوتنەوەکەی ئیفلیج کردبێت، و خودی شـەوافیش لەو بۆردومانـەدا برینـدار دەبێت و ڕەوانەی نەخۆشخانە دەکرێت..[3] و پاشان بەدەستی بـرین پێچێك دەکوژرێت لەنەخۆشـخانەدا بەناوی (طه المختـار)[4] بەبڵاوبوونـەوەی هـەواڵی کوژرانی شەواف[5] ، بزوتنەوەکەش بەچۆکدا هات و هەندێك لەسەرکردەکانی هەڵدین بۆدیمەشق[1]

---

[3] - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٥٠.

[4] - الزبیدی، لیث عبدالحسن، ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق، ط٢ ١٩٨١، بغداد ص٣٦٩.

[1] بەڵام سەعد سەعدی لە کتێبی(معجم الشرق الاوسط) ل. (٢٥٢) دا دەڵێت : شەواف کاتێك سەیر دەکات ژمارەیەکی زۆر چەکدار لە دەوری کۆبونەتەوە و دەیانەوێت بیکوژن و تا ئەو خەڵاتە (١٠) هەزار دیناریەیان

هەرلەبەرەبەیانی ١٩٥٩/٣/٩ دا بارزانی داوایەك ئاراستەی ئەندام ولایەنگرانی پارتی دیموکراتی کوردستان دەکات تابەرەو موصل بڕۆن( بەرگری لەخۆیان بکەن دژی ڕەگەز پەرستی نەتەوەیی عەرەبی )هەروەك لەبەیانەکەدا هاتبوو..[٢] کەبەڕای من ئەم هەڵوێستە بۆچەند خاڵێك دەگەڕێتەوە:

١-شێوازی پەیوەندی و مامەڵەی قاسم لەگەڵ کورد کەمامەڵەیەکی شیاوو گونجاو بووە وەکو بەخێر هێنانەوەی بارزانی و هاوڕێکانی لەسۆڤییەت و ڕێزگرتن و پێدانی مەکانەتی شیاو پێیان و یارمەتی دانی دارایشیان، کەدەتوانم بڵێم ئەو کاتە مانگی هەنگوینی پەیوەندی دەسەڵاتی کوردی حکومەتی مەرکەزی بووە..

٢-هەڵوێستی جەمال عەبدولناصر لەوکاتەدا سەبارەت بەکوردو گەڕانەوەی بارزانی و هاوڕێکانی لە سۆڤییەت، چونکە لەو کاتەدا پەیوەندی نێوان کۆماری عەرەبی یەکگرتوو سۆڤییەت، خراپ بووەو ناصر و خرۆشۆڤ لە ووتارو پەیامەکانیاندا کەسایەتی یەکتریان دەڕوشان، واڕێکەوتبوو کە لە١٦ی‌نیساندا پەنابەرەکوردەکانی یەکێتی سۆڤییەت لەگەڵ خێزانەکانیاندا دەگەڕانەوە کوردستان، لەوکاتەشدا وەك بەشێك لە هێرشی ڕاگەیاندنی

---

دەست بکەوێت کە قاسم وەك خەلات لەبەرامبەر (سەری) شەواف دا داینابوو، لەو کاتەدا شەواف دەمانچەکەی دەردێنێ و خۆی دەکوژێت..

[١] - محمود دورە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: جەمال عەبدولناصر سەرزەنشتی ئەوانەی کردبوو کەهەڵاتبوون بۆ سوریاو ووتبووی : ئەتان دەتوانیی بزوتنەوەکەتان بۆماوەی ٤٨ سەعات خۆی ڕابگرێت تایارمەتی ئێمەی پێدەگەیشت..! ( سەرچاوە: ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ في العراق، لیث عبدالحسن الزبیدی ص٣٧٠)

[٢] - بارزانی، مسعود، بارزانی و بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد ،١٩٥٨-١٩٦١ ، چاپی یەکەمی کوردی، دهۆك، ١٩٩٨، ل٨٣.

عەبدولناصر دژ بەمۆسکۆ رادێوی قاهیرە هێرشێکی توندی کردە سەر ئەو پەنابەرەکوردانەی دەگەڕانەوە عێراق، ووتارەکە بەم جۆرە دەڵێت: ئەم کوردە سۆڤییەتیانە(!!) هەشت سەت کەسەکەگەڕاونەتەوە عێراق، بەتەواوی چەك! و تەقەمەنی جەنگی و ڕاهێنراو لەسەر جەنگ، ئەوانەن ئێستا لەڕێگەدان تاپەیوەندی بکەن بەقاسم و هاوپەیمانە شیوعییەکانیانەوە، بۆبەرگرتن لەنەتەوایەتی عەرەبی و ڕاگەیاندنی جەنگ لە پێناو دەسەلاّت گرتن بەسەر عروبەی عێراق و دورخستنەوەی لەبرا عەرەبەکانی تری)[٣]

٣-هەڵوێست و دیدو تێڕوانینی نەتەوەپەرستەکانی ناوخۆش لەسەر کورد و دانانی لەبەرەی قاسم و دژایەتی کردنیان هەروەك چۆن دژایەتی قاسمیان دەکرد..

پاش شکستی جولاّنەوەکە لەبەرەنجامی دەست بەکاربوونی خێرای قاسم و ئەو هۆکارانەی تریش کەباسکران، ئەو کات نۆبەی تۆڵە سەندنەوە هاتە پێشەوە، دەستەی بەرگری میللی سەربەحزبی شیوعی کردەوەی تۆڵەی زۆر دڕندانەیان دژ بەخەڵکی موصل پیشان دا، لقی پارتی دیموکراتی کوردستان لە موصلیش هاوکاری کردن لەگەڵ چەکدارە کانی هۆزەکان رژانە نێو موصل کەوتبوویە دەستی شیوعییەکان و ژمارەیەك چەکداری کورد[٤]، بەدەر لەم حاڵەتەش زیندوو کردنەوەی هەندێك مەسەلەی وەك ناکۆکی چینایەتی و ڕقی کۆن و هەندێك پاڵنەری شەخصی تر وای کرد بارەکە بەئاقارێکی ترسناکدا بەرێت و چەندین کوشتاری لی بکەوێتەوە،

---

[٣]-فتح الله، جرجيس، رجال و وقائع في التأريخ في الميزان، حوار اجراه مؤيد طيب، وسعيد يحيى، مطبعة التربية، اربيل، ٢٠٠١ ص١٠٠.

[٤]- هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو

و کاری دزێو ئەنجام بدرێت.[1] لەپاڵ ئەمەشدا شیوعییەکان دادگای تایبەتیان دامەزراندو[2] حوکمی خێرایان دەردەکردو دەست بەجێ جێبەجێ دەکرا، وەك حوکمی سێدارە دان، پاشان بەدارتەلی کارەبادا هەڵدەواسران.. بەم جۆرەش ماوەی چوار ڕۆژ موصل لەبارو دۆخێکی سەخت و دژواردا دەژیا کەلە مێژوویدا هەل ومەرجی لەو چەشنەی بەخۆوە نەدیبوو، چەندین قەسابخانەی تیا دانرا، هەرلەم باریەشەوە ڕۆژنامەی (اتحاد الشعب) لەژمارە ١٩٥٩/٣/١٣ دا دەنوسێت: تەرمی تاوانباران و پیاوکوژان لەشارەکانی موصل و گوندەکانی دەوروبەری هەڵواسران و ڕاکێشران، لەم شەڕەدا تەرمیدەیان تاوانباری خوێن مژی مەدەنی و سەربازی ئاشکرابوون کەلەماڵەکانیاندا یاخود لە قەراغی ڕێگەکانی موصل و عەقرە و تەلەعفەرو زاخۆ و لەهەموشوێنێکدا کەوتبوون.[3] دیارە ئەمەش پێش ئەوەی قاسم هەوڵی گەڕانەوەی هێمنی و ئارامی بدات بۆشارەکە، هەرچەندە قاسم خۆی دواخست لەهاتنە ناوەوەی مەسەلەکەو وازهێنانیلێی بۆماوەی چەند ڕۆژێك تالەدەستی شیوعییەکاندا بێت، کەدەیتوانی ڕێگە لەوە بگرێت نەهێڵێت برینەکان هێندە قوڵ نەبنەوە، لەو کاتەشدا کەموصل بەو هەل و مەرجەدا

---

[1] –سەبارەت بەبەشداری هێزی کوردی لەموصل لەگەڵ شیوعییەکان، (عەقیدی خانەنشین عباس قادر علی) لەوەڵامی پرسیارێکمدا لەم بارەوە دەڵێت: بەدەر لەبوونی ژمارەیەکی زۆری کورد لەناوچەی موصل لەناوخۆو دەرەوەی ، دەگەڕێتەوە بۆ وەلائی کورد لەگەڵ حکومەتی عێراقی کەهەستابوو بەدەرکردنی لێبوردنی گشتی لەبارزانی و پیشوازی لێکردنیان و پاشان پێدانی ئازادی سیاسی و نەتەوەیی، بڕیاردان لەوەی کە زمانی کوردی زمانی ڕەسمی بێت..

[2] - خدوری، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص١٥٢,١٥١ .

[3] –مامۆستا بەهادین نوری لەیاداشتەکانیدا چاپی دووەم ١٩٩٥ لەلاپەڕە (٢٠٢) دەنوسێت: لەونامەیەدا کەبەخەتی جمال الحيدری نوسرابوو بەئیمزای مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی نێرابوو بۆ پارێزەر حمزە سلمانی ئەندامی لیژنە مەرکەزی حزب و چاودێری حزب شیوعی ئەو سەردەمەی موصل، تێیدا هەندێك تەوجیهاتی توندڕەوانەی لەخۆگرتبوو، کەتێدا فەرمان دەدات هەڵەکە بقۆزرێتەوە بۆپاکتاوکردنی سەرانی دوژمن..( دیارە مەبەستیان نەتەوەییەکان بووە)

تێدەپەڕی، عەبدلناصر چاودێری بارەکەی دەکرد، خۆپیشاندان دژ بەقاسم لەشـــەقامەکانی دیمەشـــقدا بـــەڕێوە دەچـــوو[٤] لەهـــەمان کاتدالەبەغـــدادیش خۆپیشـــاندان دژ بەعەبدولناصـــر لەهـــەمان کاتـــدا بـــەڕێوە دەچـــوو[٥].. پـــاش سەرکوت کردنی کودەتاکە ، قاسم ئەوانەی دەستگیر کرد کەپەیوەندییان بە جوڵانەوەکەوە هەبوو، لەبەردەم دادگاکەی مەهداویدا وەستێنران و حوکمیان بەسەردا درا[٦]

**هۆکارەکانی شکستی جوڵانەوەکەی شەواف**

١-نـــەبوونی پێکـــەوە گونجـــان لـــەنێوان ئـــەو ئەفســـەرانەی هەســـتا بـــوون بەجوڵانەوەکە، ئەمەش بەهۆی جیاوازی بیرو باوەڕو ئامانجەکانیانەوە.

٢-ڕاگەیاندنی کوت پڕی جوڵانەوەکەو، نەبوونی ئامادەگی پێش وەخت لەلایەن لایەنگرانی جوڵانەوەکە، لەدەرەوەی موصل، ئـەوان لەڕێگـەی رادیـۆوە ئاگاداری جوڵانەوەکە بوون.

٣-ئاگـادار نـەبوونی پـارت و هێـزە نەتەوەییـەکان لەبەغـداد و تەنانـەت لەموصلیش، کەدوای نیوەڕۆی ٨ی مانگ بەڕودانی جوڵانەوەکەیان زانی..

٤-خێرایی کاردانەوەی قاسم و هاوپەیمانەکانی ، کەبوو بەمایەی ئیفلیج کردنـــی جموجـــوڵی ئەفســـەرانی ئـــازادیخواز لەبەغـــداد و خانەنشـــین کردنـــی شـــەواف لـــەو بەرەنجامـــەوەو پێـــدانی موکافەئـــەی نەقـــدی بـــەبڕی (١٠,٠٠٠)

---

[٤] - الخرسان، صلاح، صفحات من تأريخ العراق السياسي الحديث (الحركات الماركسية) ١٩٢٠-١٩٩٠ ، ط.١ ٢٠٠١ ، مؤسسة العارف للمطبوعات، بيروت ،لبنان ص٩١.

[٥] - خدوری، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير - قم ١٩٩٧ ، ص ١٥٢,١٥١.

[٦] -فتح الله، جرجيس، رجال و وقائع في التأريخ في الميزان، حوار اجراه مؤيد طيب، وسعيد يحيى، مطبعة التربية، اربيل، ٢٠٠١ ص١٠٨.

دەهەزار دیناری عێراقی بۆ ئەو کەسەی شەواف بەزیندووی یان مردووی تەسلیم دەکات.

کوژرانی سەرکردەی جولانەوەکە و هەلاتنی یارمەتی دەرەکەی (الرئیس الرکن محمودعزیز) بۆ سوریاو بەم جۆرەش لاواز بوونی جولانەوەکەو خۆبەدەستەوە دانی زۆربەی ئەو هێزانەی کەبەشدارییان تیاکردبوو.[1]

بەم جۆرەش جولانەوەکەی شەواف پێش تەواوبوونی سالێك بەسەر شۆڕشی ١٤ی تەموزدا ڕویدا، لەم جولانەوەیەدا کەزیاتر لە(٢٠٠) مەدەنی و سەربازی تیاکوژرا لەنەتەوەپەرست و شیوعییەکان، خالێکی وەرچەرخانی سلبی بوو لەڕەوتی شۆڕشی ١٤ی تەموزدا، هۆکارەکان سادەو بەرەنجامەکانیش قورس و کارەساتبار، هەر پاش ئەوەش گەورە زلهێزان نەوەستان لەپلان نانەوە بۆ ڕووخانی دەسەلاتی قاسم تائەوە بوو لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣دا ئەو ئامانجەشیان هاتەدی و قاسم لەناوبرا..

پاش شکستی هەولەکەی شەواف بەریتانیا پەیوەندی لەگەلَ مۆسکۆ پتەو کرد، بەلام زۆر درێژەی نەکێشا، تاهەلی سەردانێك هاتە پێشەوە بۆسەرۆك وەزیرانی بەریتانیا(ماکمیلان) بۆ ئەمریکا، ئەمەش پاش ماوەیەکی کەم لە شکستی جولانەوەکەی شەوافدا، کەلەکۆتایی مانگی ئازاری ١٩٥٩دا بوو، لەکامپ دێڤید هەردوو سەرۆك ماکمیلان و ئایزەنهاوەر کۆبوونەوەو، باس لەگۆڕانکارییەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و شکستی جولانەوەکەی شەواف کرا، ئایزەنهاوەر بەم جۆرە ووتبووی:

---

[1] -بۆ ئاگادار بوون لە ووردەکاری ئەوانەی حوکم دران خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ باسی دادگاکەی مەهداوی.

- ئەوەی لەناوچەکە ڕوودەدات گەورەترین گرنگی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە، ئەو بڕیارەی ناصر وەری گرت بۆدژایەتی کردنی شیوعییەکان لەجیهانی عەرەبیدا، لەتەواوی ڕاشکاوی و ئاشکرایدا بوو.

- لەوەلامیشدا ماکمیلان دەلێت: لەڕاستیدا ناصر لەپێناو چەسپاندنی پێشەوایەتی‌یەکەیدا دەجەنگا، هەتاشکستی هێنا لەڕوخانی قاسمدا، سەرەڕای ئەو چالاکی‌یە ڕووخێنەرانەی پێی هەستاوە دەبێت ئەو پرسیارە بکەین، کەئایا ناصر گەیشتۆتە کۆتایی هێزی سیاسی خۆی؟ لەهەرحالێکدا بێت، دەرکەوت هێزی لەناوخۆی عێراقدا سنوردارە، هەولەکانی بۆ ڕوخانی قاسم لەڕێگەی هێرش کردنە سەرشیوعییە عەرەبەکانەوە، بوو بەمایەی ئەوەی کەزیاتر پال بەقاسمەوە بنێت تا پشتگیری شیوعییەکان بکات.

- لەوەلامدا ئایزەنهاوەر دەلێت: لەهەلمەتەکەی ناصر دژی شیوعییە عەرەبەکان بەهاو جەوهەری خۆی هەیە، و دەبێت هان بدرێت، ئەم هەلمەتە دەبێتە مایەی لاوازبوونی هەژمونی سۆڤییەتی لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا..

- لەوەلامدا ماکمیلانیش دەلێت: گومانم هەیە لەوەی هەلمەتەکانی ناصر ببێتە مایەی ڕوخانی قاسم.[2]

بەکورتی دەتوانین بلێین روداوەکانی موصل لەسەرەتاوە هەتا دوایی سەرهەلدانی قۆناغێکی خوێناوی بوو لە عێراقدا، کە هیچ لایەك ناتوانێت خۆی لە رەخنەو بەر پرس بوونی لابدات، نەتەوەیی ، شیوعییەکان، کورد،

---

[2] -نجم، محمود ، المقايضة بين برلين وبغداد الخلفية التأريخية لحرب لم تنته بعد ، منشورات الغد ، ص٢١٦,٢١٧. کەلە (سنوات الغليان ،ج١ ص٤٣٨ و لاپەڕەکانی دوای ئەوەدا وەری گرتووە) لەنوسینی محمد حسنين هيكل.

دەسەڵاتی قاسم، هەموویان هەڵەیان کرد سەبارت بە خۆیان و گەل و وڵاتەکەیانەوە، هەڵەیان کرد سەبارەت عێراقەوە.[1]

روداوەکانی موصل لە ئاکامدا سەرەرای پێنج رۆژ قەسابخانە و کوشتاری بێ مانا (٨-١٢/٣/١٩٥٩) حەفتاو پێنج تۆمەتباریش بەبەشداری کردن لە جوڵانەوەکەی شەوافی دایە دادگایبالآی سەربازی، کە (٣٠) کەسیان فەرمانی لە سێدارەدان لە دژیان دەرچوو..

ئەو روداوە لافاوێك لە خوێنی لە نێوان هەردوو هێزە سەرەکییەکەی عێراقدا دروست کرد، نەتەوەییەکان( بەعس) و چەپەکان(شیوعی)، لە هەمان کاتدا عێراقێکی بریندای لە دوای خۆی بە جێ هێشتوە کە دابەش بوو بوو بەسەر چەند هێزێکدا، سەرەرای ئەمەش کەشێکی لە باری هێنایە کایەوە تا هێزە ئیمپریالی‌یەکان کە (هەردوو هێزەکە دژایەتی‌یان دەکرد) سود لە بارەکە وەر بگرن و مەترسی‌یان نەمێنێ لە دروست بوونی عێراقێکی سەربەخۆو یەکگرتوو..[2]

---

[1] - بارزانی، مسعود، بارزانی و بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد ،١٩٥٨-١٩٦١ ، چاپی یەکەمی کوردی، دهۆك، ١٩٩٨، ل٨٥.

[2] رشيد، د. عبدالوهاب حميد، العراق المعاصر، دار المدى للثقافة والنشر، سنة٢٠٠٢، ص١٤٦.

# قاسم و دەسەڵاتی تاکڕەوی!

یەکێك لەو خاڵە دەرکەوتوانەی سەردەمی دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم خۆی لەتاك ڕەوی قاسمدا دەبینێتەوە لەبەڕێوەبردنی دەسەڵاتی عێراقدا، ئەم دیاردەیەش زۆربەی کتێبە مێژووییەکانی تایبەت بەژیانی قاسم جەختی لەسەردەکەنەوە، ئەم بارەش هۆکاربووە بۆ زۆرێك لەو هەل ومەرجە سلبی یانەی بەسەرعێراقدا هاتوون لە قۆناغی فەرمانڕەوایی قاسمدا..

پێشەوا سەربازی و مەدەنی یەکان چاوەڕوانی بەرپابوونی دەسەڵاتێکی جێگیرو دامەزراویان دەکرد، تاجێگەی حکومەتە سەربازییەکەی قاسم بگرێتەوە، ئەمەش هەرپاش ڕێککەوتنی پارتەکان لەسەر یەك پرۆگرام کەسوپا جێبەجێی بکات، بەڵام وادەردەکەوێت کەپارتەکان نەگەیشتبنە یەك پرۆگرامی یەکگرتوو تا لەسەری کۆببنەوە و لەبەرامبەریشدا پاڵی بەقاسمەوە نا تائەم بارە قۆرغ بکات و بنەمای دەسەڵاتەکەی بچەسپێت.[٣]

پاش سەرکەوتنی شۆڕش هەریەك لە عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارف و عەبدوللەتیف دەراجی لەو کۆبوونەوەیەی کەپێش دوو ڕۆژ لەئەنجامانی شۆڕش بەستبوویان، فۆرمۆلەی دەستەڵاتیان بەتەواوی داڕشتبوو بێ ئاگاداری لیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخواز، ئەم سێ کەسە بوونە لیژنەیەك بۆ کاروباری سەرۆکایەتی وڵات ودیاری کردن ودانانی

[٣] خدوری، د. مجيد (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة امير – قم ١٩٩٧ ، ص١٣٧.

وەزیرەکــــان لەحکومـــەتی داهـــاتوودا، ئەمـــەش بۆئـــەوەی دەســـەڵاتی راستەقینەیان پێ بدرێت.. وەزارەتەکان سێ ئەفسەری سەربازی پلە باڵای تیابوو، عەبدولکەریم قاسم سەرۆك وەزیران و وەزیری بەرگری و لەتەنیشت ئەم دوو پۆستەشدا فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکان بوو! عەبدولسەلام عارفیش جیگری سەرۆك وەزیران و وەزیری ناوخۆ، ناجی تالبیش وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی ، پارتی نیشتمانی دیموکراتی بەدوو وەزیر بەشدار بوون، هەریەکە لەپارتی سەربەخۆیی و پارتی بەعس بەوەزیرێك بەشداری حکومـەتیان کـرد، شـەش پۆسـتی وزاری تـر درا بـە کەسـانی بێلایـەن و سـەربەخۆ، کەبەشێوەیەك لەشێوەکان سێ کەسیان نزیکایـەتی‌یان لەگەڵ قاسم و عارفدا هەبوو، سێکەسەکەی تریشیان لەکۆبونەوەی لیژنـەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخوازدا دەست نیشان کرابوون، بەڵام حزبی شیوعی لەبەر ئیســتفزاز نــەبوونی ڕۆژئــاوا و دەرنەکــەوتنی حکومەتەکــەی قاســم وەك حکومەتێکی شیوعی، پۆستی وەزارییان پێ نەدرا، چونکە لەوکاتەدا هەل و مەرجە نێو دەوڵەتی‌یەکە زۆر ناجێگیرودانەمەزراو بوو سەبارەت بەعێراق و حکومەتی تازەی، ئەمەش بۆ خۆدورگرتن بوو لە هەرکاردانەوەیەکی سلبی کەلەسەر ئاستی دەرەوە سەبارەت بەعێراق بگیرێتە بەر، وەگەرنا لەپشتی پەردەوە شیوعییەکان هەژمونی بەرفراوانیان هەبوو بەسەر دام ودەزگاکانی دەوڵەتدا..

لـەم پێکهاتـەدا گەرسـەرنج بـدەین دەبیـنین ڕۆڵـی پارتـەکان تاڕادەیـەك لاخرابوو، ئەوەی ڕۆڵی سەرەکی تیا دەگێڕا قاسم و عارف بوون، بەڵام ئایا ئەمە جێگەی ڕەزامەندی پارتەکان بوو؟

لەم بارەیەوە هەندێك بیرو راهەبوون كەلێرەدا هەوڵ دەدەم ئاماژەی پێبدەم، هەندێك پێیان وایە پارتەكان بەم بارە ڕازی بوون لەسەرەتادا، بۆنمونە پارتی نیشمانی دیموكراتی كەزۆر بانگەشەی دیموكراتی كردووە، دەیخواست باری سیاسی وڵات بەم جۆرە بێت، تادەسەڵاتی سەربازی بتوانێت بۆماوەی چەند ساڵێك بارەكە بچەسپێنن، ئەو كات پارتە سیاسییەكان بچنە پێشەوە لەدەسەڵات، بەدەر لەم حاڵەتەش بۆچونێكی تر هەیە لەسەر ئەوەی كەمەسەلەكە ئەمرێكی واقیع بووە و پارتەكان ناچاربوون مامەڵەی لەگەڵدا بكەن، ئەو مامەڵەیان بەئەولەوییەت زانیوە وەك لەنەیاری و ئاژاوە نانەوە، بۆچونێكی تر بارەكە بەقۆناغێكی سیاسی تایبەت وەسف دەكەن تائەوەی هەل و مەرجەكە دەگۆڕێت و یەكلا دەبێتەوە..[1]

بەسەرجەم ئەو تێڕوانینانەی كەهەبوون لەنێوان لایەنگرو بێلایەن و دژی بارەكەدا، بەڵام بارەكە لەسەر ئاوازی دەسەڵاتی سەربازی بەڕێوە چووە، لەقۆناغی یەكەمدا، دەستەڵاتی سەربازی توانی هاوەڵەكانیان لە ئەفسەرانی ئازادیخواز لە دەسەڵات و پۆستە گرنگەكان دوور بخەنەوە بەشێوەیەك لەشێوەكان، لەقۆناغی دووەمدا پێدانی ڕۆڵی بەشداری پێكردنی رەمزی بەپارتەكان كەهیچ جۆرە دەسەڵاتێكی سەرەكی ئەو تۆیان نەبوو، لەقۆناغی سێیەمیشدا و لەبەرەنجامی ململانێی نێوان قاسم و عارف، عارفیش لەدەسەڵات دوور خرایەوە، و بەم جۆرەش ڕێگە لەبەردەم قاسمدا تەخت بوو، تاوەك تاك دەسەڵاتێك پاوانی حوكم بكات، لەسەرئاستی پارتە سیاسی یەكانیش، لەو كاتەدا ململانێ لەسەر عارف و قاسم هەبوو، لەنێوان پارتی بەعس و شیوعییەكاندا، كاتێكیش عارف خرایە زیندانەوە و

---

[1] كەناڵی ئاسمانی ئەبوزەبی بەرنامەی (بين الزمنين) ئامادەو پێشكەش كردنی (احمد مهنا). ساڵی ٢٠٠٢.

بەعسییەکان پاشکشەیان کرد لەگۆڕەپانەکەدا، ڕێگا بۆ شیوعییەکان ڕەها بوو لەسەر ئاستی ناوخۆیی کاری خۆیان بکەن قاسمیش لە کابینە وزارییەکانیدا وەزیرەکانی وەك کارمەند وەسف دەکرد و پێی دەوتن ئێوە تەنها کارمەندێکن و کارتان تەنها جێ بەجێکردنی تەعلیماتەکانە[1]، تەنانەت هەندێك جار قاسم خۆی دادەبەزییە خوارەوەی ئاستی وەزارەت و تەعلیماتی پێدەدان! ..

لەسەرئاستی کابینە وزارییەکەی قاسمیش وەزیرەکان دەستیان لەکار دەکێشایەوە بێئەوەی بتوانن ڕەخنە لە قاسم بگرن، و چییان بوێت پێی بڵێن..[2] ئەمە لەکاتێکدا قاسم کەلەسەرەتای دەسەڵاتیدابوو، بێپرس و ڕاوێژ هیچ کارێکی ئەوتۆی ئەنجام نەدەدا، و بەردەوام دەگەڕایەوە لای وەزیرەکان و سیاسییەکان..!

خاڵێکی گرنگتر هەیە کەپێویستە ئاماژەی پێبدەین، ئەویش پیاهەڵدانی قاسم ودروشم کێشان بوو بۆی، پاش سێمانگ لەسەرکەوتنی شۆڕش، ناوی (تاکە پێشەوا) نرا بەسەر قاسمدا، لەوکاتەدا کەتەنانەت هێندەمتمانەی بەخۆی نەبوو تا وەك دەستەڵاتێك حوکم بکات، شیوعییەکان ئەم نازناوەیان بۆدانا و ئامانجی دژایەتی کردنی نەتەوەپەرستەکانیان پێی هەبوو کە ئەوان عەبدولناصریان بە تاکە پێشەوا دەدایە قەڵەم، بەتێپەڕبوونی ڕۆژو مانگیش هۆکارەکانی پڕوپاگەندە و ڕاگەیاندن زیاتر دەکەوتە کار لەوەسفی قاسمدا، تائەوەی (٥٥) نازناوی بۆدانرا، لە (عیملاقی تەموزەوە هەتا سەرکردەی دونیایەکی نوێ).. بەم جۆرەش لەنێوکۆمەڵگەی

---

[1] گێڕانەوەی فۆاد عارف وەزیر لەکابینەی وزاری عەبدولکەریم قاسمدا بۆ کەناڵی ئاسمانی ئەبوزەبی، بەرنامەی (بین الزمنین) ئامادەو پێشکەش کردنی (احمد مهنا) ساڵی ٢٠٠٢.

[2] خدوری، د. مجید (العراق الجمهوري) الطبعة الایرانیة، مطبعة امیر – قم ١٩٩٧ ، ص١٣٩.

عێراقیدا مەسەلەیەکی تر سەری هەڵدا ئەویش شەخص پەرستی بوو، کەهەندێك ئەم دیاردەیە بۆ شیوعیەکان دەگەڕێننەوە[٣] وەك چۆن شیوعییەکان لەبەرامبەر ستالین لە سۆڤییەت و ماو لە چین و نوئێل صون لە کۆریا بەکاریان دەهێنا، کەبێگومان لەم دەرەنجامەشەوە دروست کردنی دیکتاتۆری لێدەکەوێتەوە، تەنانەت ئەم کارە بووەتە سیمای گەلی عێراقی و پێی دەناسرێتەوە، چونکە هەرگەلی عێراقی بوو نوری سەعیدیان دروست کردو هەرئەوانیش بون قاسمیان بەو شێوە لێکردو پاشان دکتاتۆرەکانی دوای ئەویش.. هەربۆیەش دەبینین دیکتاتۆرێك دەڕوات و یەکێکی تر دێتە جێگەی، قاسمیش لەبەر ئەوەی سایکۆلۆجییەتێکی نەرجسی هەبوو ئەم بارەی قۆرغ کرد بۆ زیاتر چەسپاندنی دەسەڵاتەکەی و پیادەکردنی حوکمی تاك ڕەوی لەعێراقدا..

---

[٣] کەناڵی ئاسمانی ئەبوزەبی بەرنامەی (بین الزمنین) ئامادەو پێشکەش کردنی (احمد مهنا). ساڵی ٢٠٠٢.

عەقید ماجد محمدامین

داواکاری گشتی دادگای باڵای سەربازی

عەبدولکەریم قاسم

محی الدین عەبدولحەمید

(وەسفی تاهیر)　　( رفعت حاج سری )

ئەم نامەیە (محسین حسین الحبیب) لە کاتی دەست بەسەرا گرتنی کۆشکی ڕحاب دا دەستی کەوتووە
ڕۆژی ١٩٥٨/٧/١٥ کە مەلیک فەیسەڵ ناردویەتی بۆ خاڵی (عەبدولئیلاه) لەلەندەن

متى ستعودون الى بغداد؟ ارجو ان يكون موعد رجوعكم
في حوالي يوم ٦ تموز المتفق عليه رغم تأجيل سفرنا الى لندن لانه
من الاهمية هنا اعتقد وبرايكم ايضا [illegible] الاسبوع، ان نبقى بضعة
ايام هنا سوية بحيث يتيسر لنا الوقت الكافي للمذاكرة في كل الامور
التافهة في هذا الوقت واني اذكركم انها غير قليلة! اني اثناء غيابكم
افتقدت لاول مرة التداخل في كل الامور [illegible] وان ارجعها
شخصيا حسب معلوماتي وخبرتي القاصرة [illegible] من مرة ثبتت ان تكونوا
معي هنا لاستشيركم [illegible] القول ان الانسان يشعر بحب الذين
الذين يتحملون [illegible] بالنسبة لي [illegible] الغياب الطويل [illegible] على
الفراغ الهائل الذي تكونه من جراء غياب المحبين. ولكنني اكرر
ان عودتكم الى هنا متعلقة تماما برغبتكم وراحتكم وصحتكم
قبل كل شيء.

الجميع هنا بخير ويقبلون ايديكم [illegible] وختاما
ارجو من الله تعالى ان يديم صحتكم ويطيل عمركم والسلام

ابنكم

فيصل

بەرواری نامەکە

١٩٥٨/٧/٢

نوری سەعید

عەبدولسەلام عارف

موحەمەد مەهدی کوببە

رەشید عالی گەیلانی

فازڵ عەباس مەهداوی

سەرۆکی دادگای باڵای سەربازی سەردەمی

حوکمیعەبدولکەریم قاسم

ئەحمەد موختار بابان

دواین سەرۆك وەزیرانی سەردەمی

پاشایەتی ( بەرەگەز کورد

سەعید قەزاز

دواین وەزیری ناوخۆی سەردەمی

پاشایەتی ( بەرەگەز کورد )

## سەرچاوەکان

١-خدوري، د. مجيد، (العراق الجمهوري) الطبعة الايرانية، مطبعة (امير) ، قم سنة ١٩٩٧.

٢- الزبيدي، ليث عبدالحسن، (ثورة ١٤تموز١٩٥٨ في العراق)، الطبعة الثانية، بغداد، سنة ١٩٨١.

٣- العلوي، حسن، (عبدالكريم قاسم رؤية بعد العشرين)، منشورات (دار الزوراء) ، لندن.

٤- فرحان، اللواء الركن عبدالكريم (ثورة ١٤تموز في العراق)، الجزء الاول، مؤسسة الكتاب العربى للدراسات والترجمة والنشر، باريس، سنة ١٩٨٦.

٥-غالب،العقيد الركن صبيح على، (قصة ثورة ١٤تموز والضباط الاحرار)، دار الجاحظ للطباعة والنشرو بغداد١٩٦٨.

٦- عارف، فؤاد (مذكرات) الجزء الاول، الطبعة الاولى، سنة ١٩٩٩، مطبعة خبات، تقديم وتعليق د. كمال مظهر احمد.

٧-مولود، د.محمد عمر(الفدرالية وامكانية تطبيقها في العراق) رسالة دكتورا، طبعة الاولى، مطبعة وزارة التربية، اربيل ، سنة ٢٠٠٠ .

٨- المحامي ، جاسم المخاص ، (مذكرات ناظم الطبقچلى)

٩-تاريخ الوزارات العراقية فى العهد الجمهورى، الجزء الاول، ١٩٥٨/٧/١٤-٧شباط ١٩٥٩، تأليف مجموعة من الاساتذة،سنة٢٠٠٠.

١٠-حسين، العميد المتقاعد خليل ابراهيم (ثورة الشواف فى الموصل)، الطبعة الاولى، سنة ١٩٨٧.

١١- نجم، محمود(المقايضة بين برلين وبغداد، الخلفية التأريخية لحرب لم تنته بعد) منشورات الغد.

١٢-الخرسان، صلاح (صفحات من التأريخ العراق السياسي الحديث، الحركات الماركسية)١٩٢٠-١٩٩٠ ، الطبعة الاولى، مؤسسة العارف للمطبوعات، بيروت، لبنان ، سنة ٢٠٠١.

١٣- فتح الله، جرجيس (رجال ووقائع فى التأريخ والميزان) حوار اجراه( مؤيد طيب وسعيد يحيى) مطبعة التربية، اربيل ، سنة ٢٠٠١.

١٤- الحسو، د.نزار توفيق سلطان (الصراع على السلطة فى العراق الملكى) دراسة تحليلية في الادارة والسياسة، الطبعة الاولى، بغداد،سنة ١٩٨٤.

١٥- الجعفرى، محمد حمدى ، محكمة المهداوى اغرب المحاكمات السياسية فى تأريخ العراق الحديث، الطبعة الاولى، سنة ١٩٩٠ .

١٦-رشيد، د.عبدالوهاب حميد، العراق المعاصر، دار المدى للثقافة والنشر، سنة٢٠٠٢.

١٧-التطور السياسى في العراق المعاصر، تأليف مجموعة من الكتاب، جامعة بغداد.

١٨- بارزانى، مسعود ( بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد) ١٩٥٨ – ١٩٦١، چاپی یەکەم بەکوردی ، ساڵی ١٩٩٨.دهوك.

١٩- مذكرات بهاءالدين نورى

٢٠- الشبكة المعلوماتية الدولية ( الانترنيت)، كمصدر لنبذ التأريخية للعراق.

٢١- اطـراف مـن تـأريخ العـراق المعاصـر، محاضـرة للباحـث والمفكـر الاسلامى (محمد احمد الراشد)

٢٢-قناة (ابوظبى) برنامج (بين الزمنين) حول شخصية عبدالكريم قاسم، نهاية سنة ٢٠٠٠، وبداية سنة٢٠٠١.

٢٣- قناة (الجزيرة) الفضائية، وقناة (LBC ) الفضائية البنانية.

٢٤- جريدة (الاتحاد) لسان الحال للاتحاد الوطنى الكردستانى.

٢٤-حسين ، العميد المتقاعدخليل ابراهيم( الصراع بين عبدالكريم قاسم والشيوعيين وحلفاؤهم وناظم الطبقجلي والقوميين) بغداد ، الجزء الثالث، سنة ١٩٨٨.

٢٥- العلوى، حسن ( التأثيرات التركية فى المشروع القومى العربي فى العراق) الطبعة الاولى، مطبعة (امير) ايران، سنة ١٩٩٢.

## زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی ٢٠٠٥ی

## بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپو بڵاوکردنەوە لە وەزارەتی ڕۆشنبیری

| ز | ناوی کتێب | ناوی نووسەر / وەرگێر | بابەت | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| ٣٠١ | بەئاشتی کردنی پەروەردە | عەبدولعەزیز عومەر | پەروەردەیی | چاپکردن |
| ٣٠٢ | پیاسەیەك بەکووچەکانی قەدەردا | ئاوێزان نوری | شیعر | چاپکردن |
| ٣٠٣ | گۆڤاری تێکست ژمارە (٥) | چاپ‌وبڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٣٠٤ | دەنگی بلورینی دەق | عەبدولخالق یەعقوبی | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٣٠٥ | ڕۆناك | جگەرخوێن | شیعر | چاپکردن |
| ٣٠٦ | بۆ زمان | د.عیزەدین مستەفا | زمانەوانی | چاپکردن |
| ٣٠٧ | دوورگەی بێداری | تەها ئەحمەد ڕەسوڵ | شانۆگەریی | چاپکردن |
| ٣٠٨ | داستانی خەبات‌و ماڵئاوایی | شێخ حسێنە سوورە | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٣٠٩ | ماچی گوڵشەن‌و کانیاوەکانی کوردی | ئەحمەد هیرانی | ئەدەبی | چاپکردن |